ماندامو عینی (موئەدەب پوور)

# ئەو دیو کۆڵانەکانی بێدەنگی

وەرگێڕانی:

کارزان خدر–سەنگەسەری

چاپی یەکەم
2015

## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: ئەودیو کۆڵانەکانی بێدەنگی

نووسەر: ماندامۆعینی(موئەدەب پوور)

وەرگێڕانی لە فارسییەوە: کارزان خدر

تایپ و ڕێکخستنی ناوەوە: وەرگێڕ

بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

ساڵی چاپ: 2015

تیراژ: (1000) دانە

نرخ:

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی : (    )ی**

**ساڵی 2015ی پێدراوە**

سوپاس و پێزانین بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە لەگەڵم ماندوو بوون و بە تەنها وشەیەکیش یارمەتییان داوم.
تایبەت ((ئارام))ی برام، کە زۆر ماندوو بوو لەگەڵم و زیاتر دنەی دام.

وەرگێڕ 2015-6-6

به ناوی خوای بەتەنیٚ

سەعاتێك دەبیٚ گەڕاومەتەوە ماڵیٚ, بەڵام هێشتا نە نانی نیوەڕۆ ئامادەیە و نە بۆخۆشم. قاپ و قاچاغی شەوێدی بە پیسی لە مەغسەلەدا ماونەتەوە! تەنافی جلەکانیشم لە سەللەدا لە نزیك غەسالە داناوە! ماڵیش پەرت و بڵاوە.

بۆخۆشم لەسەر قەنەفێك دانیشتووم, لە نزیك مێزێك کەوتومەتەوە! چاوم لەسەر ئەو تەسجیلۆکەیە کە لەسەر مێزەکەم داناوە! لە تەنیشتیشی چەند شریتێك هەنە! سەعاتێکە دانیشتووم و دەمەویٚ پێیکەم , بەڵام ناکریٚ!

واتا: لەوانەیە بتوانم نیو سەعاتی دیکە پێی بکەم؟! یا بۆوێنە ئەمشەو؟ یان سبەی! بەڵام چ جیاوازییەکی هەیە؟ چ ئێستا, چ نیو سەعاتی دیکە, چ شەو, چ بەیانی !

یەکەم شریتم لەناو تەسجیلەکە هاویشت و دووگمەکەم داگرت.

**شریتی یەکەم**

**شەممە سەعات 9ی بەیانی , ڕێکەوتی ... گرتووخانەی ژنان ... دۆسییەی ژمارە ... ناو ئەفسانە ...))**

ـ دانیشە کچی جوان. من پارێزەری تۆم. ئەگەر قسەم لەگەڵ نەکەی, ناتوانم کارێکت بۆ بکەم.

(بێدەنگی )

ـ ئێستا چارەگێك دەبێ لێرەم! کاتی من نرخی هەیە ! کاری دیکەم هەن!

(بێدەنگی )

ـ گیانەکەم! وا دەزانی ئەو بێدەنگییە بەکەڵکت دێ ؟!

ـ باشە! ئەوە نیو سەعاتە من چاوەڕێم بەڵام ...! زۆر باشە دیارە پێویستت بە یارمەتیی نییە.

(بێدەنگی )

ـ کەواتا من بڕۆم؟ قسە ناکەی؟

– چۆن دەتەوێ یارمەتیم بدەی!

ـ هەر ئەو قسە کردنەت بۆخۆی جۆرێکە لە یارمەتی دانی خۆت!

– هەر ئەوەندە؟! ئێ وەڵڵا ماندوو نەبی!

ـ من تەنها پارێزەرم !

– تەمەنت چەندە؟

ـ ئەوە منم کە دەبێ پرسیار لە تۆ بکەم نەك تۆ!

– بۆ لێکۆڵەری؟!

ـ نا!

– ناکرێ ئێستا من پرسیار لە تۆ بکەم؟

ـ تۆ دەتەویَ پرسیار لە من بکەی؟

– بەڵێ!

ـ من خۆ پێویستم بە یارمەتیی نییە! ئەوە تۆی کە پێویستت پێیەتی!

– بە چڕا دیارە کە من پێویستیم پێیەتی؟

ـ دەی ئێستا دەتەویَ چ پرسیارێکم لێبکەی؟

– لێم پرسی! تەمەنت چەندە؟

ـ سی و پێنج ساڵ . تەواو؟

– نەخێر! بە پرسیارێك خۆ ناتوانم بتناسم!

ـ مەگەر وا بڕیارە تۆ من بناسی؟!

– بۆ نابیَ من پارێزەرەکەی خۆم بناسم؟

ـ با, بەڵام ئێستا کات بۆ ئەو پرسیارانە نییە!

– کاتت بۆ چییە؟

ـ بۆئەوەی کەمێك لە ژیانت تێبگەم , بەهاکانی ژیانت بزانم و بە سوودی تۆ بەکاریانبێنم!

– کە چ ڕووبدات؟

(بێدەنگی )

ـ نازانم!

– خۆت گێل دەکەی؟!

ـ هیچ مەسەلە خۆ گێل کردن نییە!

– تۆ ناتوانی یارمەتیی من بدەی بەڵام من دەتوانم یارمەتیی تۆ بدەم!

ـ چۆن؟!

- من لەو سەرییەوە هاتوومەوە ! سەرگوزەشتەی من و ئەزموونەکانم دەتوانن هەزار دەرس بن بۆ تۆ !

(بێدەنگی )

ـ زۆر باشە ! پرسیارەکانت بکە !

- هاوسەرگیریت کردووە ؟

ـ بەڵێ.

- منداڵت هەیە ؟

ـ یەك دانە .

- کچە یان کوڕ؟

ـ کچ.

- ناوی چییە ؟

ـ وا بزانە مێهناز.

- دەترسێی ناوەکەیم پێ بڵێی؟ !

(بێدەنگی )

ـ لەوانەیە !

- هاوسەرەکەت خۆشدەوێ؟

ـ بەڵێ .

- بەڕاستتە ؟

ـ بەڵێ !

- تەمەنی چەندە ؟

ـ نزیکەی چل ساڵ.

- چەندەت خۆشدەوێ؟

ـ زۆر! ئەرێ تەواو نەبووی؟

– نا.

ـ ئاخر ئاوا نابێ !

– بۆ نابێ؟

– مەگەر کات کاتی من نییە ؟

ـ با بۆ نا!

– مەگەر ژیان ژیانی من نییە ؟!

ـ با بەڵام!

– بەڵام و مەڵامی ناوێ! ئێستا دەمەوێ ئاوا ژیانی خۆم بەسەر بەرم! ئەگەر لەگەڵم هاوڕا نی, هەستە بڕۆ! ئەو گاڵتەجاڕییانەش لابە!

ـ کام گاڵتەجاڕی؟

– ئەو تەسجیلە دەنگییە و ئەو شتانە! لە فیلمی ئەوروپیەوە فێریان بوویی؟

ـ ئەگەریش لەوێوە فێر بووبم شتێکی باشە! سوود وەرگرتن لە تەکنەلۆژیا بۆ یارمەتیدانی خەڵك!

– هەر ئەو تەکنەلۆژیایەیە مرۆڤ بەرەو لەناوچوون دەبات!

ـ ئەگەر دەتەوێ من لێرە بمێنمەوە و وڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە, دەبێ ئەو تەسجیلە لێرە بێ! تاقەتی باسی ئایدۆلۆژیشم نییە!

(پێکەنین )

– باشە توڕە مەبە! پارێزەر خۆ نابێ ئەوەندە دڵ ناسك بێ !

(دەنگی وتنی گۆرانی )

– ئەوەندە دڵ ناسك مەبە – ئەوەندە دڵ ناسك مەبە!

(پێکەنین )

– ئێ خاتوونی پارێزەر! گوتت: زۆرت خۆشدەوێ!

- بەڵێ.

– وەڵڵا درۆ دەکەی!

- یانی چی؟

– فایدەی چی؟! تۆ لە سەرەتاوە دەستت بە درۆ کرد!

- هیچ درۆیەکم لەگەڵ نەکردووی !

– سوێند بە گیانی کچەکەت بخۆ!

- سوێند بە گیانی کچەکەم !

– سوێند بە ویژدانیشت بخۆ!

- ئەی هاوار! کاکە سوێند بە ویژدانیشم!

– باشە بڵێ بزانم, تا ئێستا چەند جار گەنجی جوان و ڕێکوپێکت لە شەقامدا دیتووە و دڵت نەیویستووە کە ئەو لە جێی هاوسەرەکەت بێ؟

- من تا ئێستا ....

– بەسە بەسە ! کوا ویژدان لەو زەمانەدا؟!

(بێدەنگی )

- زۆر باشە ! تا ئێستا یەك دوو جار ڕووی داوە !

– ئافەرین! مرۆڤ دەبێ زۆر وریا بێ کاتێك خواستە نهێنییەکانی دڵی دێنێتە سەر زمان!

- ئاخر پەروەردەی ئێمە ...

– سەقەت بووە !

- تۆپەروەردەیەکی باش کراوی کە ئێستا لێرەی؟

– نا ! ئەگەر باش با کە لێرە نەدەبووم!

ـ باشە با ئێستا دەست بە کارەکەمان بکەین؟

– دەستمان پێ کردووە!

ـ جارێ ئەوە تۆ لێپرسینەوە لەگەڵ من دەکەی!

– جیاوازیی چییە؟

ـ جیاوازیی ئەوەیە کە دوای ماوەیەکی دیکە ناتوانم لە دادگا بەو شتانە بەرگریت لێ بکەم!

– گرنگ نییە!

ـ زۆر بێ هەستی! دەڵێی دۆسییەکەت لەبیر کردووە؟!

– نەخێر! هەمووم لەبیرە!

ـ ئاخر چەند ڕۆژێکی دیکە ...

– چەند ڕۆژێکی دیکە هێشتا نەهاتووە! ئێستا بڵێ بزانم خانمی پارێزەر, پێش ئەوەی هاوسەرگیریی بکەی چەند کوڕت خۆشویستووە؟

ـ ئیدی خەریکە بێتامی دەکەی ها! هەموو شتێك سنوورێکی هەیە!

– هەستە بڕۆ بابا!

ـ تۆزێك بەڕێزەوە قسە بکە!

– کاتێك تۆ لەسەر بەڵێن و پەیمانی خۆت نامێنی من چۆن بەڕێزەوە بدوێم؟

ـ ئاخر ئەوانە چ سوودێك بە تۆ دەگەیەنن؟! ئەوجار, ئەوانە شتی تایبەتی و شەخسیی منن! بۆچی دەبێ بە تۆیان بڵێم؟!

– ئەی کەواتا تۆ چۆن دەتەوێ بەهای تایبەتیی من بزانی؟!

ـ بۆ یارمەتیی خۆت!

– هیچ یارمەتییەکت بۆ من لە دەست نایە!

ـ جاریٚ دیار نییە کە لە دەستم نایە ! ئینجا, ئەگەر من ژیانی تایبەتیی خۆمیشت پێ بلێم, حاڵی تۆ لەوە باشتر دەبێ؟

– نا ! بەڵام هیچ نەبێ پێیەوە سەرقاڵ دەبم !

ـ یان بەڕاستی بێ هەستی یان شێتی !

– مرۆڤ دەتوانێ هەردووکیان بێ ! شێتێکی بێ هەست !

ـ خۆزگە دەچووی دەرست دەخوێند و دەبوویە شتێك ! بیرێکی باشت هەیە !

– لە کوێوە دەزانی نەمخوێندووە ؟

ـ لە دۆسییەکەترا !

– مەگەر هەر شتێك لە دۆسییەدا بێ ڕاستە ؟ !

ـ نازانم !

– تۆ چ پارێزەرێکی کە هیچ شتێك نازانی ! ئێستا دەڵێی چەند خۆشەویستی کوڕت هەبووە یان نا ؟ !

ـ یەك دوو دانە !

– هەر ئەوەندە ؟ !

ـ ئەی چی !

– هەموویانت خۆشدەویستن؟

(بێدەنگی )

ـ لەوانەیە لەو کاتەدا بەڵێ !

– بۆچی هاوسەرگیریت لەگەڵ نەکردوون؟

(بێدەنگی )

ـ دەرفەت نەبووە ! واتا زۆر گەنج بووم !

– واتا ئەوان نەهاتوونە پێش؟ چونكە ئەگەر خۆشتويستبن, هاوسەرگيريشت لەگەڵ دەكردن!

ـ ئەگەر كاتيان نەبووبا چى؟

– چاوەڕێت دەكرد؟!

ـ لەوانەيە!

– تاميان كردى؟!

ـ من ئيتر جواب نادەمەوە!

– ئۆوو خانمى پارێزەر تورە بوو! هو! هو!

ـ ئاخر ئەو پرسيارانە چين دەيانكەى!

– مەبەستم هەيە!

ـ چ مەبەستێكت هەيە؟!

– تۆ سەرەتا وڵام بدەوە!

ـ باشە هەرچييەك بىَ ؟

– يانى ڕێت پێدان سوودت لىَ وەرگرن!؟ يانى بوويە هۆى وەرگرتنى حەز و ئارەزوويان! دوايش وازيان لىَ هێناى و ڕۆيشتن! تۆش وازت لێهێنان!؟

ـ نەمهێشت تا ئەو ڕادەيەش خراپ بىَ!

– بە دڵنياييەوە كاتت بۆيان نەبووە! يان لەوانەيە كاتەكە گونجاو نەبووبىَ! واتا كەلوپەلەكانيان بۆ دابين نەكراون! يان بۆ تۆ يان بۆ ئەوان! دەنا دەچوويە پێشتر!

(بێدەنگى )

– لەو كاتەوەى ڕۆيشتوون, هيچ كات لە بيرى تۆڵە سەندنەوە دا نەبوويى؟

(بێدەنگى )

– ئێستا تۆ بێدەنگی و قسە ناکەی؟

ـ نازانم!

– دەزانی بەڵام ناتەوێ بیڵێی!

(بێدەنگی )

– زۆر خراپ تێکەوتووی خاتوونی پارێزەر! ئەگەر جواب بدەیەوە ئەوە کاری منت تەواو کردووە! ئەگەریش جواب نەدەیەوە, شکستت خواردووە! ئەویش لە بەرانبەر کێ؟ تاوانبارێکی بیست و سێ ساڵە! زۆر عەیبە, ها؟!

ـ لەوانەیە بیرم لە تۆڵە کردبێتەوە, بەڵام نەمکردۆتە کرداری!

– هاوسەرەکەت چی؟

ـ هاوسەرەکەم چی؟!

– بە دڵنیاییەوە ئەویش یەکێك بووە لەو کوڕانەی کە دوای سود وەرگرتن لە دە کچ وازی هێناوە و ڕۆیشتووە!

(بێدەنگی )

– تا ئێستا باسی ڕابردووی بۆ نەکردووی؟ لەو کارانەی کە کردوونی یان ئەو کچانەی کە خۆشیویستوون؟ دەبێ باسی کردبێ!

ـ هەندێ جار! بە ناونیشانی یادگاری و دەورانی گەنجی و گاڵتەکردنەوە!

– تۆ چیت کردووە؟

ـ هیچ! هی کاتێکە کە هاوسەرگیریی لەگەڵ نەکردبووم!

– ئەتۆ چی؟ تۆش دەتوانی لەو یادگاری و سەردەمی گەنجیی و گاڵتە جاڕیانەی بۆ باس بکەی؟

(بێدەنگی )

– دەتەوێ جارێك تاقی بکەیەوە کە بزانی دواتر چی ڕوو دەدات؟

(بێدەنگی )

– بەڵێنت پێ دەدەم کە لە تاقیکردنەوەکەی دەرناچێ!

(بێدەنگی )

– لە کوێوە دەزانی کە هاوسەرەکەت ناکەوێتەوە بیری کاتی تەنیایی و گەنجی؟ با بزانم؟! جار جار پرس و ڕایەك لە ئیدارەکەی دا دەکەی کە بزانی هیچی وای نییە؟!

ـ ئیتر کاتم تەواو بوو! دەبێ بڕۆم!

(پێکەنین )

– ئەو شریتە ڕەش نەکەیەوە ها! لەوانەیە دوایی بتەوێ گوێی لێ بگری!

(( دەنگی خڕکردنەوەی کاغەز و قفلکردنی جانتایەك ))

جارێ خوا حافیز!

– خوات لەگەڵ پارێزەر گیان! ئەو گاڵتەجاڕیانە بەڕاستی وەرنەگری هاا! تەنها گاڵتە بوون و تەواو! گاڵتەی شێتێکی بێ هەستی وەك من! هاوسەرەکەشت پاك و خاوێنە! ئەسڵەن پیاوان کاتێك ژن دێنن, ئیتر چاویان ناچێتە سەر کچانی دە پانزەساڵە!

(پێکەنین )

ـ دووشەممە دێمەوە!

– باشە وەرەوە!

(( دەنگی داگرتنی دووگمەی تەسجیلەکە))

***

شریتی یەکەمم دەرهێنا. کەم بوو, بەڵام شایەنی گوێ لێگرتن بوو! بەبێ سێ و دوو کەوتمەوە بیری ئەو ڕۆژە, ئەو ڕۆژە کە لە گرتووخانە هاتمە دەر. نەمزانی

چۆن خۆم گەیاندە دادگا. لە ڕێگە نەمدەتوانی ئەو قسانەی کە ئەفسانە پێی گوتومە لە بیری خۆمیان بەرمەوە و لە مێشکم بیانبەمە دەرێ! لەخۆم تووڕە بووم! ئاخر من چ پارێزەرێك بووم کە بریگرتە[1]کەم یاریم پێ بکات! بۆچی ڕێی ئەوەم پێ دابوو؟ ئەسڵەن بۆچی ئەو دۆسیەیەم قبوڵ کرد!؟ کاری من شتێکی دیکە بوو! بۆ سێ شەریکە کارم دەکرد! ئەو دۆسیەیەیان لە ڕێگەی دادگاوە وێدابووم! ئەویش بە هۆی هاوڕێیەکمەوە بوو! دەیگوت بۆت باشە. دەرفەتت بۆ باشتر دەکات و ئەو شتانە!

ئەفسانە قسە و قسەلۆکێکی سەیری لە زانکۆ دروست کردبوو. هەتا ڕۆژنامە و گۆڤارەکانیش بە مەبەست لەسەریان دەنووسی! خودی ئەفسانەش توانای گرتنی پارێزەری نەبوو! لە ڕاستیشدا من تازە ببوومە پارێزەری ئەو. ئێستاش وەکو سەگ پەشیمانم. ڕێی گەڕانەوەشم نەبوو! لە ئەنجومەنیشدا بۆم باش نەبوو کە دۆسییەکە بگەڕێنمەوە تازە. بەهەرحاڵ ئەوانە لە لایەك , ئێستا دەیویست گومانیش بخاتە دڵمەوە! ئەویش کچێکی بیست و سێ ساڵە! بەڕاستیی شەرمەزارییە! یان ئەسڵەن لەو جۆرە دۆسییانەدا وایە.

لەلایەك وێنەی بێهروزی هاوسەرم, هاتە بەر چاوم! چەند ساڵ بوو کە هاوسەرگیریمان کردبوو؟ دە ساڵ! یانی توانیبووم بیناسم؟!

گەیشتمە دادگا. ئیشی ئیداریی سێ شەریکە لەبەر دەستی من بوو, من پارێزەریان بووم.

ئیشێکی بە دەردەسەریی بوو, بەڵام بەرهەمێکی باشی هەبوو! نە لایەنی سۆزداری بۆم هەبوو و نە شك و گومانی دەخستە دڵمەوە و نە تووشی غەم و پەژارەشی دەکردم.

---

[1] بریگرتە: ئەو کەسەی کە پارێزەر دەگرێ بۆ پارێزگاریی کردن لە خۆی, پێی دەڵێن بریگرتە.

تا سەعات یەکی دوانیوەڕۆ لەوێ مامەوە و دواتر گەڕامەوە ماڵێ.

دووبارە کەوتمەوە بیری قسەکانی ئەفسانە! هەندێك شتیشی ڕاست بوو! بەڕاستی بێهروز خەریك بوو چی دەکرد؟! لە دوو شوێن ئیشی دەکرد. یەکێکیان کە ئیدارەکەی بوو و دوای عەسریش دەچوو بۆ شەریکەیەك. مووچەکەی خراپ نەبوو! ژیانێکی باشمان هەبوو. هەرچەند کرێنشین بووین, بەڵام ژیانێکی باشمان هەبوو. دوو باڵەخانەی لەنزیك یەك لە شوێنێکی باش و گونجاو. سەیارەیەکی نە زۆر گرانبەها و نە زۆریش کۆن, لەگەڵ کچێکی جوان و نازەنین!

بۆخۆشم چەند ساڵێك بوو کە دەستم بە کارکردن کردبوو. واتا: پارێزەرێکی تازە, بەڵام شارەزا. ئیشەکەمم خۆشدەویست. هاوسەرەکەم و کچەکەشم خۆشدەویستن. بەڵام ئایا بێهروزیش بە هەمان شێوە بوو؟!

پێکەنینم بە خۆم دەهات! چۆن کچێکی بیست و سێ ساڵە توانیبووی شکست بخاتە دڵم؟! بەدڵنیاییەوە ئێستا پێم پێ دەکەنێ. یان بۆ هاوسجنەکانی باس دەکات, کە چۆن بەرانبەرم دەوەستایەوە و قسەی دەکردن و بەڕای خۆی منی بەزاندووە!

لە ماڵەوە بۆخۆم سەرقاڵ بووم. شەوی ڕابردوو شتێکم بۆ نیوەڕۆ ئامادە کردبوو. لە سەلاجە دەرم هێنا و لەسەر غازم دانا تا گەرم بێتەوە.

سووگێلی کچەکەم, سەعات دوو دەگەیشتەوە ماڵێ. بە پاس دەهاتەوە ماڵ. پۆلی دووەمی سەرەتایی بوو.

بێهروز شەو دەگەڕایەوە, بۆیە بۆ نیوەڕۆ هیچم ئامادە نەدەکرد, بەڵام بۆ ئێوارە با! تا ئەوەندەی دەمتوانی خواردنی باش و چێشتی خۆش و سفرەی ڕازاوە و تێر و تەسەل. بە تایبەتیش ئەو خواردنانەی کە بێهروز تایبەت حەزی لێیان بوو.

هەر کە دەشگەڕایەوە دەستی پێ دەکرد. سەلامی گەرموگوڕ و پێشوازییەکی گەرم.

جانتاکەیم لێ وەردەگرت و پێڵاوەکانیم دەخستنە شوێنی پێڵاوان و جلەکانی هەر لە پێش دەرگای گەرماو دایدەنان, ئەوانەی کە پێویستیان بە شردن هەبا, دامدەنان بۆ شردن و ئەوانەشی کە خاوێن بان, دەمخستنە ناو شوێنی جلەکانی و هەڵم دەواسین و دەچووم بۆ چێشتخانە, تا ئەو حەمامێکی دەکرد, نانی ئێوارەش ئامادە دەبوو. دروست لە کاتی خۆیدا کە نە هاواری لێ بەرزبێتەوە نە دەرەنگ بێ.

دوای نان خواردنیش کە بە خێرایی مێزەکەم کۆدەکردەوە و قاپەکانم خڕدەکردنەوە و شردنی کەچك و قاپیشم دوا دەخست بۆ ئەو کاتەی کە بێهروز نووستووە یان دەچێ سەیری تەلەڤزوێن دەکات.

بە خێرایی چایەکی گەرمی ئامادەکراوم بۆ دەبردە حەوشە و لە تەنیشتی دادەنیشتم. بۆ ئەوەی کە ئەو ڕووداوانەی چەند ڕۆژی لەمەوبەر پێشهاتوون بۆم باس بکا و وەك چۆن قسەی بۆ دەکردم, میوەشم بۆ دادەنا.

دواتریش یارمەتیی سوگێلم دەدا دەرسەکانی تەواو بکات, تا ئەو کاتەی بابی دەگەڕایەوە, کتێب و دەفتەرەکانی پەرشوبڵاو لە ناوەڕاستیماڵدا نەبن.

ئەوە تەواوی ژیانی من بوو.هاوسەرەکەم, کچەکەم و ماڵەکەم.

ئەو ڕۆژە دە دەقیچە چارەگێك دوای گەیشتنی من, سوگێلیش گەیشتەوە ماڵ و تا جلەکانی گۆڕی, نانی نیوەڕۆم بۆ ئامادە کرد. بۆخۆم نیوەڕۆیان زیاتر خواردنی خێرا(فاست فوود)[1]م دەخوارد.

ئەویش نانی خوارد و چوو سەیری تەلەڤیزیۆن بکات. منیش قاپ و کەچکەکانم شردن و ڕۆیشتم ڕاکشام, سەعاتێك نووستم.دواتر لە خەو هەستام و چووم بۆ

[1] فاست فوود: خواردنی خێرا.

حەسار و سوگێلم ناردە سەر دەرسەکانی و خۆشم دەستم کرد بە ئامادەکردنی نانی ئێوارە و خاوێنکردنەوەی ماڵ, لە چاوەڕوانیی گەڕانەوەی مێردەکەمدا بۆ شەو!

**((شریتی دووەمم خستە ناو تەسجیلە دەنگیەکە))**

**شریتی دووەم**

**دووشەممە سەعات 9:20بەیانی , ڕێکەوتی... گرتووخانەی ژنان..., دۆسییەی ژمارە... ناو ئەفسانە...))**

ـ دووبارە سڵاو بکەم خاتوونی پارێزەر؟ یان هەر ئەو سەلامەی سەرەتا له فایلەکەدا نووسراوە بەسە؟!

- نا هەر ئەو بەسە. ئێستا یارمەتیی هەیە ئەمڕۆ دەست پێ بکەین؟!

ـ تۆ چیرۆکی مانگی نوورانیت بیستووە؟

- ئەمڕۆ ئیتر نایەڵم و ڕێگەت پێ نادەم وەك جاری ڕابردوو بیکەیە فشەبازاڕی ئەفسانە خانم!

ـ فشەبازاڕی؟!

((پێکەنین))

ـ هەبوو نەبوو جگە لە خوا هیچ کەس نەبوو!

- ئەفسانە تکا دەکەم, ئەوەندەت نەماوە بۆ دادگا! من ...

ـ گوێ بگرە خانمی پارێزەر! لە سەردەمێکی کۆندا, لە یەکێك لە شارە کۆنەکاندا, ژن و مێردێك پێکەوە ژیانیان بەسەر دەبرد, زۆر یەکتریان خۆشدەویست. خوا کچێکی زۆر زۆر جوان و نازەنینی پێ دابوون! بەڕاستی ئەوان زۆر زۆر باش بوون, تا ئەوە بوو ژنەکە ڕۆژێك نەخۆشکەوت. هەرچی دکتۆر و شارەزا هەبوون, سوودیان نەبوو.

تا ئەوەبوو ڕۆژێك هاوسەرەکەی بانگ کرد و بە هەمان شێوە کە لەسەر قەرەوێڵە کەوتبوو, پێی گوت: هاوسەرە ئازیزەکەم, من وا لە سەرە مەرگدام.

هاوسەرەکەشی پێی گوت: وای ئازیزەکەم توخوا ئەو قسانە مەکە! تۆ بەم نزیکانە چاك دەبییەوە.

ژنەکە گوتی: نا پیاوەکە من ئیتر باش نابم, هەر بۆ ئەوەشە دەمەوێ وەسیەتت بۆ بکەم.

هاوسەری بێشەرمیشی دەستی کرد بە گریان و گوتی: من دوای تۆ ئیتر ناژیم کە تۆ بتەوێ وەسیەتم بۆ بکەی و بیهێنمە دی.

ژنەکە پێی گوت: بۆچی ترسنۆك؟ دەزانم تۆ بێگومان دەژیت, دوای من ئاگاداری ئەو کچە بە.

– ئەفسانە! ئاخر منیان ناردووەتە ئێرە کە قسەت لەگەڵ بکەم و شتێکت لێ وەدەست بێنم, ببێتە خاڵێکی گرنگ بۆ تۆ و بتوانم بەرگریی پێ لێ بکەم . ئەو قسە قۆڕانە چین دەیانکەی؟ تۆ دەڵێی ئاگاداری حاڵی خۆت نیت.

ـ مێردەکەی گوتی: یاڕەبی کوێر بم و دوای تۆ کەس نەبینم. ژنەکە گوتی: ئەتۆ پشیلەی حەوت ڕوحی نامری, بەڵام ئەگەر ئازاری کچەکەم بدەی, ڕوحم دەگەڕێتەوە و هەر شتێکی بیەوێ دەیکات.

– بەسە ئیدی ئەفسانە شەرم بکە!

ـ هەر چۆنێك بێ ژنەکە مرد و هاوسەرەکەشی شەش مانگ تێنەپەڕی بوو, ژنێکی دیکەی هێنایەوە. ئەویش چ ژنێك!

– ئەفسانە من ئێستا هەڵدەستم و دەڕۆم هاا!

ـ بۆچی؟ مەگەر ناتەوێ بەهای تایبەتیی ژیانم بزانی؟

– شتە گرنگەکانی ژیانی تۆچ پەیوەندییەکی بە چیرۆکی مانگی نوورانییەوە هەیە؟

ـ پەیوەندیی پێوە هەیە! ئەگەر ئارام بگری, تێدەگەی. خۆزگە دەیانهێشت جگەرە بکێشم!

- باشتر کە ناهێڵن! ئێستا بڵێ بزانم مانگی نوورانی چ پەیوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟

ـ کاتێك بچووك بووم، دایکم هەموو کات ئەو چیرۆکەی بۆ دەگێڕامەوە. ئاخیرەکەشی ناوچاوانی ماچ دەکردم. هەروەها پێشی دەگوتم تۆ وەکو مانگی نوورانی جوان و قەشەنگی. فەقیرە بێخەبەر لەوەی خەریکە نیوەی بیرەوەرییەکانی خۆی بۆ من و بۆخۆی دەگێڕێتەوە! نیوەی چیرۆك، نیوەی بیرەوەریی من و دایکم! واتا: کاتێك پانزە شانزە ساڵە بووم، دایکم سەرەتانی گرت و چەند مانگێك دواتر مرد.ماینەوە من و بابم. دوای ڕێورەسمی بە خاکسپاردن و فاتیحا خوێندن، بابم بەڵێنی دابوو، تا کاتێك من گەورە دەبم هەم ببێتە باب و هەم ببێتە دایك بۆم.

چونکە زیاتر ساڵێك تێنەپەڕیبوو کە من گەورە بووم. یەعنی ئەو گوتی کە من گەورە بووم.

بهێڵە بە جوانیی بۆت باس بکەم: کاتێك دایکم مرد و ڕێورەسمەکە تەواو بوو. من و بابم ژیانی تازەمان دەستپێکرد.

یەعنی هەمان ئەو ژیانە. نەبوونی دایکم، سەرەتا خراپ نەبوو و تەنها غەم و خەفەتی مردنی دایکم ناڕەحەتی دەکردین. دەنا زۆرینەی شتەکان باش بوون. بابم خزمەتکارێکی گرتبوو، کە هەفتەی جارێك دەهات و چەند جۆر خواردنی بۆ دروست دەکردین و دەیخستنە ناو فرێزەر و دەڕۆیشتەوە. سێ چوار ڕۆژ بەو خواردنانە بەسەرمان دەبرد و باقی ڕۆژەکانی دیکە بە کڕینی خواردنی بازاڕ خۆمان تێر دەکرد.

سەعات سێی دوانیوەڕۆ دەگەیشتمەوە ماڵ و بابیشم سەعات پێنج. دوای مردنی دایکم, پەیوەندییمان پێکەوە زۆر باش بوو و بە هۆی ئەوەی منیش تەنها مابوومەوە, قەدری بابم زۆر دەگرت و پەیوەندییمان خۆش بوو.

ئەگەر غەمی مردنی دایکم نەدەبوو, لەوانەیە زۆر زۆر زیاتر لە پێشوو, ئاسودەتر ژیانمان بەسەر بردبا و خێزانێکی بەختەوەرتر و ئارامترمان هەبا.

خەڵك دەهاتن و دەچوون و هەموویان بە بابمیان دەگوت: پیاو نابێ بێ ژن بێ و کچیش بێ دایك.

مەگەر دەکرێ پیاو بێ ژن بمێنێتەوە؟! چما دەکرێ ماڵ بێ خانمی ماڵ بێ؟! مەگەر دەکرێ کچ لە فێرگە بگەڕێتەوە و تەنها بێ؟!

خودانەخواستە لەوانەیە تووشی هەزار بەڵا بێت و فکری خراپ بکاتەوە و شەیتانییان بکات.

خولاسە ئەوەندە فزولییان کردن و ئەوەندە لە بن گوێیان خوێند, تا ئەوەبوو بۆخۆی هەستی جوڵا کە بەڕاستی دەبێ ژن بێنێتەوە و ماڵ ژنی دەوێ.

ئەوەش خەڵکی بێ ئیش و خزم و دۆست و دراوسێ, کە هەڵدەستان بە دیتنەوەی ئافرەت بۆ بابم.هەر یەکەو بە جۆرێك بوو بە هۆکار بۆ ئەو بابەتە.

ڕۆژێکیان پورم ئێمەی بانگهێشت کرد بۆ نانخواردن, تا بیسەلمێنێ کە کارێکی بۆ برا ترشاوەکەی کردووە و براکەشی لەو ڕێگەیەوە خۆشی بوێ و لە کن ئەو خۆشەویست بێ.

لە بەرانبەریشدا مامم شەوێکی دیکە ئێمەی دەعوەت دەکرد, تا لەو ڕێگەیەوە بتوانێ شتێك بۆ بابم بکات و بە کورتی هەر شەوە و لە ماڵێ خزمێکمان بووین بە میوانداری کە هەر میواندارییەو کچێکیشیان دەهێنا, تا بزانن بابم بە دڵیەتی یان نا؟ بەڕاستی جێت خاڵی خانمی پارێزەر! چ وەزعێکی پێکەنیناوی و خۆش بوو.

هەرچۆنێك بێ لە یەكێك لەو میوانانیانەدا بوو, كە یانسیبەكەمان بۆ دەرچوو, ئەویش چ یانسیبێك!؟ كچێك, یەعنی ژنێكی بیست و حەوت بیست و هەشت ساڵە بە تەواوی پێداویستییەكانەوە.

ئەوانەی كە پێشتر دیتبوومانن لە لایەك و ئەوەیان لە لایەكی دی.

بۆ نموونە ئەوانی دیكە هەر یەكەو گرفتێكیان هەبوو, هەبوو لە ڕووخساری دا(ناشیرن) بوو, هەبوو لەگەڵ دایك و بابی لەماڵدا مابۆوە, یەكێكی تر مووی سەری بەو شێوەیە بوو, یان هەبوو پرچی دوو ڕەنگ بوو, هەبوو بە دوو منداڵەوە مێردەكەی بەجێی هێشتبوو, یەكێكی تر كە لەوانی دیكە باشتر دەهاتە بەر چاو, مەرجی هەبوو, منداڵی دەویست. خولاسە هەر یەكەو گرفتێكی هەبوو, بەڵام ئەویان نا.

ئەویان نزیكەی پانزە شازدە ساڵێك لە بابم بچووكتر بوو! جوان بوو, ڕێكپۆش, كەسێكی زیندوو بوو و شتێكی گرنگی هەبوو, كە منداڵی نەدەبوون. لە هەموویان گرینگتر, ئەوەبوو كە لە كارەكەی شارەزا بوو.

دەیزانی دەبێ چ بكات! ئەوانی دیكە, هەر كە بابمیان دەدیت, بە شەرمەوە دەچوون لە سوچێكەوە دادەنیشتن و لە فرسەتێك دەگەڕان كە شتەكەیان سەر نەگرێ. بەڵام ئەوەیان هەر سەرەتا ئیشی خۆی كرد!

سەرەتا شریتێكی هەڵكرد و بەشێوەیەك دەستی بە سەما كرد كە تا ئێستا سەمای وام نەدیوە. لە سەد لەو سەماكەرە بەناوبانگانە باشتر بوو.

دواتر لە تەنیشت بابم دانیشت و نازانم بەو نیو سەعاتە چی لە بن گوێی بابم خوێند, كە بابم نەك تەنها بە دڵێك, بە سەد دڵ ئاشقی بوو.

كاتێك خەیاڵی لەو ئاسوودە بوو, هاتە كن من. قسەی بۆ دەكردم, منیش حەزم دەكرد گوێبیستیان بم!

لە ژیان, لە داهاتوو, لە خەیاڵ, لە حەز و ئارەزوو, خولاسە لە هەموو شتێك.

دواتریش زۆر سادە و ساکار دوو سێ جار هاتە ماڵمان! یانی لە ڕاستیدا خۆی هەڵدا ماڵمان.

شەوی یەکەم لە بیرمە کە سەعات نۆ بوو, کە لە جەڕەسیان دا. من جوابی ئایفۆنەکەم دایەوە, کاتێك زانیم ئەوە, سەرم سوڕ ما, بەڵام هەر چۆنێك بێ دەرگاکەم کردەوە. هاتە ژوور.

فیلمێکی دەرهێنا کە سەد ئەکتەریش ناتوانن ئاوا فیلم سازکەن.

نازانم چۆن سەلیقەی منی زانیبوو! تیشێرتێکی زۆر جوان و کەمێك ڕووتی بۆ کڕیبووم و عەترێکی بۆن خۆش و گرانبەهاشی بۆ بابم کڕیبوو.

کاتێکیش گەیشتە بەر دەرگا گوتی کە نایەوێ لە کاتمان بگرێ, لەبەر ئەوەی چووبووە بازار, ئێمەی وەبیر هاتبۆوە و ویستویەتی کە ئێمە خۆشحاڵ بکات! قۆپچەی چارشێوەکەی کردبۆوە و چوار پەنجە لەسەرەوەی ئەژنۆکانی لە ژێرەوە دامێنێی لەبەر کردبوو. عەترێکی بە خۆی کردبوو, کە من کچی پانزە شازدە ساڵە نازانم چ حاڵ و وەزعێکم هەبوو, چ بگات بە بابم؟! ئەو کاتە هەر لەبەر دەرگا وەستابوو و دەیگوت: نامەوێ لە کاتتان بگرم.

هەر بەڕاستی نەدەهاتە ژوور, کە بابم دەستی گرت و هێنایە ژوور! هەر ئەوەندە هاتن و خۆ پێشان دانانە بوونە هۆی جێگیر بوونیشی.

بەهەر حاڵ تا هاتە ژوور و دانیشت, لە جێگەی خۆی هەستا و چوو بۆ چێشتخانە و بەروانکەی بەست و گوتی تا لێرەیە دەستێك لە ماڵەکە بخشێنێ!

دەستشۆری وەك گوڵ شرد و چێشتخانەی هەڵوێژارد و چوو بۆ ژووری بابم و مێزەکەی ڕێك کرد و کلێنسێکیشی پێدا هێنا, ئەو کراسانەشی کە ئێقەکەیان پیس ببوو, بردنی بۆ ناو جلشۆرەکە و پێی کرد.

هەموو ئەو کارانەشی کە دەیکردن, بە مەکر و ناز و ئەدا دەیکردن! قسەی لەگەڵ دەکردین و پێدەکەنی و کاری دەکرد و گۆرانیی دەگوتن, جار جارەش ((خوالێخۆشبوو))یەکی بۆ دایکم دەنارد و دڵی منی بۆ خۆی نەرم دەکرد! درەنگانی شەویش بابمی بردە کن حەوزەکە و تینوێتی شکاند و لە تاریکی دا بەجێی هێشتین و ڕۆیشت.

یەك دوو جاری دیکە بەو شێوەیە هات و دوو هەفتە دواتر, بوو بە ژنی بابم. هەر ئاوا بە ئاسانی! گرێبەستێکی تایبەت لە کن دادوەر و دوو ئاڵقە و دەستە گوڵێك و کارتۆنێك شیرنی! هەر ئەوەندە! بەبێ مارەکردن و ئەو شتانە! هەمان کات بە جانتایەك جلکەوە هاتەماڵمان!

ئێستا حەتمەن بیر دەکەیەوە کە دوای ئەوەی بوو بە ژنی بابم و وەکو هەموو ئەو چیرۆکە دووبارانە, دەستی کرد بە ئازاردانی من کاتێك بابم لە ماڵ دەردەکەوت و کاتێکیش دەهاتەوە بە جێی ئازاردان, میهر و خۆشەویستی و ئەو شتانە؟!

تۆ دەڵێی چی خانمی پارێزەر؟!

– باقیەکەی کە ماوە بیڵێ دەردەکەوێ!

ـ ئیدی ماندوو بووم, جگەرەیەك پێ دەکەی بیکێشم؟!

– من جگەرە ناکێشم.

ـ جاری داهاتوو کە هاتی, پاکەتێکم جگەرە بۆ دێنی؟

– نا!

ـ زۆر چیڕی هاا!

– تۆش جاری وایە زۆر بێ ئەدەب دەبی!

ـ دەی باشە ببوورە!

– ناتەوێ باقییەکەم بۆ تەواو بکەی؟

- با بۆ جاری داهاتوو بێ! ئەرێ کچەکەت چۆنە؟

– باشە, سوپاس.

- ئەدی مێردەکەت؟

– ئەویش باشە.

- ئیشی چییە؟

– لە فەرمانگەیەك کار دەکات. هەروەها لە شەریکەیەکیشدا.

- تا ئێستا ڕووی داوە جارێك بچی سەردانی بکەی تا بزانی لەوێ چ خەبەرە؟

– پێویستم بەو شتانە نییە.

- حەتمەن وەکو چاوەکانت متمانەت پێیەتی؟!

– بەو شێوەیە!

(پێکەنین)

- زۆر گەمژەی خانمی پارێزەر! ئیدی ناتوانی ئەوەیان بڵێی, کە لە من شارەزاتری, یان ئەزموونت باشتر هەبێ! من کرمی ئەو کارەم! بهێڵە بۆتی باسکەم! بە چوار چاوان چاوت لە هاوسەرەکەت بێ, هەر چاو بتروکێنی, فڕاندوویانە! ئەویش لەو ڕەبەنیەدا!

(پێکەنین)

- گوناه لە تۆ نییە, ئەو کەشەی کە تێیدا بوویی, چاك ڕەشبینی کردووی!

– ئەو کەشەی کە من تێیدا بووم, فێری کردووم کە ئاگام لە خۆم بێت!

(پێکەنین)

- بەختی خۆت یەکێك پەیدا نەبێ و بیەوێ مێردەکەت تاقی بکاتەوە! ئەوانە تا ئەوکاتەی باری ماڵ و داراییان باش نییە, زۆر باش و لەسەرخۆن. کاتێکیش حاڵیان باش دەبێ, هەر بیریشی لێ مەکەوە چۆن دەگۆڕێن.

– هەرچۆنێك بێ هاوسەری من بەو شێوەیە نییە.

ـ شوکری خوا! ئێستا جاری داهاتوو, کەی بەنیازی بێی؟

– چوارشەممە.

ـ ئەگەر جگەرەشم بۆ ناهێنی, هیچ نەبێ شتێکی دیکەم بۆ بێنە.

– چت دەوێ؟

ـ پارچەیەك چوکلێت! لە ئێرانییەکان! پارەشم پێ نییە بتدەمێ ها! دەبێ میوانداریم بکەی! لە بری ئەوە هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم, تا ئەزموون بەدەست بێنی!

– حاڵت چۆنە ئێستا لە گرتووخانە؟

(پێکەنین)

ـ وەك ئەوانی دی!

(بێدەنگی)

( دەنگی داگرتنی دوگمەی تەسجیل)

***

((شریتی دووەمیش تەواو بوو. چاوم داخستن و کەوتمەوە بیری ئەو ڕۆژانە.

ئەو ڕۆژە کاتێك لە گرتووخانە هاتمەدەر, لەبەر ئەوەی فایلەکەم پێ نەبوو, چوومەوە ماڵ تا ئەو ئیشانە بکەم کە لێیان دواکەوتبووم. سەعاتێك لە ماڵ بووم و دواتر جلەکانم گۆڕین و دەستم کرد بە کار کردن. سەرەتا دەبوو گەسکی کارەبام لێ دابا. چوومە ژوور کە گەسکە کارەباییەکە بهێنم, کە لەناکاو چاوم بە چاکەت و پانتۆڵەکەی بێهروز کەوت. لەناکاو هەستێکی نامۆ بە خێرای ڕووی تێکردم!

دەستم کرد بە گەڕانی جلەکانی! دەستم لە هەموو گیرفانەکانی ڕا دەکرد! نازانم بۆ دڵم دەیویست شتێك ببینمەوە! لەوانەیە بۆ ئەوەی پاکانەی ئەو بۆخۆم دەستەبەر بکەم! بەڵام ئەگەر دەمدیتەوە چی؟ ئەوکات دەبوو چم کردبا؟!

بە خێرایی گەسکی کارەبام هەڵگرت و دەرگای دۆڵابم داخستەوە و لە هۆڵەکە وەیارەکەم لە پلاکی کارەبا ڕا کرد و دەستم کرد بە گەسك لێدان. کاتێك دەنگی گەسکەکە بەرز بۆوە, هەستم بە دۆخێکی سارد کرد. دۆخێکی سارد و پوچ کە من لەناویدا مابوومەوە.

ئەوە منم چ کارێك دەکەم؟! دوای ئەو هەموو ساڵ خوێندن و زەحمەت کێشانە, ئێستا خەریکی گەسك لێدانم؟! ئەوەیان خۆ خزمەتکارێکی سادەش دەتوانێ بیکات!

من لە کوێی ئەو ژیانەدا وەستاوم؟! هەر بەڕاست, ئایا قورسایی ئەو ماڵە منم یان بێهروز؟! کەواتا بۆچی دەبێ بەرپرسی ماڵ ئەو بێ؟! بۆچی دەبێ من بە ناوی خێزانەکەی ئەو بناسرێم؟! ئەو کە بەیانی لە خەو هەڵدەستێ, نانی بەیانیی بۆ ئامادەیە! جلەکانی ئامادەن, تەنیا نان دەخوات و جلەکانی دەبەر دەکات و دەڕوا! کاری بە هیچیش دا نییە! نە بە کڕینی شتی ماڵەوە, نە بە دەرس و ڕاهێنان و قوتابخانەی سوگێل, نە بە خاوێنکردنەوەی ماڵ, نە بە نان ئامادەکردن, نە بە پەروەردەکردنی کچەکەی, بە هیچ شتێك! هەشت و نیوی بەیانی دەڕوات بۆ فەرمانگە تا سەعات چوار. چوار و نیو دەگاتە شەریکەکەی تا هەشت و نیو. نۆ- نۆ و نیو لە ماڵێیە. تەقریبەن دوازدە سەعات. دوای ئەوەش کە هاتەوە ماڵ, ئیدی کارەکانی تەواو بوون و تەنها ئیسراحەت دەکات, ئەی من چی؟! سەعات شەشی بەیانی لە خەو هەڵدەستم و نانی بەیانیی تەیار دەکەم و بانگی سوگێل دەکەم و نانی پێ دەدەم و بەڕێی دەکەم بۆ قوتابخانە. تا ئەوکات

بێهروزیش هەستاوە. ئەویشم کە بەڕێکرد, ئەوجار نۆرەی شردنی قاپ و قاچاغ دێت و دواتر دەبێ خۆشم بچمە سەر کار. زیاتر تا سەعات یەك یان دوو کار دەکەم. دوایش کارە ناتەواوەکانی ماڵەوە.

بێهروز چەند پارە وەردەگرێ؟! ئەی من چەند؟! وەك یەك؟! نا! من زیاتر وەردەگرم! تەقریبەن دوو هێندەی ئەو! ئەگەر وا بڕیار بوایە کە تەنها ئەو کار بکات, ئەوە تەنها دەیتوانی کرێ خانووی پێ بدات و لەتکە نانێکیشی دەخوارد تا نەمرێ لە برسان! گەسکەکەم کوژاندەوە و چوومە لای دۆڵابەکەی. چوار جۆر عەتری گەورەی گران بەهای هەبوون! ڕاهاتبوو کە جلەکانی ژێرەوەی هەموو ئەوروپیی بن. سێ جۆر پێڵاو! گۆرێی ئەوروپی, دە کراسی پیاوانە کە هەر ڕۆژە و یەکێکی دەبەر دەکرد! ئەرێ بۆچی؟! مەگەر تەواوی فەرمانبەران هەر ڕۆژە و کراسێك دەبەر دەکەن؟! گەڕامەوە سەر گەسکەکە و پێم کردەوە! دووبارە من مامەوە لەو نێوانە دا و دەنگی گەسك و دەورووبەرم!

بۆچی هەموو کات دەبێ من دووەم بم؟! دووەمیش کە نا, سێیەم! بۆچی دەبێ هەموو کات لە هەڵبژاردنی تایبەتی دا بێهروز بێ و دواتریش سوگێل و ئاخیرەکەشی کە تەواوی سەرفیات کراوە و تەواو بووە, من!

ڕووپۆشی هەرزان, پێڵاوی هەرزان, لچکی هەرزان! بۆچی؟! بۆچی ئەوەندە خۆم بە کەم دەزانم؟! بۆچی ئەوەندە لە ژیاندا کەمم هێناوە؟! هۆکەی چییە؟! تەنها لەبەر ئەوەی مێردەکەم فەرماندەرە و ژن و منداڵی هەیە؟! ئێ منیش هەر وام! هاوسەر و منداڵ و ژیانم خۆشدەوێن, بەڵام بۆچی دەبێ (( هەرچی چۆن))ەکان بۆ من بن؟!

تەحەموولی هەموو ئەوانەم کرد, چونکە پێم وایە هاوسەرەکەم فەرمانبەرە؟! ئێ ئەوە ئەرکیەتی! دەبێ بەو شێوەیەش بێ! هەموو ئەو کارە خەراپ و

ناشیرنانەی کە ئەو دەتوانێ ئەنجامیان  بدات, منیش دەتوانم بیانکەم! کەواتا چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان من و بێهروز دا؟!

زەنگی تەلەفونەکەم لێیدا, گەسکەکەم کوژاندەوە, بێهروز بوو!

ـ سلّاو, چۆنی؟

– باشم.

ـ چووی بۆ کن ئەو کچە؟

– بەڵێ, تۆ لە کوێی؟

ـ دەتویست لە کویێ بم؟ فەرمانگە!

– چت دەویست؟

ـ کراسە خۆڵەمێشیەکەت شردم؟

– بەڵێ. بۆچی؟

ـ سبەی دەمەوێ دەبەری کەم, بە چییەوە خەریك بووی؟

– گەسکم لێ دەدا.

ـ قوربانی دەستت, ئوتویەکیش لە کراسەکە دەدەی؟

ـ تەرانە!

– ها؟

ـ چی بووە؟ ناڕەحەتی؟!

– نا!

ـ بە شێوازێك قسە دەکەی!

– لە بیری دۆسیەی ئەفسانە دام!

ـ ئەوەندە خۆت ناڕەحەت مەکە, ئیشەڵڵا چاك دەبێ! کارێکت نییە؟

– کەواتا خوا حافیز.

ـ خوا حافیز.

(( تەلەفونەکەم داخستەوە و چووم کراسەکەم لەبەر دەست دانا, تا لەبیری نەکەم و ئوتوی بکەم, چوومەوە سەر گەسکەکە ! سەعاتێك دەبوو کە پێم کردبوو, وەلێ تەنیا ژوورێکم گەسك دابوو! سێ جار, چوار جار, پێنج جار! سەعاتێك بیر! بەبێ هیچ ئەنجامێك! لە ژورێکدا دەخولامەوە و گەڕابووم! لەوانەشە دە ساڵ گەڕابم و خولابمەوە !))

***

**((شریتی سێیەمم خستە ناو تەسجیلەکەوە))**

**شریتی سێیەم**

**چوار شەممە سەعات 9:30, ڕێکەوتی... گرتووخانەی ژنان...دۆسییەی ژمارە... ناو ئەفسانە...**

- زۆر بەتامە! بە چەندت کڕیوە؟! تازە هاتووە؟!

- بەڵێ تازەیە. چوکلێتی سافیە.

- دەستت خۆشبێت!

- ئێ دەست پێ بکەین؟

- سڵاو ئەو کەسانەی کە گوێتان لەم شریتە دەبێ!

- ئێ بڵێ!

(بێدەنگی)

- دەمەوێ بڕۆم! لەوێ کە هیچ نییە! لەوێ خۆ لچکەکان هەڕاج ناکەن! خۆ لەوێ کچە سارد و بێ گیانەکان لە پشتی شیشە زیندانیی ناکەن! لەوێ خۆ نرخ بۆ ڕووپۆش دانانێن!

دەمەوێ بڕۆم! خۆ لەوێ دیواری لێ نییە! خۆ لەوێ مرۆڤەکان, وەکو ڕۆژی سێزدەبەدەر, لەسەر حەسیرێك هەموویان لە دەوری یەك دانیشتوون و شوتیی دەخۆن! خۆ لەوێ بۆشاردنەوەی شوتی, لە دەوری خۆیان دیوار دروست ناکەن!

جوانە؟! بۆخۆم گوتم ها!

- جوانە !

ـ تۆ حەز بە شیعری نویَ دەکەی؟

- من حەزم لە هەموو شتێکی جوانە.

ـ تۆش کاتێك سەیارە نەبووی, حەزت دەکرد شیعر بڵێی؟

- چی نەبووم؟

ـ سەیارە !

(پێکەنین)

ـ سەیارەی مریشکفرۆشی !

- من کچێك زیاترم نییە ؟

ـ ئەگەر مێردەکەت بیەویَ, دەتبیَ! دەواجینێك! وەکو مریشکی مەسڵەحە !

(پێکەنین)

- تۆ فکرت زۆر خراپ و نەخۆشانەیە !

ـ هزری من واقعبینانەیە ! ئەگەر دیسان مێردەکەت منداڵی بویَ چی دەکەی؟

- لەوانەیە دژی بم!

ـ ئەگەر سور بوو چی؟

(بێدەنگی)

ـ منداڵت نەبیَ مافی خۆیەتی ژنێکی دیکە بێنیَ!

(بێدەنگی)

- خەریکە دەست و لاق دەوەشێنی؟! تۆ بەڕاستی خەریکە دەست و لاق دەوەشێنی؟! دەمەویَ بڕۆم! لەویَ کە مریشکە پیرەکان سەر نابڕن! لەویَ پێش ئەوەی جوچکەکان لەدایك بن, ڕەنگیان ناکەن!

(بێدەنگی)

هەرچی چۆن بێ شوکا بوو بە زڕدایکم! ناوی شوکا بوو!
بەیانیی ئەو ڕۆژەی کە هاتە ماڵمان, کە لە خەو هەستام, دیتم وەکو تەواوی ڕۆژانی دیکە بابم بەخەبەرە و خەریکە نانی بەیانیی ئامادە دەکات. کە منی دیت گوتی: "هێواش قسە بکە دایکت نووستوە" ئەوەندە لە بابم توڕە بووم کە هەر باسی مەکە! چەند بە ئاسانی جێی دایکمی دا بە شاگردێك! لەو کاتەوە بڕیارم دا دژی شوکا بوەستمەوە, کە ئەگەر بیەوێ جێی دایکم بگرێتەوە, ئەوە ناتوانێ.
سەعات سێ کە گەڕامەوە ماڵێ, پێشتر لە ڕێگە خۆم بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە ئامادە کردبوو! حیسابی ئەوەم کردبوو کە چۆن ئارامبگرم تا ئەو بێتە پێش و سەلام بکات و جوابی بدەمەوە و دواتر ئەگەر خۆی بۆ شل کردم, چبکەم و ئەو شتانە, بەڵام هەموویان وەك ڕیس وابوون, بوونەوە خوری!
گەیشتمە قالدرمەکان, بیستم دەنگی مۆسیقا دێت! وامزانی هی ماڵی جیرانەکانە, بەڵام تا گەیشتمە پێش دەرگای باڵەخانەکەمان, دیتم کە لە ماڵی ئێمەوە دێ. کلیلەکەم خستە دەرگاکە و ویستم هەر دەرگا بکەمەوە و هاوار بکەم بڵێم بۆچی ئەوەندە دەنگی تەسجیلەکەی زیاد کردووە کەچی لە دیتنی زمانم گرا.
شوکا عەزیزییەکی دەبەر کردبوو و لەو ناوەڕاستە سەمای دەکرد! سەرم سوڕ ما لێی, هەر ئەوەندە بوو منی دیت بە پێکەنینەوە بۆ لام هات و جانتاکەی لە دەستم وەرگرت و فڕێی دایە سوچێك و دەستی گرتم و بردمییە ناوەڕاستی هۆڵەکە و دەستی کردەوە بە سەما! جەوی ماڵێ ئەوەندە خۆش بوو, کە منیش کەوتمە ژێر تەئسیری ئەو و منیش دەستم کرد بە سەما! سەما و پێکەنین! بە شێوەیەك خۆی دەردەخست کە مرۆڤ دەمرد بە پێکەنین! گاڵتەجاڕی و جوڵەی سەمای جوان. ئەوەندە جەستەیەکی نەرمی هەبوو, کە زۆر بە ئاسانی بنە لاقی وەکو جومناستیك دەهێنایەوە سەر سەری.

بەڕاستی جوان سەمای دەکرد!

ڕێك نیو سەعات سەمامان کرد کە من هەناسەم تەنگ بوو و خۆم هەڵدایە سەر قەنەفە, بەڵام ئەو هێشتا وزەی هەبوو! تەڕ ببووم ئەوەندەم ئارەقە کردبوو, هەر بەو سەمایەی چوو چەند کلێنسێکی بۆ هێنام وێی دام و دواتر دەنگی تەسجیلەکەی کەم کرد و گوتی:

– سڵاو! سڵاو لە جوانرین کچەکان!

(( سەلامم لێ کرد, کە خێرا ڕۆیشت و کەمێك دواتر بە پەرداخێك شیرەوە گەڕایەوە و گوتی))

– بگرە بخۆوە! لە تەمەنی تۆدا حەتمەن دەبێ ڕۆژی سێ پەرداخ شیر بخورێتەوە! بۆ جەستەت, باڵا, موو, ددان و خولاسە بۆ هەموو شتێك باشە!

(( ئیدی قسەیەکم بۆ گوتن نەبوو! پەرداخەکەم لێ وەرگرت و خواردمەوە کە گوتی))

– خۆ نارەحەت نەبووی کە بەیانی نانم بۆ ئامادە نەکردی؟!

ـ نا! یانی خوومان پێوە گرتووە!

– دەتەوێ لە بەیانییەوە هەستم؟!

ـ نا!

– ئاخر زۆر سەختە بۆم بەیانیان زوو هەستم! قوتابخانە چۆن بوو؟

ـ باش بوو!

– چاوەڕێ دەکەی تا بابت دێتەوە یان برسیتە؟

ـ نا! چاوەڕێ دەکەم! شتت ئامادە کردووە بۆ نیوەڕۆ؟

- ئەریَ, هەندیَ شت! بەهەرحالَ چاوەڕیَ مەکە دەستاوی خواردن دروستکردنم وەکو دایکە فریشتەکەت بیَ! دایکان هەموو کات گولَن, مانگن, نازدارن و هەموو شتێکیان باشە! وەکو دایکی خۆت!

(( ئەوەندە کەیفم بە قسەکانی هات هەر باسی مەکە!))

- ئەمڕۆ دەرست زۆرن؟

ـ زۆر نا!

کەواتا هەستە برۆ حەمامێك بکە تا بابت نەهاتۆتەوە دەمەویَ دەستێك لە مووەکانت بدەم!

((نەمدەزانی خەیکە چ ڕوو دەدات, ئایا ئەو شتانە ڕاستیین یان خەیالَ؟ هەستام و جلەکانم دانان و چوومە حەمام کە دە دەقە دواتر هەر لە دەرێڕا هاواری کرد و گوتی))

- دەتەویَ بێم پشتت بشۆم؟

(( شەرمم لە خۆم کرد کە بە خراپ بیرم لیَ کردبۆوە! بە هێواشی گوتم))

ـ نا سوپاس, لفکەی درێژمان هەیە!

(( چارەگێك دواتر هاتمە دەریَ, کە هاتە پێشم و هەر بەو شێوەیەی کە گۆرانی دەگوت, دەستی کرد بە ئیشککردنەوەی سەرم بە خاولی! ڕێك وەکو دایکێك! واتا لەوانەیە هاوسەری بابیشم ئاوا بووبیَ! خولاسە چووین بۆ ژووری نووستن و بەرانبەر مێزی ئاڕایش داینیشاندم دەستیکرد بە شانەکردنی قژم))

- دەبیَ بەپەلە مووەکانت ڕێکبخەم, جاری داهاتوو لە کاتی خۆیدا مۆدیلێکی جوانی پیَ دەدەم!

(( کەمێك بە مجەفە ئیشی کرد و دواتر ستایلێکی جوانی بە پرچم دا و گوتی))

- نارێکە! دوای دەبیَ بۆت چاك بکەم!

ـ مەگەر ئاڕایش دەزانی؟!

- دیبلۆمم هەیە لێی!

ـ بەڕاست؟!

- ئەڕێ وەڵڵا! وەلێ ئێستا نابێ! خەریکە بابت دێتەوە! با بۆ دوایی بێ!

(( ڕاستی دەکرد, لە ماوەی دە دەقەدا ئەوەندە پرچی جوان کردم کە بۆخۆم پێم سەیر بوو))

- چۆنە؟!

ـ نایابە! زۆر جوانت ڕێك خستووە! دەستتخۆشبێ!

(( هەستام و بە شەرمەوە ڕوومەتیم ماچ کرد, دەستی بە پێکەنین کرد و گوتی))

- باشترین حەقدەستی ئاڕایشت پێ دام! بچم ئیدی ئەوە وەختی نان خواردنە, بابیشت کە هاتەوە حەقدەستێکیش لەو وەربگرم!

(( پێکەوە بە پێکەنینەوە چوین بۆ چێشتخانە, هەر لە پێش دەرگاوە سەرم سوڕ ما! ئەسڵەن بیرم نەدەکردەوە کە شوکا بەو شێوەیە بێت!

مێزێکی ڕازاندبۆوە چەندە جوان؟! ئەوەندە جوان دیزاینی کردبوو, کە لەناکاو هەستم بە برسێتی کرد! چاوێکم لێ کرد و گوتم:

ـ چەند بە سەلیقەوە ئامادەتانکردووە مێزەکە؟!

- ئامادەتان کردووە چییە؟! بڵێ ئامادەت کردووە!

((پێی پێکەنیم کە گوتی))

- بە دڵت بوو؟

ـ زۆر!

- ئەو ماوانەی کە بێ ئیش بووم, ڕۆیشتووم دەورەم دیوە.

ـ نایابە!

– حەزت لە کفتەیە؟

ـ بۆ نیوەڕۆ کفتەمان هەن؟!

– نەکا حەزت لیّ نەبیّ؟

ـ هیوایەتمە!

– ئەوە غازەکەم کز کردووە تا وشك سارد نەبێتەوە! یانی ئامادەیە ئیدی! ئەگەر برسیتە تا بۆت بێنم؟!

ـ نا نا! ئێستا ئیدی بابم دێتەوە!

– چا دەخۆیەوە یان قاوە؟

ـ چا! بۆخۆم تێدەکەم.

– دانیشە ئێستا تێدەکەم.

(( چوومە هۆڵەکە, کە ئەویش چوو جلەکانی لەبەر کردنەوە و کەمێك دواتر بە سینییەك هاتەوە و لە تەنیشتم دانیشت و فنجانێکی پێدام و گوتی))

– هیچ لەوە ناخۆشتر نییە کە مرۆڤ دایکی لە دەست بدات! خۆم ئەو بەڵایەم بەسەر هاتووە! زۆر لە تۆ بچووکتر بووم!

(( ئاهێکی هەڵکێشا و کەمێك لە –چا–کەی خواردەوە و گوتی))

– وازی لیّ بێنە! ئەو قسانە بێجگە لە غەم و خەفەت هیچی دیکەیان نییە! قسەم بۆ بکە! باسی هاوڕێکانتم بۆ بکە, باسی خۆت, باسی قوتابخانە, دە بلّیّ دەی! هاوڕێی خۆشەویست و گیانی بە گیانیت هەیە؟

ـ بەڵیّ, لەگەلّ یەکێك لە هاوڕێکانم زۆر گیانی بە گیانیم!

– ئیّ بیهێنە مالّ! شەوێك بۆ ئێوارە دەعوەتی بکە!

ـ ئاخر...!

– ئاخر و ماخری ناویّ! هەر کات ویستت بلّیّ!

(( له هەمان کات دا دەنگی کلیل هات و دەرگا بۆوە و بابم هاتە ژوور, کە شوکا خێرا فنجانەکەی لەسەر مێزەکە دانا و لە جێی خۆی هەستا و چوو بۆ لای بابم و سەلامی کرد و گوتی))

- دەکرێ بزانین ئەوە تا ئێستا لە کوێ بوی کابرا؟ وەرە زوو من لەگەڵ ئەو کچەت یەکلایی بکەوە کە ئیدی تاقەتم نەماوە!

((من و بابم واقمان وڕ ما! من کە پەشۆکابووم! دوای ئەو هەموو میهرەبانییە, ئەسڵەن نەمدەزانی باسی چی دەکات! بابم کەمتر, بەڵام ئەویش ڕووی گرژ کرد و گوتی))

- چی بووە؟! ئەفسانە؟! چی بووە؟!

((دەبوو چی بڵێم, کە لەناکاو شوکا پێکەنی و گوتی))

- هیچ! دەتویست چی ببێ؟! ئەو کچەت هەناسەی نییە! نیو سەعات سەما دەکا دوای لەهۆش خۆی دەچێ!

(( بابم هەڵوەستەیەکی کرد تا بابەتەکە بگۆڕێ! هەروەها منیش! دواتر هەردووکمان پێکەنین کە بابم گوتی))

- بەڵات دەوێ شوکا! سوێند بەخوا زۆر ترسام!

((دوایی بە خێرای بابمی ماچ کرد و جانتاکەی لێ وەرگرت و گوتی))

- بڕۆ مردین لە برسان!

((بابم چوو جلەکانی بگۆڕێ کە من و شوکاش چوینە مدبەق و شوکا بەخێرایی کفتەکانی لە قاپەکان کردن و لەسەر مێزی دانان, کە بابیشم هات, سەیری مێزەکەی کرد و سەری سوڕما و پێکەنی و گوتی))

- بەه بەه! چ مێزێك! چ خەبەرە ئەوڕۆ؟! جەژنتان ساز کردووە؟!

((شوکا پێکەنی و گوتی))

- سەلیقەی من و ئەفسانەیە, وەرە دانیشە تا سارد نەبۆتەوە!

((هەرسێك بەیەکەوە دانیشتین و دەستمان کرد بە خواردن, بەڕاستی تامیان زۆر خۆشبوون, وەك چۆن ئێمە دەمانخوارد و شوکاش بەردەوام بوو لە نوکتە گێڕانەوە و ئێمەش پێدەکەنین. نازانم ئەو هەموو نوکتا تازانەی لە کوێ هێنابوون!

خولاسە کە نانمان خوارد, من خێرا خۆم گەیاندە قاپەکان و نەمهێشت ئیدی ئەو قاپەکان بشوا. شوکا مێزەکەی خڕکردەوە و منیش قاپەکانم شردن. بابیشم هەر وا لە شوێنی خۆی دانیشتبوو و جگەرەی دەکێشا و باسی شەریکەکەی دەکرد.

نیو سەعات دواتر بابم چوو بنوێ و شوکاش لەگەڵی ڕۆیشت و منیش خەریکی دەرسەکانم بووم. کتێبەکانم کردنەوە, بەڵام هەمووی یان بیرم لە کارەکانی شوکا دەکردەوە, یان نوکتەکانی کە گێڕابوونیەوە.

تەقریبەی سەعات حەوت و نیو بوو کە لە دەرسەکانم تەواو بووم و ئەوانیش خەبەریان بۆوە و شوکا هاتە چێشتخانە و قاپێك میوەی ئامادە کرد و بردیە هۆڵەکە و بانگی کردین. بۆخۆشی دەستی کرد بە میوە دانان و دوو قاپی لە پێش ئێمە دانا و گوتی:

- ئێ! بەرنامەی ئەوشەومان چییە؟

((من و بابم چاومان لێك کرد! کە گوتی))

- نەکا بتانەوێ لەماڵ دانیشن؟! دایە گەورە و بابە گەورە هەوای دەرێ ساردە! نەچن لاقتان لە ژوور ببەنە دەر, دەنا سەرماتان دەبێ و دەکەونە سەر جێ!

((من و بابم پێکەنین کە گوتی))

- هەستن ئیشەکانتان بکەن بچینە پارکێك! ئێوارەش ساندویجێك شتێك بخۆین لە دەرێ.

((بابم گوتی))

ـ ئاخر بەو شەوە؟!

((شوکا نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات کە گوتی))

- هەستە تەمبەڵ وەختی ئەوە نییە! مرۆڤ لە ماڵدا هەستی خەرا دەبێ! هەر ئەوەندە بڕۆین سەعاتێك نیو سەعاتێك پیاسەیەك بکەین, وزە وەردەگرین, بۆ ئەفسانەش باشە!

((من کە لە خوام دەویست. بابیشم بە تۆبزی هەستا و هەرسێکمان جلمان دەبەر کردن و لە ماڵ وەدەرکەوتین. هەوا سارد بوو. سواری سەیارە بووین و چوینە پاڕك. .کەمێك تێی سوڕاینەوە و دواتر چوینە کافتریاکەی و دانیشتین و هەر یەکەو نیسکافەیەکمان داوا کرد. چوار دەورمان پڕ بوو لە کوڕ و کچ و یەك دوو خێزانیشی لێ بوون. شوکاش بۆی باسی سەردەمی خوێندن کردین. یەك دوو یادگاریی گێڕانەوە کە ئێمە مردین ئەوەندەی پێبکەنین! دواتریش چوین لە شوێنێك ساندویچمان خوارد و گەڕاینەوە ماڵ. زۆر خۆشم بەسەر برد. ڕاستییەکەی عاشقی شوکا ببوم. عاشقی ڕەفتارەکانی, ژیانی, پێکەنینەکانی, ڕۆحیەی, بەڕاستی نایاب بوو!

ئەو شەوە زۆر بەباشی خەوتم و بەیانیەکەشی وەکو ڕۆژی پێشوو, وردەوردە کارەکانمان کردن و لەماڵ وەدەرکەوتین. زۆر وریا بووم کە دەنگە دەنگ نەکەین تا شوکا لە خەو نەکەین.

(بێدەنگی)

- دەمەوێ بزانم لە چ کۆڵانێکی بێ دەرەتان بە ماتی وەستاوم؟! لە پشتی کام دەرگای بەخت, خەوێکی پیس دەبێتە میوانم؟! میوانی کچێکی چارشێو بەسەر, کە کەچکەکەی, بە شەرمەوە لە کاسەی بەتاڵ دەکوتێ!

دەمەوێ بزانم کە دوای نیوەشەو, شاری من چۆن بێدەنگی باڵی دەکێشێ بەسەر دا و دەنوێ؟! دەمەوێ تا کۆتایی خەوەکەی چاوەڕێکەم, دەمەوێ کۆتایی شەوەکە ببینم! دەمەوێ بێداری کەمەوە تا جوڵەی دواتر. سەربازی ماڵێك بگەڕێتەوە!

(بێدەنگی)

- خەوت دێ خانمی پارێزەر؟
- نا! گوێم لێتە!
- هیچت دەستکەوت؟
- دەبێ لەسەرخۆ بی.
- کچەکەت پۆلی چەندە؟
- تخوا تێکم مەدە!

(پێکەنین)

- دەترسی؟
- نا! مەسەلە ترس نییە! منیش دەتوانم ئەو کارە لەگەڵ تۆ بکەم!
- من تەنها پرسیارت لێ دەکەم و تەواو!
- پرسیارەکانت خەتەرن!
- تا ئێستا هەڵسوکەوتی پیاوێکت لەسەر جادە دیوە؟ یانی دیقەتت داوەتێ؟

(بێدەنگی)

- ئاگای لە هەموو دەور و بەریەتی! بۆ نموونە کاتێك لە سەیارەدا دانیشتووە! تا سەیارەیەکی دیکەی بە تەنیشت دا دەڕوات, کە ژنە, خێرا سەری بۆ وێ دەسوڕێنێ! دوایش بۆئەوەی لە کن هاوسەرەکەی هەست بە کەمی نەکا, تانە و

تەشەرێك لەو سایەقە دەدا و بۆ نموونە دەڵێ: دیتت چۆن بە خراپی سەیارە لێ دەخورێ؟!

(پێکەنین)

– دەبێ زیاتر ئاگات لە خۆت بێ خانمی پارێزەر!

ـ تخوا کچێکی بیست و سێ ساڵە چ لە پیاوان دەزانێ؟

– زۆر شت!

ـ بەو تەمەنە کەمە؟!

– ئەزموونە ئیدی! دەکرێ لە تەمەنێکی کەم بەدەستی بێنی!

(بێدەنگی)

– دەتەوێ شتێکت پێ بڵێم؟!

ـ بڵێ!

– بۆ جارێکیش بێ برۆ شەریکەکەی! زۆر شتت بۆ دەردەکەوێ!

ـ چ شتێکم دەبێ بۆ دەرکەوێ؟

– پیاوان کاتێك بە تەلەفون بە نەرمی قسە دەکەن, ترسناکن!

ـ چ پەیوەندی بە چوونە شەریکەوە هەیە؟

– کاتێك لەسەر تەلەفون دەڵێن: "نا! بەڵێ! دوای!"

ـ خەریکە شێتم دەکەی!

(پێکەنین)

– مادام خوا حافیز تا کەی؟

ـ شەممە.

– کەواتا تا شەممە بەیەکەوە پیر و خەرۆ بن!

(پێکەنین. دەنگی داگرتنی دوگمەی تەسجیل)

((شريتى سێيەميش تەواو بوو. تەسجيلەكەم كوژاندەوە. ئەو كچە وردەوردە دەهاتە مێشكمەوە! خەريكبوو دنەى هەستى ڕەشبينمى دەدا!
ئەو ڕۆژە, دواى ئەوەى كە لە گرتووخانە هاتمە دەر, تەنها بيرم لاى ئەو بوو, كە بێتەوە يادم بێهروز لەسەر تەلەفوون چۆن قسەم لەگەڵ دەكات! وەلێ هەرچەند فكرم كردەوە, شتێكم نەكەوتەوە ياد! يانى تا ئێستا هۆشم لەسەر ئەوە نەبووە!
لەوێوە دەبوو بچمە دادگا! فايلێكم هەبوو كە تا سەعات يەكى دوا نيوەڕۆ ماتەڵى كردم و خێرا خۆم گەياندەوە ماڵ. نازانم چۆن لەگەڵ گەيشتنەوەم بۆ ماڵ تەلەفونم بۆ فەرمانگە كرد, نەبوو. لە ياريدەدەرەكەم پرسى, بەڵام ئەويش نەيزانى! تەنيا گوتى: سەعات يازدە سێ سەعات مۆڵەت وەرگرتووە و ڕۆيشتۆتە دەرێ!
دامخستەوە و تەلەفونم بۆ موبايلەكەى كرد. دوو سێ جار كردم تا جوابى دايەوە.
ـ ئەلو! بێهروز!
– سڵاو.
ـ سڵاو, لە كوێى؟
– بەشى ڕاگەياندن! هاتووم بەدواى چەند ڕاگەيەنراوێك, تۆ لەكوێى؟
ـ ماڵ.
– ئيشت هەبوو؟
ـ نا! هەر وا زەنگم لێدا! بۆ فەرمانگەم كرد, گوتيان چۆتە دەرێ!
– چويە كن ئەو كچە؟
ـ بەڵێ.
– هەواڵێك شتێك نييە؟

ـ نا ! خۆشیت.

- دەی یاڵڵا جاریٚ سەرقاڵم. شەویٚ دیٚمەوە ماڵیٚ.

ـ باشە, ئیشت نییە ؟

- نا. خوا حافیز.

(( ڕێك ئەو کاتەی کە خەریك بوو موبایلەکەی دادەخستەوە, لەناکاو دەنگێکم بیست! خێرا موبایلەکەم بە گوێمەوە نا, بەڵام تازە داخرابۆوە. دەنگ, دەنگی پێکەنینێك بوو! یانی وەکو پێکەنین! پێکەنینی ئافرەتێك! بڵا ئاواشم وێنا کردبیٚ. لەوانەشە نا ! یانی لەوانەبوو کە لەژێر کاریگەریی قسەکانی ئەفسانە ئاوا بە بیرمدا هاتبێت.))

تەلەفونەکەم لە شوێنی خۆی دانایەوە و چووم نانی نیوەڕۆ ئامادە بکەم. وردە وردە سوگێل دەهاتەوە.

مەنجەڵی شێوەکەم لە سەلاجە دەرهێنا و لەسەر غازم دانا و غازەکەم پیٚ کرد, تا گەرم بۆوە و سوگێلیش گەیشتەوە. بە دنیایەك قسەوە, دەستی دەکرد بە قسەکردن. منیش هەموو کات بە حەزەوە گوێم لە قسەکانی دەگرت, بەڵام ئەوڕۆ تاقەتم نەبوو. هەر لە بیری ئەو پێکەنینەدا بووم. هەندیٚ جار دڵنیا بووم کە شتێکی وام گویٚ لێبوو و هەندیٚ جاریش دەمگوت خەیاڵ دایگرتووم! لەو نێوەش دا سوگێل لەسەر یەك قسەی دەکردن.

- ئەمڕۆ پەڕێکیان داوینیٚ بۆ سینەما! پێنجشەممە بڕیارە بمانبەن بۆ سینەما! هەموو منداڵەکان! دایە دەبیٚ ئیمزای کەی! هەر یەکەو دەبیٚ هەشت سەد تمەن پارە بدەین. دەڵێن فیلمەکە ئەوەندە خۆشە !

((بێهروز هیچ کات بەدوای ڕاگەیەنراودا نەدەڕۆیشت. ئەسڵەن ڕاگەیەنراو خۆ ئیشی ئەو نییە ! یانی بۆ کویٚ چووە ؟

- نزيك جەژنيش دەيانەوێ بمانبەن بۆ ئۆردووگا! دايە ڕێگەم دەدەی بچم؟ ڕەفيقەكانيشم گوتيان كە هەموويان دێن.

((بێهروز تەمەنی چەندە؟ پێنج ساڵ لە من گەورەترە! واتا چل ساڵ! باڵا بەرز و چوارشانە! قۆز و قسە خۆش.

بۆچی تا ئێستا بە بیرمدا نەهاتووە, كە بچم بۆ فەرمانگەكەی يان شەريكەكەی؟ ئەوە چووشم, خۆ هيچ تێناگەم من! بلا تێشبگەم!))

- دايە نيوەڕۆ چيمان هەيە؟!

ـ ئاييی... ! بۆ هێندەی دەڵێی سوگێل!

((بەدەست خۆم نەبوو! لەخۆوە بەسەر سوگێل دا هاوارم كرد! هەر ئاوا ڕاوەستا بوو و سەيری منی دەكرد! نارەحەتييەكانم هەموو بە سەر يەكەمين كەسدا كە لەبەر دەستم بوو, ڕشتنبوون!

خێرا چوومە پێش و ماچم كرد و گوتم:

ـ گيانەكەم كەمێك مێشكم سەرقاڵی دۆسيەكەيە! بۆ نيوەڕۆش قۆرمە سەبزيمان هەيە, ئەوەی حەزت لێيەتی! ئێستا بۆت دێنم!

((مندالّی بێچارە بەبێ دەنگی چۆ سەر مێزەكە و شێوم بۆ تێكرد و بێدەنگ و بەبێ قسە دەستی كرد بە خواردن. بۆخۆم كە هيچ ئيشتيام لێ نەبوو! دوای نان خواردن كەمێك سەيری تەلەفزيۆنی كرد و دەستی كرد بە سەعی كردن. منيش بۆ ئێوارە شتێكم ئامادا كرد و دوايش چووم كە بنووم, وەلێ فكر لەكۆڵم نەدەبوونەوە. فكری ئەو دەنگە, فكری ئەوەی كە بۆچی بێهروز دەبێ بڕوا بەدوای ڕاگەيەنراودا؟

لەناكاو دەڵێی يەكێك بە كوتك كێشای بە سەرمدا! ئەگەر بۆ ئيشی فەرمانگە چووە, ئەی بۆچی مۆڵەتی وەرگرتووە؟! لەخۆوە دەستم كرد بە گريان! خێرا

هەستام و بە هێواشی دەرگام داخست! نەمدەویست سوگێل تێبگات! دەکرا لەناکاو بێتە ژوور. لەسەر قەڵەویرەکەم دانیشتم و بە هێمنی دەستم کرد بە گریان! دەڵێی ئەفسانە ڕاستی دەکرد! زۆر دووعام کرد کە هەموو ئەو شتانە درۆ بن. وەلێ دەتگوت ڕاستن. خۆزگە ئەو دۆسیەیەم قبوڵ نەکردبا! خۆزکە هیچم نەزانیبا! ئاوا ئاسوودەتر بووم. بەڵام نا! مومکین بوو ساڵێکی دیکە لەناکاو خەبەرم پێ بدەن, کە کچێکی بیست و چەند ساڵە بووەتە شەریکی مێردەکەت!

ڕقم لە بێهروز هەستا! حەزم دەکرد هەرچی زوویە بێتەوە ماڵ, تا هەرچییەك بە زارمدا دێ پێی بڵێم و دوایش دەستی سوگێل بگرم و بڕۆم! وەلێ نا! ئەوە کارێکی دروست نەبوو. لەوانەیە ڕێك ئەو شتەی کە ئەو دەیویست.

دەبێ بیرێکی ئاقڵانەی لێ بکەمەوە کە ئەنجامێکی هەبێ. لەو کاتانە خۆ نابێ مەیدان چۆڵ کەی. دەبێ پارێزگاریی لە ژیانم بکەم. لە منداڵەکەم! لە داهاتووی منداڵەکەم. کێ ئەو مافەی بە پیاوان داوە کە هەرکات بیانەوێ هەر غەڵەتێکی بکرێ, بیکەن؟! لە خۆم تووڕە بووم! بە ناخێری گیانم خۆم پارێزەر بووم, چۆن ئاوا کوێرانە بیر دەکەمەوە؟! وەکو پیرێژنەی سەد ساڵ لەمەوبەر! گریان بۆچی؟! نابێ خۆم بە لاواز پێشاندەم! خێرا فرمێسکەکانم سڕینەوە چووم دەست و چاوم شردن. وەك چۆن لە ئاوێنەدا سەیری خۆم دەکرد, هەستم کرد چەند خەتێك لەخوار چاوم پەیدا بوون. یانی پیر بووم؟ نا! نا! نا! نابێ پیر بم, هیچ نەبێ لەو چەند ساڵەدا نا! کەواتا ئەو ئاوێنە چی نیشاندەدا؟!

هاتمە دەرێ, سەیرێکی خۆم کرد! ئەمە چ سەر و سەکوتێك بوو من هەمبوو؟ جلێك لە ماڵێکی زۆر سادە دا! بۆچی؟ چونکە دەمویست دەستی پێوە بگرم ببمە خاوەن ماڵ؟! گەمژە!

سەیری نینۆکی دەست و لاقم کرد! بەبێ بۆیە! بۆچی؟! چونکە من دەچوومە ئیش و نەمدەتوانی لەو حاڵەتەدا بۆیە بکەم؟! ئەسڵەن من بۆیەی پەنجانم هەبوو تا بەکاری بێنم؟!

چوومە زگ شتەکانی ئاراپشم! یەك دوو دانە سوراو, دوو دانە بۆیە, ڕیملێکی برژانگ و قوتویەکی ڕەنگاو ڕەنگی چاو! هەر ئەوەندە! گەمژە!

دەستت پێوە گرتووە؟ ئافەرین, جا ئەگەر پارەکە کۆ بۆوە, —کابرا—ش بۆت سەرف دەکات! ئەوەندەت خڕکردۆتەوە, هەر ئیشت کرد و پارەکەت کۆکردەوە! هەموو شتێکی کرد. ئێستە حەقی خۆتە ئاوات بەسەر بێت! کورد گوتەنی: پشیلە لەماڵ نییە, مشك تلیلیانە. کاتێك تۆ نەمێنی ئەو دەیکا بە دوو! بەڵام خۆ ئێستە من ماوم. کەواتا بۆچی لە ئێستاوە دەستی پێکردووە؟ چەند گەمژە بووم و خۆش خەیاڵ و سادە! لەو کاتەدا کە من دەستم پێوە دەگرت, ئەو بێقیمەتە ئەو پارەیەی کە کۆم دەکردەوە و سەرفم نەدەکرد, لە خۆشگوزەرانیی سەرفی دەکرد, چەندە گەمژەم!

ئێستا دەبێ چبکەم؟! نەکا کار لەکار ترازابێ؟! ئەگەر وابێ چبکەم؟ ئەسڵەن دەبێ بە ڕووی خۆمی بێنم یان نا؟ داوای یارمەتی لە کێ بکەم؟ یارمەتیی هزر, کەسێك کە ئەزموونێکی لە من باشتری هەبێ.

ئەوە لە دایکم ناتوانم, ئەگەر هەموو ئەوانە هەڵە بن, ئەوکات چی؟! ئەو کات زۆر خراپ دەبێت! خوشکەکەشم کە ئێستا هاوسەرگیریی نەکردووە و ئەزموونی نییە. هەر چەند کە بیست و حەوت هەشت ساڵ دەبێ, بەڵام ئەزموونی هاوسەرداریی نییە. ئەی چبکەم؟! دەڵێی یارمەتیدەری فکری تەنها ئەفسانەیە! بەڵام نا! دەبێ لەسەرخۆ بم. لەسەر خۆ و هێمن.

چوومە چێشتخانە و چام لێنا! دواتر چەند هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشان و تا ئاوڕم دایەوە, دیتم سوگێل لە پێش دەرگای چێشتخانە ڕاوەستاوە و سەیری من دەکات.

- دەرسەکانت تەواو کرد؟

- کەمێکم ماوە!

((بە بێ دەسەڵاتی گوتم))

- ڕۆڵەکەم زووتر تەواوی بکە, تا کاتێك بابت دێتەوە, ئیشت نەبن باشە؟

((بەسەرچاو- ێکی گوت و ڕۆیشت, من زیاتر لەخۆم توڕە بووم! بۆچی کاتێك بێهروز دێتەوە سوگێل دەبێ بێ ئیش بێ؟! بۆچی دەبێ هەر من لە خەم هەموو شت بم؟! بۆچی دەبێ هەموو شت ڕێکوپێك بێت کاتێك ئەو دێتەوە, ناڕەحەت نەبێت؟ ئەوجار ئێستا ئەو لە —کویٚ—ش دێتەوە؟ لەکن مەعشوقەکەی؟! حەزم دەکرد هەرچی لەبەر دەستمە ورد و خاشی بکەم. بەڵام ئەوە ڕێگەچارە نەبوو! دەبوو ئارام بم! دەبێ بیر بکەمەوە.

دوای ئەوەی کە پەرداخێك چام خواردەوە کەمێك هێور بوومەوە و بەسەر خۆمدا زاڵ بووم. لەوانەیە هەمووی غەڵەت بێ! لەوانەیە یاریدەدەرەکەی هەڵەی کردبێ! باشترە کە دەقیق بزانم! هەستام و تەلەفونێکم بۆ فەرمانگەکەی کرد, هەمان یاریدەدەرەکەی جوابی دایەوە. دوای سەلام و ئەو شتانە, پێم گوت))

- ببورن دوبارە بێزارتان دەکەم, ئێوە گوتتان: بێهروز ئیجازەی وەرگرتووە؟

((هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی))

- نا نا! هەڵە بووم, ڕۆیشتووە بەدوای دۆسیەیەك دا.

((ئەوجار نۆرەی من بوو هەڵوەستە بکەم! یانی مەوزوع چییە؟ هیچی دیکەم نەبوو بیڵێم! یانی هەمبوو, بەڵام نەمدەتوانی بڵێم. بۆیە سوپاسم کرد و ماڵئاوایم لێ کرد و تەلەفونەکەم داخستەوە.))

یانی چی؟! حەتمەن بێهروز دوای من تەلەفوونی بۆ کردووە و پێی گوتووە و مەسەلەی ئیجازە وەرگرتنەکەی گۆڕیوە و بەویشی گوتوە کە هەرچی چۆن بێ چارەسەری بکات. ئەسڵەن هەڵەم کرد کە زەنگم بۆ فەرمانگەکە لێدا! خۆ ئەوان شەریکەکەیان بەدرۆ نایەننەوە و لای من بگرن! ئەی چی بکەم خوایە گیان؟! باشتر نییە بچم بۆ لای ڕاوێژکاری خێزانی و داوای ڕێنمایی لێ بکەم؟! بەڵام خۆ منیش جۆرێك لە ڕاوێژکارم! لیوانێکی دیکەم چا بۆ خۆم تێکرد. دەبوو بیر بکەمەوە!

پەرداخە چایەکەم هەڵگرت و چومە باڵکۆن. هەوا کەمێك سارد بوو. با کە بەر ڕووخسارم کەوت, کەمێك ئارام بوومەوە. هەندێ چاوەڕێم کرد و وردەوردە –چا– کەم خواردەوە. دە دەقیقە دواتر بەسەر خۆمدا زاڵ بووم و توانیم بیر بکەمەوە! هیچ شاهیدم هەبوون؟! بە تەوسەوە خەندەیەك! لەوانەیە ئەوکاتەی کە لەگەڵ من قسەی دەکرد, بە ڕووداو چەند کچێك بە تەنیشتی دا تێپەڕ بوون و پێکەنیون. کەواتا ئەوە هۆکارێکی بەهێز نییە لە دادگا. ئیدی چی دیکەم هەبوو؟! ئەوەی کە یاریدەدەرەکەی گوتی: ئیجازەی وەرگرتووە؟ لەوانەشە بەڕاستی هەڵەی کردبێ! ئەوەشیان خۆ بەڵگەیەکی بەهێز نییە! ئەی چی؟! دەمێنێ و نامێنێ ئەو شکەی ئەفسانە خستوویە دڵم! زۆر ڕۆیشتم! بۆ تاوانبارکردنی کەسێك, بەڵگەی زۆر لەوانە زیاتری دەوێ. ئەویش هاوسەر! بۆخۆم هەموو ئەوانەم دەزانین.

سەرمام بوو. چوومەوە ژوور. لەسەر کورسیی چێشتخانە دانیشتم. دیسان بیرم کردەوە! دیسان لە هزرمدا لە شاهید وردبوومەوە! بۆ نموونە ئەگەر بریگرتەیەك

هاتبا و پێی گوتبام کە بەو دوو بەڵگەوە لە بەرانبەر هاسەرەکەمدا بەرگریی لێ بکەم, چیم دەکرد؟! ئایا پێکەنینم پێی نەدەهات؟! بۆچی نا؟! حەتمەن هەمان کارم دەکرد! ئەی کەواتا بۆچی شتێکی ئاوام بۆ مێردەکەم دروست کردبوو؟! هێشتا زۆر کرچ و کاڵم! پارێزەرێکی بێ ئەزموون کە لەژێر کاریگەریی بریگرتەیەکی خەتاکار دا بووم. ئەوجار ڕقم لە خۆم دەبۆوە! دوای ڕق لێبوونەوە, نۆرەی شەرم لەخۆکردن بوو! شەرمم لەخۆم دەکرد! دوایش نۆرەی گاڵتەجاڕیی بوو, خۆم کردبۆ گاڵتەجاڕ!

لە دوای هەموو ئەوانەوە خەندەیەك هاتە سەر لێوانم. پێکەنینێك بەو دوو سەعاتەی ڕۆیشتوو. ڕازیبوونێك, ڕازیبوون لەوەی کە تەواوی ئەو فکرانەم بێ هەدەر بوونە و دڵخۆش لەوەی کە نەمتوانیوە شووەکەم تاوانبار بکەم!

بە هەمان شادییەوە لەسەر جێی خۆم هەستام و چوومە کن سوگێل, وەك چۆن دەرسەکانی دەنووسینەوە, لە پشتەوەڕا باوەشم لێدا و ماچم کرد, کە بە خۆشحاڵییەوە ڕووی تێکردم و باوەشمان لێك دا و دەستی کرد بە قسەکردن!

– دایە! پەڕی ڕەزامەندیی سینەما بێنم کە ئیمزای لەسەر بکەی؟! دەڵێن فیلمەکە ئەوەندە خۆشە, کە هەر دەبێ پێبکەنی. گوتیان ئەگەر دایکانتان حەز بکەن, دەتوانن بێن! دایە گیان! دێی پێکەوە بچین؟!

***

**((چوارەمین شریتم خستە ناو تەسجیلەكە))**

**شریتی چوارەم**

**شەممە سەعات 10ی بەیانی, ڕێكەوتی... گرتووخانەی ژنان... دۆسییەی ژمارە... ناو ئەفسانە...))**

- دووبارە سەلام, ڕاهاتووم بە هاتن و شریت تێهاویشتننت ها! لەو كاتەوەی كە پێم دەڵێی ئەو كاتە دێم, دەقیقەە دەژمێرم تا دێی!

ـ لێرە بێتاقەت دەبی؟

(بێدەنگی)

- خۆزگە هەر بێاقەت بووبام! بێجگە لە هەموو ئەو باسانەی كە لێرە هەن, كاتێك ئازادیی لە یەكێك زەوت دەكەن, ئەو مرۆڤە شێت دەبێ!

(بێدەنگی)

- فشەیە لێی گەڕێ! ئاوایە ئیدی! چ باسە لە دەرێ؟

ـ هیچ! هەر بەو شێوەیەی كە پێشتر بووە! مەگەر چەند دەبێ لێرەی؟!

- زۆر نییە, وەلێ هەر دەقیقەیەكی بۆ مرۆڤ, بە ڕۆژێك تەواو دەبێ! كۆت و بەندی هەمیشەیی!

(بێدەنگی)

ـ شریتەكە هەر دەڕوا! ناتەوێ باقییەكەی بڵێی؟!

- چێژت لە چیرۆکی ژیانم وەرگرتووە؟!

- دەبێ بیزانم, تا بتوان بەرگریت پێ لێ بکەم! تۆش خۆ ئەسڵەن بابەتەکە باس ناکەی! سا دەبێ چاوەڕێ کەم تا وردەوردە پێی بگەین, ئێستا بڵێ!

(بێدەنگی)

—ئەو بەرنامەیە تا چەند مەانگ بەردەوام بوو. بەیانیان کە لە قوتابخانە بووم و کاتێك کە دەگەڕامەوە ماڵ, هەموو شتێك ئامادە بوو! زۆر نزیك ببوومەوە لە شوکا! وەکو دوو هاوڕێ یان وەك دوو خوشکمان لێ هاتبوو. تا لە قوتابخانە دەهاتمەوە و جلەکانم دەگۆڕین, شوکا دوو فنجان قاوەی تێکردبوو و لەسەر مێزی دانابوون تا من دەهاتم. دووقۆڵی دادەنیشتین و من باسی ئەو ڕۆژە و هاوڕێکان و ڕووداوەکانی قوتابخانەم بۆ دەکرد. یان بۆ نموونە باسی ئەو میوانانەمان دەکرد کە شەوی پێشتر هەمان بوون, یان باسی ئەو شوێنانەی کە بۆ میوانیی بانگهێشتیان کردبووین. زۆر جاریش شوکا باسی ئەو شەیتانیانەی دەکرد کە کردبوونی!

تەقریبەن ببوومە حەڤدە ساڵێك. کچێکی حەڤدە ساڵ بە تەواوی هەستی حەڤدە ساڵییەوە!(تەمەنی هەرزەکاری) دەزانی خۆ کچ لەو تەمەنەدا چ پێویستییەکی هەیە؟ بە دڵنیاییەوە لەو کاتەدا پێویستی بە دایکی هەیە! ئێ خۆ منیش دایکم نەبوو! هەر بۆیە شوکا باشترین کەس بوو بۆ من! بە تایبەتی بەو هەڵس و کەوتەوە! زۆر جدی نەبوو, جوان بیری دەکردەوە! بێ دەرەتان نەدەمایەوە, نهێنی پارێز بوو و قسە لەکن خۆی دەمایەوە.

جێ متمانەی نهێنیەکانی من بوو! باوەڕم پێی هەبوو. دەمزانی ئەو قسەیەی کە پێی دەڵێم لەکن بابم باسی ناکا! چەندین جار تاقیم کردبۆوە و خەیاڵم لێی ئاسودە ببوو.

ئەو ڕۆژەی لە قوتابخانە گەڕامەوە ڕوداوێکم بەسەر هات! کاتێك گەڕامەوە ماڵ زۆر توڕە بووم. خێرا چوومە ژووری خۆم, جلەکانم گۆڕین و نەهاتمە دەر. هەندێکی پێ چوو کە شوکا هاتە بەر دەرگا و لە دەرگای دا و گوتی:

- ئەفسانە؟! نایەی؟!

((جوابم نەدایەوە کە دووبارە لە دەرگای دا و گوتی))

- شتێك بووە؟! لە من توڕەی؟!

– نا! هیچ نییە!

- ئەی بۆچی نایە دەرێ؟!

– ئێستا دێم!

- بووینەتە بێگانە؟! ئیدی متمانەت پێم نییە؟!

((کەمێك دواتر دەرگای ژوورەکەم کردەوە و چوومە دەر و باوەشم پێدا کرد و لەخۆوە دەستم بە گریان کرد کە سەری سوڕ ما و گوتی))

- چی بووە ئەفسانە؟! بۆچی دەگریەی؟!

– هیچ نەبووە!

- حەتمەن شتێك بووە! دەبێ پێم بڵێی!

– نەبەخوای شتێکی گرنگ نییە!

- ئەگەر گرنگ نەبا خۆ نەدەگریای! کێ بێتاقەتی کردووی؟! هیچ بووە لە قوتابخانە؟!

((پێکەوە چوینە چێشتخانە و دانیشتین. دووبارە قاوەی بۆ تێکردم و داینا و گوتی))

- ئێستا بۆم باس کە بزانم چی بووە؟!

(( لەو کاتەدا ئەو باسە زۆر بۆم گرنگ بوو! هەرچەندە کە ئێستا پێکەنینم بەو کاتانە و بەو هەستەی ئەوکات دێ, بەڵام هەرچییەك بێ ئەوکات بۆم گرنگ بوو. کەمێك لە فنجانەکەم خواردەوە و گوتم))

- ئەورۆ کە لە قوتابخانەڕا دەهاتمەوە, لە چوارڕیانێك, چەند گەنجێك ڕاوەستابوون. تانە و تەشەریان لە هەر یەکێك لە هاوڕێکانم دا!

- ئێ؟!

- لە منیشیان دا!

- هەرئەوەندە!؟

- ئاخرئەو شتەی کە گوتیان, زۆر بێتاقەتی کردم!

- مەگەر چییان پێ گوتی؟!

- پێیان گوتم توکن!

(( هەر ئەوەم گوت و شوکا دەستی کرد بە پێکەنین! جا وەرە پێمەکەنە! بۆخۆشم پێکەنین گرتبوومی! چاو لە برۆکانم کە, چەندە پڕن! ئەو کاتەی کە دەستم لێ نەدابوون, وەکو ماوتسڕ[1] وا بوون!

لەبیرمە کە دە دوازدە ساڵ دەبووم, بە دایکم گوت: دایە کەی کچان دەتوانن ئاڕایش بکەن؟! داکم خێرا گوتی: ئەو کاتەی بیانەوێ مێرد بکەن! ئەو قسەیە هەمیشە لە مێشکمدا بوو! داکم لەو بابەتانەدا کەمێك توند بوو! ئەو ڕۆژەش زیاتر لەوە توڕە بووم کە نەك بگا بە کاتی مێرد کردن, لانیکەم تا ئەو کاتەی نەچوومەتە زانکۆ و دیبلۆمم وەرنەگرتووە, تەحەمولی ئەو ڕووخسارە توکنیەم بکەم.

خولاسە کە شوکا پێدەکەنی و فرمێسکی لە چاو دەهاتنە خوار, گوتی))

[1] ماوتسڕ: ئەو پارچەیەیە کە بۆ خاوێن کردنەوەی قوماش و ئەو شتانە بەکار دێت.

ئەو فەقیرانەش ڕاست دەکەن! ئەوەندەی کە ڕووخساری تۆ موو دارە, بابت ئەوەندەی موو لە دەم و چاو نین!

– ئێ منیش دەزانم! زۆریش بێتاقەتم, بەڵام چی بکەم؟!

ـ ئێ کەمێك ڕووخسارت خاوێن کەوە!

((چاوێکم لێ کرد و گوتم))

– ئەی چی جوابی بابم دەمەوە؟!

ـ بابت قسە ناکا!

– یانی چی؟!

ـ پێشتر قسەم لەگەڵ کردووە و ڕازیم کردووە!

– ئەی بۆچی پێت نەگوتووم؟!

ـ بەڵێنم بە بابت دابوو, تا خۆت باس نەکەی من هیچت پێ نەڵێم! بەڵام بابت گوتی: هەر کات خۆی ویستی دەتوانێ کەمێك برۆکانی تەنك بکا و ڕووخساری خاوێن بکاتەوە.

– تخوا بەڕاستیتە شوکا؟!

ـ ئەرێ بە گیانی تۆ!

– خۆ پێم ڕانابوێری؟! چونکە بابم پێشتر...!

ـ ئەوە پێشتر بوو, هەستە تا بابت نەهاتۆتەوە خۆم بۆت چاك بکەم!

(( لەخۆشییان دەرپەڕیم و خۆم خستە باوەشی و ئەوەندە ماچم کرد, تا ڕوومەتی سور ببوونەوە! پێکەوە هەستاین و چووینە ژوورەکەی! سەرەتا کەمێك چاوی لە برۆکانم کرد و دواتر گوتی))

(( تەنیا بۆت خاوێن دەکەمەوە. ئاوا باشن, با تا ماوەیەك ئاوا بن جارێ. ئاوا کەمتر دیار دەبن, تا وردەوردە باریکیان دەکەیەوە!))

- هەر کەمێك لەو حاڵەتە باشتر بم عەیبی نییە !

(( بە لچکێك پرچی بەستم و مووکێشی هەڵگرت و دەستی پێکرد. هەر موویەکی کە لە برۆکانم دەکرد, ئاخ و ئۆفێکم دەکرد و پێدەکەنیم! نیو سەعات دواتر قوتویەکی پودری هێنا لە ڕووخساری دام و بەنێکی تایبەتی هێنا و دەستی پێکرد! وەی بابە چ ئازارێکی هەبوو, بەڵام هەرچییەك بێ بە دڵ و بە گیان تەحەمولم کرد. حەتمەن بۆخۆت لەو حاڵەتەدا بوویی. ئیدی پێوست بە گوتن ناکا ! ))

ـ خۆزگە مەکینەی ڕیش تاشینی بابتم بۆ هێنابای, وەی بابە دەست و پەنجەم بە هیلاك چوون.

- یاڕەبی قوربانت بم شوکا گیان !

ـ خوا نەکا ! هەستە چاوێك لە ئاوێنە بکە بزانە چۆنە ؟ !

(( لە جێی خۆم هەستام و چوومە بەردەم ئاوێنە ! بەڵام کە سەیری خۆمم کرد, خۆم نەناسییەوە ! دەتگوتی کچێکی دیکە بەرامبەری خۆم دەبینم, زەمانەیەکی دیکە, پلەیەك بەرزتر لە خۆم, لە ژیانم, ئەوەندە لە چاوی خۆمەوە جوان ببووم, هەر باسی مەکە. بەڵام ڕانەهاتبووم, شەرمم دەکرد, وەکو ئەوە ڕووت بووبمەوە, لەناکاو کەوتمە بیری ئەوەی, ئەگەر ئێستا بابم بێتەوە, چۆن بچمە پێشی؟ ! ناوچاوانم عەرەقی کرد ! ڕووم لە شوکا کردەوە و گوتم))

- شوکا ؟ ! چ بە بابم بڵێم؟ ! چۆن بێمە پێشی؟ !

ـ سەرەتایە , ڕادێی !

- ئێ تا ڕادێم؟ !

ـ كاتێك هاتەوە برۆ ژوورەكەت. من بۆی باس دەكەم. ئێستا دەم و چاوت بشۆ و لۆكەیەكی بە كۆلۆنیای پێدا بێنە! زووتر برۆ تا زیپكە زۆر دەر نەكا! دوایش كەمێك پودری لێدە.

(( ئەو ڕۆژە كاتێك بابم هاتەوە ماڵ, شوكا بابەتەكەی بۆ باس كرد. پێنج دەقە دە دەقە دواتر سەرەتا شوكا بانگی كردم, دواتر بابم. كاتێك لە ژوورەكە بە شەرمەوە هاتمە دەر, هەردووكیان لەسەر مێزەكە دانیشتبوون. سەلامم كرد و چوم لەسەر كورسییەك دانیشتم. پرچم بەر دابۆوە ناو دەم و چاوم تا كەمتر برۆكانم دیار بن. هەستێكی تایبەتم هەبوو. نەمدەزانی كاردانەوەی بابم چییە. دەستمان كرد بە خواردن, شوكاش ئەوەندە قسەی لە ئەولاو لایانڕا هێنان و بابمی بە قسە هێنا, تا جەوی ماڵەكە ئاسایی بۆوە. لەو نێوەدا چاوانی بابم, كە تا ئەوكاتە سەیریان نەكردبووم, كەوتنە سەر ڕووخسارم! ناوكم كەوت, بەڵام بابم پێكەنینێكی بۆ كردم و بەردەوام بوو لە قسەكردنەكەی! ئاوا بوو كە حاڵی تازەی من, بووبە جدی!

(بێدەنگی)

– لەسەر ئەو بابەتە قسەم لەگەڵ زۆران كردووە! زۆرینەیان ئەو حاڵەیان هەبووە! وەكو من! ئەی تۆ چی خانمی پارێزەر؟! كاتێك بۆ یەكەمین جار برۆت هەڵدانەوە و سەرت بەرز كردەوە, تەمەنت چەند بوو؟! تۆش وەكو من یەكەم جار لەكن بابت ئەوەندە شەرمت كرد؟!

ـ تەقریبەن شتێك لەو بابەتانەی وەك تۆ!

– سەیرە ها! زۆرینەیان وا بوونە!

ـ هەرچییەك بێت, وڵاتێكی كۆنەپەرستییە! ئێ دوای؟!

– لەو ڕۆژەوە بوومە كەسێكی دیكە! كچێكی گەورە, شتێكی نوێ, دەتگوت شتێكی تازەم بەدەستهێناوە! پێكەنیناوییە ها؟!

دەزانی چییە خانمی پارێزەر! هەندێ شت نەوعێکە! بۆ نموونە جگەرە کێشان! خودی جگەرە کێشان شتێکی وا نییە, بەڵام کوڕ جورئەتی ئەوەی نییە لەکن بابی بیکێشێ! دەزانی بۆ؟! چونکە جگەرە قۆناغێکە, قۆناغێکی خراپ! بێجگە لەوەی کە سییەکان خەرا دەکات و سەرەتانی پێوەیە! قۆناغێکە بۆ مەرحەلەی دواتر, وەکو قۆناغی یەکەم! دوایش عەشیش و تریاك و هێرۆین! تا سەرەتاکەی فێر نەبی, ناچی بەدوای ئەوانی دی دا. هەر لەبەر ئەوەشە کە دایك و باب دژی جگەرەن. ئێستا ئەو برۆ کردنەش خودی خۆی هیچی وا نییە, ئەگەر کچەکە وریا بێت! کاتێك وشیار بوو, وابزانە خراپیش نییە, بگرە چاکیشە. وەلێ قوڕ بەسەری ئەوەی کە بەهەڵە تێدەگات و پێی وابێ کە ئیدی برۆی کردوونە و گەورە بووە و هەموو شت لە خەڵکی باشتر دەزانێ! یانی بووەتە زانا و بیرمەند!

بەداخەوە بۆ من وابوو! هەستم دەکرد کە ئیدی دەتوانم ئیشی دیکەش بکەم. هەستی گەورە بوون, حەزم دەکرد وەك ژنان هەڵسوکەوت بکەم. ئیدی بەدوای قۆناغی داهاتووەوە بووم! قۆناغی داهاتووش حەتمەن دەبێ بزانی چییە؟!

سەرەتا هەر لە ماڵەوە بوو, تا ئەو کاتەی بابم نەهاتبۆوە. ڕیملێکی نەرم نەرم, ماسکێکی لەو نەرمتر, ماتیکێك, کە تەنها لێوی دەدرەوشاندمەوە! دوایش هەموویان بە هاتنەوەی بابم دەسڕانەوە.

وردە وردە, لە ڕێی قوتابخانەوە, سەرێکم لە دووکانەکانی ئەشیای ئاڕایش دەدا و سەیری شتەکانم دەکرد, بەڵام سەرەتا ماتیکێکی بریقەدارم کڕی. ماتیکێکی درەوشێنەر! دوایش هەموو شتەکان پێکەوە!

ئەوانەی کە تازە فێرە سیگار بوونە, ئاودەست (تەوالێت) بۆ وان مانا و مەبەستێکی تایبەتی هەیە! جگەرە ئاودەستیان بیر دێنێتەوە, ئاودەستیش جگەرە. چونکە حەتمەن بە ناچاری و بە هێواشی جگەرەیان تێدا کێشاوە! بۆ

منیش گەراجی سەیارە هەمان شت بوو. گەراجی ماڵێ, ئاڕایشی بیر دێنامەوە و سالۆنیش, پارکینگی ماڵێ.

بەیانیان کە دەمویست بچمە قوتابخانە, پێشتر دەچومە گەراجی ماڵێ و بە خێرایی ئاڕایشم دەکرد و دەچومە قوتابخانە. لەبەر دەرگای قوتابخانە, بە کلێنسێك هەمووم خاوێن دەکردەوە و دەچوومە ژوور! کاتێك کە قوتابخانە تەواو دەبوو, خێرا دەچومە ئاودەست و ئاڕایشێکی خێرام دەکرد و بەپەلە دەهاتمە دەر تا کێشکگرەکە نەمبینێ!

دوو سێ مانگ چێژم لەو حاڵەتە وەردەگرت! لە هەستی گەورە بوون! بەڵام دوای ماوەیەك, ئەو هەستە هەموو شتێك نەبوو! هەندێ شتی کەم بوو! شتێکی هەستیار! بڵا هەستیاریش نەبوو! لەوانەشە تاقیکردنەوەیەك بووبێ! تێستێك, ئەزموونێك لە خۆمەوە!

حەزم دەکرد بزانم, تا چ ڕادەیەك بەشم لە کوڕاندا هەیە؟! بە کوردی دەمویست بزانم, چەندە جوان و ناسك و لەبارم و دەتوانم چەند کوڕ هۆگری خۆم بکەم؟!

لەوانەشە چاولێکەریی بووبێت! هەندێ لە هاوڕێکانم, هەر یەکەو دوو سێ کەپڵیان هەبوون و منیش نەمدەویست لەوان کەمتربم!

سەرەتاکەی وەکو یارییەك وا بوو! وەك چۆن لە قوتابخانە دەهاتینە دەر, بۆ نموونە ڕێی کۆلانێکمان دەگرت, کە نزیك بێت لە قوتابخانەی کوڕان. ئێمە زوتر تەواو دەبووین, بەڵام ئەوەندەمان خۆ ماتەڵ دەکرد, تا ئەوانیش لێبنەوە! دوایش دەستی پێ دەکرد! سەرەتا بە تانەو تەشەر, ئێمەش جوابمان دەدانەوە! دوایش هەمووومان پێدەکەنین!

سەرەتا ئاوا بوو, بەڵام دواتر, هەنگاوێك چوومە پێشتر. ئیدی کە کوڕان نزیکك دەبوونەوە ئەوجار, دەستمان بە قسەکردن دەکرد لەگەڵیان! قسەمان دەکرد,

نوکتەمان دەگێڕانەوە, باسی مامۆستاکانمان دەکرد, باسی گۆرانی و سیدیی تازە و ئەو شتانە! ئەوانەش ماوەیەك سەریان گەرم دەکردم, تا ئەوەبوو ڕۆژێك یەكێك لەو کوڕانە, کاتێك لەگەڵ هاوڕێیەکم گەیشتبوینە سەری کۆڵان, گوتی کە دەیەوێ بەتەنێ قسەم لەگەڵ بکات. سەرەتا حەزم دەکرد بڵێم نا, بەڵام لەبەرئەوەی پێشتر حەزم لەوە بوو, دڵم نەشکاند. هاوڕێکانم لە پێشەوە ڕۆیشتن و ئێمەش لە پشتیانەوە دەهاتین. کوڕێکی هاوتەمەنی خۆم بوو. ناوی پاشا بوو. لەو کابۆ ئەستور و فەڕاحانەی دەبەر بوو, لەگەڵ ئەو کالانەی کە تازە مۆدیان بوو. لەگەڵ بلوزێکی تەسك و کورت. جڵی لە سەری دابوو, لە تەواوی هاوڕێکانی دیکەی قۆزتر بوو. حەزیشم پێ دەهات.

دەستمان بە ڕۆیشتن کردن, کە پاکەتێك جگەرەی لە باخەڵی دەرهێنا و جگەرەیەکی پێکرد و دەستی کرد بە کێشانی! ڕاستییەکەت دەوێ, لەو کاتەش پێکەنینم بەوە دەهات, کە کوڕێك لەو تەمەنەدا سیگار بکێشێ, بەڵام وەك چۆن بۆ ئێمە ئاڕایشکردن هەستێکی گەورەی پێ دەداین, بۆ کوڕانیش ڕیش تاشین و جگەرە کێشان, هەستێکی پیاوانەی دروست دەکرد!

خولاسە بە بیچمێکی تایبەتەوە, مژێکی لە سیگارەکەی دا و گوتی:

- حەزت بە ((مۆتالیکا))[1] دێ؟

- زۆر!

- کەواتا لەو کچە کۆنەپەرستانە نی کە دایك و بابیان لە سەر و گوێلاکیان دەدەن و دە ماڵێیان دەکەنەوە! چەندە ئازادی؟!

[1] مۆتالیکا: کە بە عەرەبی ((متالیکا)) و بە ئینگلیزی ((Metallica)) یە. باندێکی مۆسیقای ڕۆکی ئەمریکییە لە کالیفۆڕنیا. لە سەرتاسەری دنیا هاندەرێکی زۆریان هەیە. خەڵکی ئێرانیش وەك وڵاتانی دیکە جەماوەریەتی. بەڵام تا ڕاددەیەك ئەو جۆرە مۆسیقایە لە ئێراندا قەدەغە بوو. وەك چۆن هەموو قەدەغەکراوێکیش مەرغوبە.. وەرگێڕ.

- تا ڕادەیەك!

ـ یانی دەتوانی ببێیە سینەما؟!

- ئەگەر حەزم لێی بێت!

ـ ناوم پاشایە, ئەی تۆ؟!

- دواتر پێت دەڵێم!

ـ دەترسی ئێستا پێم بڵێی؟!

- نا بۆچی بترسم؟ حەزم لێ نییە بیڵێم!

ـ حەز دەکەی ببیە خۆشەویستم؟!

- تۆ چی؟ حەز دەکەی؟!

ـ ئەگەر حەزم لێ نەبا نەدەهاتم قسەت دەگەڵ بکەم! بەڵام لە ئێستاوە پێت بڵێم! من مرۆڤێکی توڕە و غەمبارم! هیچ شتێك لە دنیادا من خۆشحاڵ ناکا! توڕەش بم, دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەم! ئەگەر دەتەوێ لەگەڵ من بی, دەبێ تەنها من بم! ئەگەر چاو لە یەك کوڕی دیکە بکەی, دەتکوژم. قبوڵە؟!

(پێکەنین)

(( ئێستا قسەکانیم دێنەوە یاد و پێکەنینم دێ. چەند منداڵانە! بۆ نموونە وای بیر دەکردەوە ئەگەر کوڕێکی توڕە و غەمبار بێ, ئیدی زۆر مەزاجی و هەستیارە! بەڵام ڕاستییەکەی لەو کاتەدا چێژم وەرگرت! هەر بۆیە کەمێك بیرم کردەوە, دواتر گوتم))

- باشە قبوڵە, بەڵام ئەگەر تۆش سەیری کچێك بکەی, سەرەتا چاوت دەردێنم, دوای دەچم خۆم دەکوژم!

ـ ئێستا دێی بچینە کافتریا؟!

- ئێستا؟!

ـ بەڵێ! بۆ مەگەر چی تێدا؟!

– چاوەڕێکە!

(( بانگی هاوڕێیەکم کرد و شتەکەم بۆ باس کرد و پێم گوت, ئەگەر شوکا تەلەفونی کرد, بڵێت کە من ڕۆیشتوومە ماڵی هاوڕێیەکم نامیلکەی لێ وەرگرم. دوایش چوومەوە کن پاشا و گوتم))

– با بڕۆین!

(( پێکەوە بە پێ ڕۆیشتین و لەو نزیکانە, کافتریایەکی لێ بوو. ئێمەش چوین و دانیشتین. دوو قاوە بە مۆتەوەمان داوا کرد. ئیدی هەستم بە خۆم دەکرد کە چەند گەورە بووم! چاوەڕێکە!

کاتێك قاوەکانیان بۆ هێناین پاشا گوتی))

ـ بڕیارە بابم سەیارەم بۆ بکڕێ!

– بەڕاستە؟ کەی؟!

ـ کاتێك مۆڵەتی شۆفێریم وەرگرت!

– ئێ وەڵا نایابە.

ـ ((ID))ت چییە؟! دێیە چات؟!

– نا, یانی بەڵێ, وەلێ ئێستا کۆمپیتەرەکەم خەرابووە!

ـ ئێ باشە جارێ ((ID))تم بدەیە, تا کۆمپیتەرەکەت چاك دەکەیەوە.

((بیرێکم کردەوە و دواتر گوتم))

– ئەفسانە!

ـ کەواتا ناوت ئەفسانەیە!

– نا, یانی ((ID))م ئەوەیە!

ـ کەی چاکی دەکەیەوە؟!

- یەك دوو ڕۆژی دی!

ـ ئێمە لەگەڵ هاوڕێیانمان هەموو ((چاتەر))ین, تۆش وەرە چات بکە.

(( پێکەوە دەستمان کرد بە پێکەنین و گوتم))

- با کۆمپیتەرەکەم چاکەمەوە, ئەوجار!

ـ ئەو سەیارە نوێیانەت دیون؟!

- نا! چین؟!

ـ ((BMW))! زۆر نایابن! هەر هەموویان! بابم دەیەوێ لەوان بکڕێ!

- ئەوکات دانەیەکیش بۆ تۆ دەکڕێ؟!

ـ لەوان نا, شتێکی دیکە بۆ من دەکڕێ. ئێوە لە قوتابخانە بە مامۆستاکانتان ڕانابوێرن؟!

- چۆن چۆنی؟!

ـ ئەوڕۆ شتێکم کردووە, مامۆستاکەمان کەفی دەپرژاند! لە ناو پۆلدا لاسای پشیلەم دەکردەوە! هەر ئاوڕی دەدایەوە هاوڕێکانم دەیانگوت مامۆستا لە دەرەوەیە! جارێکیش ((تەقاندم)) لە خەفەتان. حاسیبەکەی لەسەر مێزەکە دانابوو منیش شاردمەوە! سەعاتێك بوو بەدوایدا دەگەڕا.

(( پێکەوە دەستمان کرد بە پێکەنین! لەمەڕ ئەو شتانە دەدوا و منیش دەمردم بە پێکەنین. ئەو شتانەی کە ئێستا لەکنم پڕوپوچن, ئەوکات زۆر بۆم بەنرخ بوون! خولاسە وەك چۆن قسەمان دەکرد, قاوەکانیشمان دەخواردەوە و پاشا داوای تەسفیە حسابی کرد, کاتێك ساحێبی کافتریاکە تەسفیە حسابەکەی هێنا, پاشا جزدانەکەی دەرهێنا, بەڵام پارەی بەپێی پێویست پێ نەبوو!

لەناکاو توڕە بوو و گوتی))

ـ ئەی دایك...!

- چی بووە پاشا؟

ـ خوشکی بابم...! پارەی لە جزدانەکەم دەرهێناوە! یەك دەقیقە جزدانم لەسەر مێز دانا, بەتاڵی کردووە! با بزانم...

- چەندت کەمە؟!

ـ سێسەد تمەن.

- وەرە من پێمە!

(( سێسەد تمەنم لە جانتاکەم دەرهێنا و وێمدا و حسابەکەی دا, هاتینە دەرێ و تا نزیك ماڵ هات و ماڵئاواییمان لە یەکدی کرد و ئەو ڕۆیشت و منیش چوومەوە ماڵ. تەقریبەن سەعات چوار بوو. تا گەیشتمەوە و سەلامم کرد, شوکا گوتی))

ـ لە کوێ بوی؟!

- چووبووم نامیلکەیەك لە هاوڕێیەکم وەرگرم.

(( کەمێك شڵەژابووم! شوکا چاوێکی لێ کردم, پێکەنی و گوتی))

ـ مرۆڤ کاتێك درۆ لە هاوڕێکەی دەبیستێ, زۆر دڵتەنگ دەبێ! وەرە قاوەیەکت بۆ تێکەم!

(( شەرمم لێی کرد. چووم جلەکانم گۆڕی و هاتمەوە, کاتێك پێکەوە لەسەر مێز دانیشتین, پێم گوت))

- شوکا گیان! نازانم چۆن بوو درۆم لەگەڵ کردی! ڕاستییەکەی چووبوومە کافتریا! ((پێکەنی و گوتی))

ـ لەگەڵ کوڕێك؟!

(( سەرەڕای ئەوەش بینیم تورە نەبوو, دەتگوت پێشی خۆشە! هەر بۆیە بابەتەکەم بۆ باس کرد. کاتێك قسەکانم تەواو بوون, تەواو پێکەنی و گوتی))

ـ یەکەم کەپلتە؟

- بەڵێ!

ـ بەڕاستیتە؟!

– ئەرێ وەڵڵا!

ـ کەواتا ئاگات لەخۆ بێ! جارێ ئەوە چەترەکەی بەرەو ڕوو کردوویەوە, سێسەد تمەنی لێ وەرگرتووی! دەبێ ئەو کوڕانە بدۆشی! کەپلێیان دەوێ؟! کەواتا دەبێ خەرجیشی هەڵگرن!((ماڵان خوێشیان دەوێ)) لەمەبەدوا لەبیرت بێ کە ناهێڵی بتدۆشن! هەرچییەك بێ ئێستا کەمێك زوویە, وەلێ دەبێ فێر ببی! ئەوە یەکەم! دووەمیش ئەوەیە کە هەموو کات بیانبە سەر کانی, بەڵام هەموو کات بە تینوویی بیانهێنەوە! پیاوان کاتێك تێر ئاو کران, لە مرۆڤ بێزار دەبن! دەبێ هەندێ مەکر و ناز فێر بی!

– وەڵڵا هیچی لێ نازانم!

ـ مەترسە, مامۆستا لە تەنیشتت دانیشتووە!

(( دوایش دەستی کرد بە پێکەنین! ڕاستی دەگوت! بەڕاستی لەو کارانەدا مامۆستا بوو! هەر ئەو کات دەرسە سەرەتاییەکانی فێر کردم! چۆن بە هەڵسوکەوت و سەر و دەم و چاوم, سەرنجی بەرانبەر ڕاکێشم! چۆن بە ڕێدا بڕۆم, چۆن پێبکەنم, دە دانە لەو ((چۆن))انەی دی, کە هەموو ڕۆژ فێری دەکردم!

ڕێك لە ماوەی یەك هەفتەدا وا گۆڕا بووم, کە بۆخۆم باوەڕم بە خۆم نەدەکرد! لەوانەیە ئەو کاتە بووبێ کە دید و بۆچوونم لەمەڕ ژیاندا فەرقی کرد! ئیدی تەنها داهاتووم نەدەبینی, ‌بارودۆخی ئەوکاتەم بۆ گرنگ بوو! شوکا لەگەڵ مەکر و نازەکانی, فکرەکانیشی تێکەڵ بە هزرم دەکرد! دواتر تێگەیشتم, یانی کاتێك بە هۆش خۆم هاتمەوە, کە لە بەرانبەر هەستی سۆزداری و گەنجی و ڕۆمانتیك دا,

هەستێکی تۆڵە لە دەرونم دا دروست ببوو. ئەوە هەمان ئەو هەستە بوو, کە شوکا وردە وردە و کەم کەم لەمندا چەسپاندی!

دوای ماوەیەکی زۆر, ئەوجا تێگەیشتم, کە هۆکارەکەی چی بووە؟! بڵا حەقیشی بووبێ! لەوانەیە ئەگەر منیش لە جێگەی ئەو بام, هەر وا دەبووم!

شوکا نەزۆك بووە, هەر بۆیە شوەکەی تەڵاقی دەدا. هیچیشی پێ نادا! دوای چەند ساڵ ژیان, چەندەش هاوسەرەکەی خۆشویستووە! بەڵام هەموو ئەو خۆشەویستییە دەگۆڕێ بۆ نەفرەت و کینە و تۆڵە, بەڵام تۆڵەیەکی بێدەنگ! شتێك کە لە منیشی دا دروست کردبوو! زانیاری و ئامۆژگارییە سەرەتاییەکانم, تەقریبەن لە ماوەی دوو هەفتەدا جێبەجێ کردن!

بۆ نموونە بە پاشام دەگوت سەعات 6 وەرە فڵان پارکە و بۆخۆم نەدەچووم. ڕۆژی لە دایکبوونم پێشتر پێ دەگوت و دیاری بۆ دەکڕیم. شوکا تەلەفونی بۆ قوتابخانە دەکرد کە بۆ نموونە بۆ نیوەڕۆ بێمەوە ماڵێ و منیش لەگەڵ پاشا ژوانمان دادەنا کە بچینە چێشتخانەیەك و ئەو بۆم خەرج بکات. یان بۆ ئێوارێ, بە ناوی سەعی کردن لە ماڵی هاوڕێیەکم, دەمبردە بازاڕ و بە کەیفی خۆم شتم پێ دەکڕی و ئەوەندە نازم لەسەر دەکرد, کە وەکو هەویر لە دەستمدا بوو و شتی بۆ دەکڕیم. ئەسڵەن هەستم گۆڕابوو. ببوومە چەتربازێك.

کۆتا کار کە لەگەڵم کرد, قەت لەبیرم ناچێ! چووم لەگەڵ هاوڕێکەی کە لە پاشا دەوڵەمەندتر بوو, بووینە خۆشەویست و تێکم بەردان! لەسەر من شەڕێکیان کرد لەسەر جادە کە هەر باسی مەکە! هەر ڕێك لەپێش من! هەروەها منیش چێژم لێی وەردەگرت! وەکو نەخۆشە شێتەکان!

لەمەبەدوا, ئیدی ژیانم گۆڕا! بە یارمەتیی شوکا, دەمتوانی زۆر کار هەن بیانکەم و بابم نەزانێ! شوکا هەموویانی پەردەپۆش دەکردن!

(بێدەنگی)

ـ چەندەمین شریتە ؟

– چوارەم !

ـ کەواتا بۆ ئەو دانیشتنە بەسە !

(بێدەنگی)

( دەنگی دوگمەی تەسجیل)

(( لەبیرمە ئەو ڕۆژە تەسجیلەکەم کوژاندەوە, وەلێ هەر لەوێ لەکن ئەفسانە دانیشتم کە گوتی))

ـ ناتەوێ بڕۆی؟

– با, بەڵام هێشتا کاتم هەیە. سەیرکە ئەفسانە ! بۆچی چووی لەگەڵ برادەری پاشا بوویە هاوڕێ؟

ـ دەمویست چەند شتێکم بەیەکەوە هەبن! سودم لە هەردووکیان دەدی! ڕۆژێك ئەم بۆی خەرج دەکردم و ڕۆژێك ئەو!

– تەنها بۆ پارە ؟ !

ـ نا, هەستێکی دیکەم هەبوو!

– ئەگەر ئەوان, ئاوایان لەگەڵ تۆ کردبا, ئەوکات چ هەستێکت دەبوو؟ !

(( بیرێکی کردەوە و گوتی))

ـ دووبارە جیاوازیی نەبوو, من ئیشی خۆم دەکرد !

– یانی چی؟ !

ـ گوێگرە خانمی پارێزەر! ئەوانیش ئەگەر بیانتوانیبا, ئەو کارەیان دەکرد ! یانی ئەگەر کچێکی دیکە ڕێگەی پێ دابان, دەبوونە خۆشەویستیان! منیش هەمان کارم دەگەڵ کردن !

- تۆڵەت سەندەوە پێش ئەوەی تاوان بکرێ!

- ئەگەر پیاوێك خیانەتی لە ژنەکەی کرد, دەبێ ئەویش بیکا! ((جوابی تەحە, پەحەیە)) ئەگەر وا نەکەی, دۆڕاوی! بۆ نموونە تۆ! ئەگەر زانیت شوەکەت خیانەتت لێدەکا, چت پێ دەکرێ؟! زۆر زۆرەکەی دەچی شکایەتی لێ دەکەی! ئاخیرەکەی تەڵاق وەردەگری! خۆ مێردەکەشت لە خوایەکی دەوێ ئاوابێ! کەواتا چ سودێکی بۆ تۆ هەیە؟! ها؟!

- تۆ لەسەر ئەو فکرانەیە ئێستا لێرەی ئیدی!

- نا! بوونی من لێرە پەیوەندییەکی بەوەوە نییە!

- کەواتا چی؟!

- تۆسەرەتا جوابی من بدەوە تا پێت بڵێم! دوای تەمەنێك لە ژیان و منداڵبوون, ئاخیرەکەی تەڵاق دەدرێی, ئەی تۆڵە چی؟!

- ئەی دەبێ چبکەی؟!

- وەکو ئەو! ڕێك وەك ئەو!((داش بە داش)) ئەگەر شوەکەت چووە لەگەڵ یەکێکی دی تێکەڵ بووە, تۆش بیکە! ئەو دەیەوێ چەند شتان تاقیکاتەوە, تۆش وا بکە, تا کوڵاوی لەسەر نەناوی! تەنیا ڕێگەی ئەمەیە!

- فکرەت زۆر خەتەرە!

- وەلێ ڕاستە!

- نا!ئەگەر ڕاست با, خۆ لێرە نەدەبوی!

(( پێم پێکەنی و گوتی))

- بڕۆ بیری لێبکەوە, بۆخۆت تێدەگەی!

- ئاخر مەگەر تۆ چەندەت ئەزموون هەیە؟! مەگەر تۆ تەمەنت چەندە کە ئاوا بە ڕاشکاویی قسە دەکەی و فتوا دەدەی؟!

ـ خۆ تەنيا بە تەمەن نييە! ئەزموون گرنگە! لە بيرمە كە ئەو كاتەی پاشا دەچوو پارەی لە بابى وەردەگرت, لە دايكيشى وەردەگرت, لە هاورێكانيشى قەرز دەكرد, لە سوپەرماركێتى سەرى كۆڵانەكەشيان قەرزى دەكرد, تا منى پىێ بباتە دەرىێ! يانى بەو هەموو زەحمەتە پارەی پەيدا دەكرد, كە بتوانىێ سەعاتێك لەگەڵ من بىێ و لانيكەم بتوانىێ لە سەر جادە دەستى بخاتە ناو دەستم! بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوانەش دا, كاتێك پێكەوە لەسەر مێزێك دادەنيشتين لە كافتريا دا, خەريك بوو پێى دەگوتم كە چەندەی خۆش دەوێم ناتوانىێ بىێ من بژى, هەر چاوى لە ئەولا و لا بوو كە چاوى بە كچێك بكەوىێ و بتوانىێ يەكى دى بۆخۆى ڕازى بكات! لەسەر جادە لە تەنيشت منەوە دەڕۆيشت ها! بەڵام بۆخۆم ديتم كە كچێك بەرانبەرمان دەهات, چاوى لىێ داگرت! قوڕى بە سەرى كە هيچ نەبىێ چاوەكەی داگرتبا تا من نەيبينم! بەڵام من هەر بەسەر خۆشم نەهێنا! ((نەمدەزانى نە باى دىێ نە باران)) لە بەرانبەردا خۆم گێل كرد! جا بزانە چەند ساڵيش بوو؟! حەڤدە ساڵ! جا حساب بكە, پياوێكى سى ساڵە دەبىێ چ گيانەوەرێك بىێ؟!

– هەموو وەكويەك نين!

ـ خوابكا وابىێ! بۆ من كە وا بوون! ئەوەی ديكەشت دوايى بۆ باس دەكەم! ئێستا ئيدى كات تەواوە! دووشەممە دێى؟

– ئا. هيچت دەوىێ بۆت بێنم؟ بێجگە لە سيگار؟!

ـ جگەرە لێرە هەيە! خەياڵت ئاسودە بىێ! كەمێك گرانە!

– يانى چى!

ـ يانى ئەزموونێكە ئيدى!

– چوكلێتت بۆبێنم؟!

ـ دەستت خۆشبىێ!

(( شتەکانم کۆکردەوە و ماڵئاوایم لێ کرد و لە گرتووخانە هاتمە دەر. کاریکی چکۆڵەم لە شەریکەیەك هەبوو و دواتریش دەبوو سەر لە کەسێکی دی بدەم لە یەکێ لە شەریکەکان.

تەقریبەن سەعات دوو بوو کە گەیشتمەوە ماڵێ و دیتم سوگێلیش لە پاسی منداڵان دابەزی و پێکەوە چوینە ژوورێ. خێرا چووم قابلەمەی خواردنم لە سەلاجە دەرهێنا, تا سوگێل چوو جلەکانی بگۆڕێ شێوەکەم گەرم کردەوە و بۆم لە قاپێك کرد و خەریکی ئیش و کارەکانی دیکە بووم.

هۆڵەکەم کەمێ هەڵوێژارد و چووم جلەکان بخەمە ناو جلشۆر. چەند کراسێك و هەندێ پارچەی سوگێل و کابۆی بێهروز بوون. جلە ڕەنگاو ڕەنگەکانم جوێ کردنەوە و کابۆی بێهروزم هەڵگرت کە بە جیا بیخەمە ناو غەسالە. وەك چۆن دەستم لە گیرفانەکانی ڕا دەکرد بۆ ئەوەی بزانم کە پارە و شتی وای تێدا نییە, لەناکاو دەستم بەر پارچە کاغەزێك کەوت. خێرا دەرمهێنا! وەرەقەی کاغەزێك, کە قەد کرابوو. کردمەوە و بینیم کە ژمارە تەلەفونێکی لێ نووسراوە! شمارەی بەرزایی شار بوو! ...242! هەرچەند بیرم کردەوە نەمزانی ئەوە چ شمارەیەکە؟ فەرمانگە و شەریکەی بێهروز تەقریبەن لە ناوەڕاستی شار بوون! کەسێکیشمان نەبوو کە ژمارەیەکی ئاوای پێ بێ!

خێرا چوومە سەر دەفتەر تەلەفون و دانە دانە ژمارەکانم تاقیکردنەوە! هیچیان نەبوو! دەبوو چی بکەم؟! دیسان گوماناوی ببوومەوە! وەکو بخۆر, مێشکی دەخواردم! تەلەفونەکەم هەڵگرت و چوومە ژووری نووستن دەرگام داخست و شمارەکەم لێدا! دوو جار ڕۆیشت و دەنگی کچێکی گەنج هات))

ـ بەڵێ؟!

((هەڵوەستەیەکم کرد و گوتم))

- سڵاو!

ـ سڵاو گیانەکەم, فەرموون!

- ببورن لە کاتتان دەگرم! ڕاستییەکەی ژمارەی ئێوەم لە ناو کاغەزەکانم دا دیتەوە و بەداخەوە هیچم لە تەنیشت نەنووسیوە! دەمویست بزانم ئەوە شمارەی کێیە؟!

ـ نا ئاساییە! ئێرە بنکەی مەسکینە...!

- بنکەی مەسکین؟!

ـ لەو ماوەیەدا بەدوای باڵەخانەوە نەبوون؟

(( دیسان هەڵوەستەیەکی دیم کرد و گوتم))

- با! با! ببورن دەتوانن ناونیشانەکەتانم پێ بڵێن؟!

ـ بە دڵنیاییەوە! وەلەنجەك ... بنکەی مەسکین...!

- بەڵێ بەڵێ! تەواوە! ماوەیەك لەمەوبەر سەردانمان کردن!

ـ دەتوانم ناوتان بپرسم؟ حەتمەن فایلتان لێرە هەیە! لە بارەی چی بووە؟

(( گوتم خێزانی بێهروز کە خێرا گوتی))

ـ خانم...؟! ئێوە دوو هەفتە لەمەوبەر لێرە بوون خۆ!

(( دەتگوت لە کارەبایان داوم, بەڵام هەر چۆنێك بێ خۆم کۆنترۆل! کرد و گوتم))

- باوەڕ دەکەن ئەو ماوەیە گێژ و وڕ بووم؟!

ـ حەتمەن بنکەکان زۆرتان بێزار دەکەن!

- نا! بەڵام هەرچی چۆن بێ کەمێك کێشەیە ئیدی!

ـ بەهەرحاڵ, ئێستا یاریدەدەرەکەم لێرە نییە بزانم ئایا هیچی بۆ پەیدا کردوون یان نا! نیو سەعاتی دی پەیوەندیمان پێوە بکەنەوە, ئەو دەگەڕێتەوە!

- باشه باشه! حەتمەن پەیوەندیتان پێوە دەکەم! زۆر سوپاس بۆ هاوکاریتان. ئەزیەتم دان.

(( تەلەفونەکەم داخستەوە و وەك چۆن دانیشتبووم! هۆشم لەخۆم نەمابوو! وڕ ببوم! دەنگی ئەفسانە لە گوێمدا دەزرینگایەوە! هەموو ئەو ڕستانەی کە گوتبوونی! ئاخر بۆ خوایە گیان! مەگەر ژنێکی خراپ بووم بۆی؟! ئاخر چ شتێکی لە من دیوە کە ئەو کارەی کردووە! پێی ڕانەدەگەیشتم؟ با! ڕێزم لێ نەدەگرت؟! کەمی هەبووە؟! پیر و ناشیرن بووم؟! ژنێکی خراپ بوومە بۆی؟! دایکێکی خراپ بوومە بۆ منداڵەکەی؟! کەواتا بۆچی؟!

ئەسڵەن لە حاڵی خۆم نەدەگەیشتم! خەریك بوو شێت دەبووم! دیتم ئەگەر کەمێکی دیکە لەوێ بمێنمەوە, جندار دەبم! خێرا هەستام و چوومە چێشتخانە کە سوگێل خواردنەکەی تەواو کردبوو, گوتم بچێ سەیری تەلەڤزوێن بکا. پێم گوت دەمەوێ بچمە قاتی سەرێ, کن جیرانەکەمان. دواتر کلیلەکەم هەڵگرت و لەماڵ چوومە دەر و چوومە قاتی سەرێ و لەدەرگام دا.

نەجوا جیرانمان بوو. تەقریبەن هاوتەمەنی خۆم بوو. ئەویش کچێکی هەبوو. کەمێك دواتر دەرگای کردەوە و گوتی:

- سەلام چۆنی؟! وای! چی بووە تەرانە؟!

- عەلیڕەزا لە ماڵە؟!

- نا! وەرە ژوور! چ بووە؟!

- هیچ نییە! کەمێك حاڵم خەراپە!

- لەگەڵ بێهروز دمەقاڵەتان بووە؟!

- شتێك لەو بابەتانە!

- وەرە ژوور!

(( پێكەوە چووینە ژوور. كچەكەی لە ژوورەكەی خەریكی سەعی كردن بوو. ئێمەش چوینە چێشتخلنە, چایەكی بۆ تێكردم و لە تەنیشتم دانیشت و گوتی))

ـ بخۆوە ئارام ببیەوە ! پەرداخێك ئاوت بۆ بێنم؟ !

– نا ! جگەرەتان هەیە ؟ !

ـ جگەرە ؟ !

– بەڵێ ! هەتانە ؟ !

(( واق وڕماو, هەستا و لە سەلاجە پاكەتێك سیگاری دەرهێنا و وێی دام. لێم وەرگرت و خێرا سیگارێكم لێ دەرهێنا و شەمچەم لێ وەرگرت و پێم كرد, مژێكم لێ دا و كەوتمە كۆخە كۆخ ! خێرا هات دەستی لە پشتی دام و ویستی جگەرەكەم لێ وەربگرێ, بەڵام وێم نەدا. هەندێ كۆخیم و دواتر چاك بووم گوتی))

ـ ئەوە چ كارێكە ئاخر؟ ! خۆ تۆ جگەرە ناكێشی !

– هەست دەكەم ئێستا ئارامم دەكاتەوە !

ـ با پەرداخێك ئاوت بۆ بێنم ! جگەرە چییە ئاخر؟ !

– نا ! هەر ئەوە باشە !

– گوڵگاوەزوانت[1] بۆ دێم كەم ؟ !

ـ نا ! دانیشە !

– ئاخر چی بووە ؟ ! بێهروز لە ماڵە ؟ !

ـ نا سوگێل تەنهایە !

– شەڕتان بووە ؟ !

ـ بێڵە كەمێك دانیشم دواتر پێت دەڵێم !

[1] گوڵگاوەزوان: بۆنێكە وەكو چا لێ دەنرێ و بۆئارام كردنەوە باشە.

- بچم سوگێل بێنمه سەریَ؟!

ـ نا! نامەویَ لەو حاڵەتەدا بمبینیَ!

- ئیَ دە بڵیَ بزانم چ بووە؟! شێتت کردم!

(( چەندە ئاوا مامەوە و دوو سیَ مژم لە جگەرە دا کە نەجوا گوتی))

- ئەریَ ئاخیرەکەی دەڵێی چی بووە یان نا؟؟!

(( جگەرەکەم کوژاندەوە و کەمێکم لە چایەکە خواردەوە و بە ئارامی گوتم))

ـ خۆشم هێشتا نازانم چی بووە! یانی بەڕاستی نازانم خەریکە چیم بەسەر دیَ!

- یانی چی؟!

ـ نازانم! نازانم! وەڵڵا بۆخۆشم گێژ بووم!

- زۆر باشە! ئارامبە! تەنها لە سەرەتاوە بۆم باسکە تا منیش تێبگەم.

(( دووبارە کەمێکم لە –چا–کە خواردەوە, کە نەجوا هەستا و پەرداخێك ئاوی بۆ هێنام و دانیشت و دووبارە چاوێکم لیَ کرد و گوتم))

ـ بێهروز هەندیَ کار دەکا!

- چ کارێك!

ـ هێشتا خۆشم نازانم! پێم وابیَ پەیوەندیی لەگەڵ یەکێکی دیکەدا هەیە!

(( چاوێکی لیَ کردم! شەرم دایگرتم! شەرم لە خۆم! حەتمەن وا بیری کردۆتەوە کاتێك پیاوێك کارێکی وا دەکا, دەردەکە دەبیَ لە ژنەکە بیَ! حەتمەن ژنەکەی کەموکورتیی هەیە کە نەیتوانیوە شوەکەی ڕاگریَ))

- لە کوێوە وا تێگەیشتووی؟!

ـ ماوەیەك لەمەوبەر گومانم لێی کرد! سەرەتا وامزانی لەخۆوە گومانی خراپیَ لیَ دەکەم, بەڵام دەڵێی هەڵە نەبووم.

- یانی چۆن؟!

(( تەواوی بابەتەکەم بۆ باس کرد! بە باشی گوێی گرت و دواتر لەسەر جێگەی خۆی هەستا و بەبێ ئەوەی هیچ بڵێ, چۆ سەر گاز و قاوەی دروست کرد و دە دەقیقە دواتر بە دوو فنجان گەڕایەوە و لە تەنیشتم دانیشت و جگەرەیەکی لە پاکەتەکە دەرهێنا و پێی کرد. زۆر ناڕەحەت ببوو! پێم گوت))

- ئێستا تۆ دەڵێی چی؟! یانی وا بیر دەکەیەوە کە ڕاست فکرم کردبێ؟!

– نازانم چی بڵێم تەرانە! بەڵام ئەوەی کە لەسەرمە پێت دەڵێم!

- چییە؟!

– چەند ڕۆژ لەمەوبەر لەگەڵ عەلیڕەزا خەریك بوو دەچوین بۆ بازاڕی ((تەجریش)). هێندەمان نەمابوو بگەینە سەری پارکی ((وێی)), کە لەناکاو سەیارەیەك وەك سەیارەی ئێوە بە تەنیشتماندا ڕۆیشت! من لەخۆڕا چاوم کەوتە سەری! بێهروزم لابەلا دیت! بەو عەلیڕەزا حەرام زادەیەم گوت خێرا برۆ! گوتی هەڵە دیوتە! ئەویش نازانم نە ئێمەی دیت نە نا! پێی لە گاز نا و بە خێرایی ڕۆیشت! تەنها کە لە پشتەوە سەیرم کرد, ئافرەتێکی لە تەنیشت دانیشتبوو!

- چ ڕۆژێك بوو؟! کەواتا پێرێ دەڵێی کە هاتییە پێش ماڵێ؟!

– بەڵێ! هەر بۆئەوەش بوو بە عەلیڕەزای خوێڕیم گوت توند بڕوا, چونکە دەمزانی لە ماڵێی! بێهروزیش کە چووبۆ فەرمانگە!

- ئەی بۆچی پێت نەگوتم؟!

– چت پێ بڵێم؟! خۆ بە تەواوی نەمدیتبوو! بێڵە ئەو عەلیڕەزایە بێتەوە, دەزانم چی پێ دەکەم! بە تایبەت کە بەدوای نەکەوت! ئەو پیاوانە یەکتر نابینن خۆ!

- جارێ هیچی پێ مەڵێ! بڵێ بزانم لەکوێ دیتتن؟!

– لەسەرەوەی پارکە ((وێی))!

ـ تەقریبەن هەر لەوێیە کە بنکەکە ناونیشانەکەی پێ دام! وەلەنجەك هەر ئەوێیە ئیدی!

– بێ شەرەفانەی هیچ و پوچانە! هەموویان جاشکی ماکەرێکن! خودی ئەو عەلیڕەزایە لە هەمووان خراپترە! بەڵام من نایەڵم ببێتە دوو! وۆرت ڕوو داوەتێ! هار بووە!

ـ چی بکەم نەجوا؟! بە گیانی سوگێل ئیدی مێشکم کار ناکا! ئەسڵەن نازانم خەریکە چی ڕوو دەدا!

– خۆت مەدۆڕێنە! ئەو بێقیمەتە شیاوی تۆ نییە! ئەوانە ژنی بەڕێز و نەجیبزادەیان بۆ نابێ! هەر ئەو...انەی لەسەر جادەن, شایستەیانن!

(( جگەرەیەکی دیکەم پێ کرد و تا دەستم کرد بە کێشانی, دەستم بە کۆخە کرد!))

– مەکێشە تخوا! بۆچی زەرەر بە خۆت دەگەیەنی؟!

ـ ئێستا دەبێ! چی بکەم؟!

– چاولێکە تەرانە! سەرەتا دەبێ دڵنیا ببی!

ـ چۆن چۆنی؟!

– دەبێ چاودێریی بکەی!

ـ چۆن بزانم بۆ کوێ دەچێ؟!

– ئاسانە! دوو سێ ڕۆژ دەبێ هیممەت بکەی!

ـ کارم چی دەبێ؟! چی لە سوگێل بکەم؟!

– یەکەم ئەوە سوگێل بۆ من لێگەرێ, خەیاڵت ئاسوودە بێت! دووەمیش, پێویست ناکا خۆت بەدوای دا بچی! پۆستەچییەك! لەو ماتۆڕە پۆستەچییانە! دوو سێ ڕۆژ بە کرێی بگرە! دەبێ کەمێك سەرف بکەی! چارە نییە!

- ئێستا ئەگەر ڕاست دەرچوو چی؟! بچم داوای تەڵاق بکەم؟!
- مارەییت چەندە؟!
- دووسەد سککە!
- خوێڕیانە!
- یانی دەکرێ هەڵەم کردبێ؟!
- چ هەڵەیەك؟! بۆخۆت تەلەفونت کرد و پێیان گوتی! منیش کە دیتم! ڕێك لەو دەوروبەرە!

(( کەمێك بێدەنگ بووم کە گوتی))

- ئێستا وایدادەنێین کە هەڵەت کردووە! دەردەکەوێ ئیدی! دوو ڕۆژ پارە بەو پۆستەچییانە بدەی, تێدەگەی ئیدی!

(( جگەرەیەکی دیکەی پێ کرد و گوتی))

- حەز دەکەم ئەو جۆرە پیاوانە بە دەستی خۆم بخنکێنم! بێ شەڕەفانە!

(( بڕیار بوو کە سبەی هەمان کار بکەم! ماڵئاوایم لە نەجوا کرد و داوام لێکرد هیچ بە عەلیڕەزا نەڵێت. دواتریش گەڕامەوە خوارەوە. سوگێل چوبۆ سەر دەرسەکانی, حەبێکم خوارد و چووم نووستم!

بە زۆر دوو سەعات نووستم و دواتر سوگێل خەبەری کردمەوە! چووم حەمامێکم کرد و وام بە باش زانی کە هەموو شت ئاسایی بێ و گومان نەکات! ئاوا ئیدی دەمی بۆ لای تەڵەکە نەدەبرد!

جلەکانم لەبەر کردن و چوومە مدبەق کە نانی ئێوارە ئامادە بکەم. هەمیشە بە خۆم دەگوت کە دەبێ ئارام و لەسەر خۆ بم. ئەگەر زانیبای کە من گومانی لێ دەکەم, ئیدی نەدەکرا هیچ ئاشکرا بکرێ, بەڵام بەدەست خۆم نەبوو. لە زەینمدا هەزار پلانم بۆ دانابوو. ئەگەر دەمتوانی لە کاتی خۆیدا مەچەکیان بگرم, زۆر

باشدەبوو. دەمتوانی بە پۆلیسەوە بچمە سەریان! بەڵام ئاخیرەکەی چی دەبوو؟! زۆر زۆرەکەی لێکیان مارە دەکردن! کارەکە ئاسانتر دەبوو! ئاخر دەمتوانی چی بکەم؟! هەتا ئەگەر مارەییەکەش و هەموو ئەو پارەیەی کە پەیدام کردبوو وێی دابامەوە. ئەوە من دۆڕاو بووم! دە ساڵ ژیان! گاڵتە نییە! دوای تەڵاق دەبوو چم کردبا؟! ژنێکی تەنها! ئەگەر وا بڕیار بێ سوگێلیشی لێ وەرگرم, ئەوکات ژنێکی تەنیا لەگەڵ کچۆڵەیەك!(مانگا بە گوێلکەوە) دەبوو چی بکەم؟! لەو مەملەکەتەدا ژنێکی تەنها چۆن دەتوانێ بژی؟! ئەوجار بەقاڵەکانی سەر کۆڵانیش چاوەڕێی شتیان لێ دەکردم! با واز لەوە بێنین, چۆن دەکرێ کچێك بە بێ باوکی گەورە بکرێ؟! ئێستا ئەو زەرەدەی کە بەمن دەکەوت هیچ, چۆن دەمتوانی جێی بابی بۆ پڕ کەمەوە؟! وای خوایە گیان! ئەوە چ بەڵایەك بوو بەسەرم دا هات! باشتر نییە بچم مەسەلەکە بە دایکم بڵێم؟! خۆزگە برایەکم دەبوو! دەمهێنا ئەوەندە لەو چەپەڵە بدات بۆ ئەوەی بمرێ! بمرێ! بمرێ!

(( لەناکاو دەستم بە چەقوو بڕی و خوێنی لێ هات! ئەوەندەی خوێن لێ هات کە مەغسەلە پڕ ببوو لە خوێن, بەڵام من هەستم بە ئازارەکەی نەدەکرد! ئەوەندە دڵم ئازاری دەچەشت, کە هیچ ئازاری دیکەم لە لا گرنگ نەبوون!))

دەستم خستە ژێر ئاوی سارد تا کەمێك خوێنەکەی ڕاوەستێ دواتر چووم پلاستەرم لێ دان. ئەگەر ئاوا بەردەوام دەبوو, حەتمەن بەڵایەکم بەسەر خۆم دێنا! دەبێ کەمێك لەسەرخۆتر بم! لەوەی خۆم وێران بکەم و هیچ ئەنجامێکیشی بۆ من نەبێ! دەبوو بیر بکەمەوە! نەدەبوو پەلە بکەم! هێشتا هیچ ڕوون نەبۆتەوە بە تەواوی!

دیازپامێکی[1] 2م خوارد و کەمێك ئارام بوومەوە. تەقریبەن نزیك هاتنەوەی بێهروز بوو. تۆزێك خۆم کۆکردەوە و کەمێکیش ئاڕایش! هەرچەند کە وەك گاڵتەجاڕانم لێ هاتبوو, کە بەو هەموو خەم و خەفەتەی هەیەتی بگریەت و لە کن خەڵکیش خۆشحاڵ دەرکەوێ و بە غەم و خەفەت بێ و ببێتە گاڵتەجاڕی ئەوان!

نزیك هەشت و نیو بوو کە هاتەوە ماڵێ. موچوڕکەم بە لەش دا دەهات لێی, وەلێ هەوڵم دا وەك هەمیشە بم! خێرا چوومە پێشی و سەلامی کرد و جانتاکەیم لێ وەرگرت, کە سەری هێنا پێش نزیك ڕووخسارم و ماچی کردم. حەزم دەکرد هەر لەو کاتە دا و لەوێ زللەیەکی لێدەم, بەڵام هەرچۆنێك بووە خۆم ڕاگرت و خەندەیەکم بۆ کرد کە گوتی))

– چەندە جوان بووی ئەمشەو؟!

((سەیرم کرد کە گوتی))

– چی بووە؟!

ـ هیچ! تۆش تازە ئەوە گەنج دەبیەوە!

– من؟! یانی چۆن؟!

(( هەستم کرد ناتوانم خۆم کۆنتڕۆڵ بکەم, هەر بۆیە گوتم))

ـ قسەت خۆشن!

– ئێ هاوسەری خۆم خۆشدەوێ ئیدی! سوگێل لە کوێیە؟!

ـ ئاودەست!

– ئەمشەو زووتر بینوێنە با...

[1] دیازپام: جۆرە حەبێکە بۆ ئارامکردنەوە بەکار دێ.

(( حاڵەتێکی شڵەژان ڕووی تێکردم! ئیدی تەحەمولی ئەوەیانم نەبوو! ئەسڵەن نەمتوانی بیریشی لێ بکەمەوە! خێرا جانتاکەیم برد و خستمە ناو دۆڵاب و پێڵاوەکانیم خستنە جێ پێڵاو. چووە بەردەم حەمام و جلەکانی هەر لەوێ دانان و لەوێی فڕێ دان, بۆخۆشی چۆ حەمام. بە تۆبزی چووم جلەکانیم هەڵگرت. دواتر بیرێکم بە مێشك دا هات! خێرا گیفانەکانی گەڕام. شتێکی وای تێدا نەبوو. کابۆکەیم جیا کردەوە و خستمە ناو دۆڵاب. ویستم کراس و گۆرێیەکانی بخەمە سەبەتەی جلە پیسەکانەوە کە لەناکاو چاوم بە کراسەکەی کەوت! پەڵەیەکی سوری پێوە بوو. پەڵەی ئاومیوە! بەڵام بۆچی ئاومیوەی سور؟ ئەو ڕۆژە بۆ نیوەڕۆ عەدەسپۆلو[1]م بۆ ئامادەکردبوو, لەگەڵ خورما بردبووی بۆ فەرمانگە. خۆ کەسیش ئاومیوە لەگەڵ نژێ پڵاو ناخوا. خوێڕی! هیچ و پوچ! نمەك بە حەرام! حەتمەن لەگەڵ ئەو قەحبەیە چۆتە چێشتخانە و ئەوکات من دەبێ شتە پیسەکانی بۆ بشۆم. بێ شەڕەفی خوێڕی! حەزم دەکرد لەو کاتەدا بیکوژم!

توڕەیی خەریك بوو دەیخنکاندم! بە زۆر چوومە مدبەق چێشتەکەم وەسەر نا تا گەرم ببێتەوە, مێزەکەم ئامادەکرد و بانگی سوگێلم کرد. ئەو خوێڕییەش کەمێك دواتر هاتەدەر! جلەکانی دەبەر کردنەوە و هاتە مدبەق کە سوگێل سەلامی لێ کرد و بە غار خۆی لە باوەشی هاویشت. ئەویش کەوتە سەر چۆك و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵی. منیش تەنها گوێم دەگرت. حەزم نەدەکرد سەیری بکەم!

- کچە جوانەکەم, هەموو ئەرکەکانت نووسینەوە؟

- بەڵێ بابە گیان!

- ئافەرین, خۆ دایکت بێزار نەکردووە؟!

- نا بەبە گیان!

[1] عەدەسپۆلو: جۆرێك پڵاوی تێکەڵ بە گۆشت و نیسك و کشمیشە.

ـ ئافەرین کچە جوانەکەم! ئێستا زووتر نانی ئێوارە بخۆ و بڕۆ بنوو, تا بەیانی زوو خەبەرت بێتەوە! نمرەکانت خۆ هەمووی بیستن؟

– هەموویان بابە گیان! هەموویان پێشانی دایکم دەدەم!

ـ ئافەرین بۆ تۆ! ئافەرین بۆ دایکت کە گوڵێکی ئاوای پەروەردە کردووە!

(( دەتگوت یەکێك بە کێرد دڵمی لەت لەت دەکرد! حەزم دەکرد هاوار بکەم و بڵێم ئەی چیت لێ هاتووە کە بەدوای خوێڕییەتییەوەی!))

ـ بەڕاستی دەبێ قەدری ئەم دایکەت بزانی! هەم بە کاری دەرێ ڕا دەگا, هەم بە کاری ماڵەوە و چێشتلێنەری و هەم بە منداڵ بەخێوکردن و دەرس و ئەرکی قوتابخانەی! گوێم لێ نەبێ کە بە قسەی دایکت نەکەی هاا!

– نا بەبە گیان!

ـ ئافەرین گیانەکەم! دەی یاڵڵا با نانی ئێوارەمان بخۆین!

(( شێوم بۆ تێکردبوون. دەمویست شتێك بڵێم, چونکە لەو کاتانەدا هەر من قسەم دەکرد. بەڵام هەر چی کردم, نەمتوانی هەتا یەك وشەش بڵێم!))

ـ تەرانە گیان زۆرت بۆ تێکردووم! ئەو هەمووەم پێ ناخورێ!

(( سەیرم کرد, بێشەرمە ئەوەندەی خواردبوو, کە هەتا بۆ تام کردنیش جێی خواردنی نەبوو!))

ـ ئەمڕۆ لەگەڵ لوتفی چووینە دەرێ! عەسر بوو. ساندویچمان خوارد!

((واقم وڕما, یانی چی؟!))

ـ ئینکاری هاا! نیوەشم پێ نەخورا! خوا ڕەحم بکا کە تۆ شێوم وێ دەدەی! ئەو خواردنانەی دەرێ خۆ بەس بە ناو خواردنن! مرۆڤ هەفتەیەك بیانخوا گەدەی تێکدەچێ !

(( یانی بەڕاستیی بوو؟! لەوانەیە بیەوێ پەڵەی کراسەکەی پەردە پۆش بکات!

دەبوو حەتمەن ئێستە قسەم کردبا, مەگەر نا وەشك دەکەوت))

– ساندویچ بۆچی؟

ـ ئەگەر دەزانی چی بووە! لە فەرمانگە حەیای چوو!

(( دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی))

ـ مرۆڤ ئەگەر هەڵەش بکا ئاساییە, بەڵام ئەگەر بە ئاقڵانە بیکا! کچێکمان تازە دامەزراندووە. مانگێکە. نموودێکی خراپی نییە! تەقریبەن بیست ساڵە! لە ژێر دەستی لوتفی دا کاری دەکرد! ئێستا نەهاتبوو لوتفی دەستی لەگەڵ تێکەڵ کردووە!

– نمەك بە حەرام!

(( لەناکاو ئاوڕی لێم دایەوە و پێکەنی و گوتی))

ـ ئۆه ئۆه ئۆه ئۆه! یەکیەتی و یەکگرتوویی ژنان!

(( کەمێکی دی لە خواردنەکەی خوارد و گوتی))

ـ بەه بەه, دەستت نەڕزێ! عەجەب خۆرشتێك! بۆبەیانیشت بۆ داناوم؟!

(( لە جێی بەڵێ سەرم بۆ ڕاوەشاند و گوتی))

ـ بێچارە زۆریش گوناحە! ئاخر ژنەکەی جۆرێکە! هەرچییەك بێ نەدەبوو وای کردبا! بەهەرحاڵ!

(( دیسان هەندێکی دیکەی خوارد و گوتی))

ـ قوربانی دەستت! وەك چۆن بۆت بەتاڵ کردم, ئاواش بۆم تێکەوە! ئەوەندە بەتامە کە گۆڕی ڕژێم و ئەو شتانە..!

(( کەوگیرێکم بۆ تێکرد و بەدەم خواردنەوە گوتی))

ـ خێزانەکەی بۆ کابان و ژیان بەکار نایە! بێچارە بە زۆری دەچێ ساندویچ و ئەو شتانە دەخوا!

- لەوانەشە شایستەی نەبێ؟!

ـ شایستە نییە! قسەی تۆیە! جا گوێگرە! ئەو کچە ماڵێیان کەمێك دەوڵەمەندن! خولاسە لە شوێنێك بێتامی دەکات و ئیدی واوەیلا! ژنەکەشی لە ماڵ دەری دەکات! ئەورۆش بە زۆر منی لەگەڵ خۆی برد کە شتێك بخوا! هەرچەند پێمگوت کاکە من نیوەڕۆ نانم خواردووە و ئێوارەش دەبێ بچمەوە ماڵێ, گوێی نەگرت و ساندویچێکی بۆ کڕیم! ناچار نیوەم خوارد!

- ئەسڵەن لە خۆتەوە لەگەڵ هیچ و پوچی ئاوا چوویە دەرێ؟!

ـ تازە نەدەکرا! زۆریش بە گژیدا چووم! هەم من, هەم تەواوی هاوڕێیان! کچەشمان دەرکرد!

- دەرکردن؟! دەبوو هەردووك لە سێدارە بدرێن!

(( کەمێکی دیکەی خوارد و دواتر ڕاشکاوتر گوتی))

ـ نا گیانەکەم! هەڵە مەکە! تۆ سەیری خۆت دەکەی! ژنی خەڵك خۆ هەموو وەك تۆ نین! من کە پێ دەنێمە ماڵ هەموو شت ئامادەیە! لە جل و بەرگەوە بگرە تا نانی نیوەڕۆ و ئێوارە! ماڵ و ژیانم کە هەمووی وەك گوڵە! منداڵەکەشم هەر وا! ئیدی کەم و کەسریم لە ژیاندا نییە! تۆش هەموو کات لێم تێدەگەی! وەلێ خۆ هەموویان ئاوا نین! وەرە بەس چاو لە جلەکانی لوتفی فەقیر بکە کە دەبەریان دەکا! ئێقەی چڵك! تەنیشتی دڕاو! لەبەر بۆن ناوێری لە کنی دانیشی! ئێ خەڵك دەزانن کە ژنەکەی وەك پێویست نییە! ئێستا ئەوەش لە جیاتی ئەوەی ژیانی باشتر بکا, چووە غەڵەتێکی ئاواشی کردووە! هەر بۆ وێنە چەند ڕۆژ لەمەوبەر لە ژوورەکەی من دا چامان دەخواردەوە. من هەموو دەم کۆتەکەم دادەنێم. ئەو ڕۆژە وەك چۆن لەسەر قەنەف لە تەنیشتم دانیشتبوو, دەستی گرتم و هەڵیستاندم.

چاوێکی لەسەر قۆڵەکانم کرد و پێکەنی و گوتی" خێزانەکەت کراسەکەت سەرە سەعات دەشوا یان هەر ڕۆژە و دانەیەکی نوێ دەکڕی؟!"

دواتر سەر قۆڵی پێشان دام! ........؟

(( لەپەسا سەیرم دەکرد! ئاخر چۆن دەبێ! یانی خەریکە خۆی دەنوێنێ؟! دەزانم کە دەیناسم! یانی وا بیر دەکەمەوە کە دەزانم! ئێستا خەریکە ڕاستگۆیانە قسە دەکا! دەزانم! دەزانم!))

- ئەمشەویش دەیویست بێتە ئێرە! هەر چۆنێك بێ خۆم لێ شاردەوە! حەز ناکەم لەگەڵ ئەو جۆرە پیاوانە هەڵسوکەوت بکەم! خەڵك پاشەملە قسە دەکا! متمانەی مرۆڤ دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە! بابە گیان گۆشتیش بخۆ! تەرانە گیان گۆشتی بۆ دانێ!

(( لە قاپی شلەکەوە پارچە گۆشتێکم بۆ سوگێل دانا! ئەسڵەن نەمدەزانی ئیدی دەبێ باوەڕ بە چی بکەم و باوەڕ بە چی نەکەم! یانی بەڕاستی بابەتی پەڵە ئاومیوەکە ئەوە بووە؟! لە بن چاوەوە سەیرم کرد! ئاسودە و بێ خەیاڵ و توند!

تەواوی ئەو کارانەی ویژدان دەیانکا, ئێستا ئارام و لەسەر خۆیە. مەگەر دەکرێ پیاو خیانەت لە ژنەکەی بکات و ئەوەندە ئاسودە بێت؟ دواتریش بێت و باسی ئەو قسانە بکا لە کن خێزانەکەی!

لەناکاو دەستی کرد بە پێکەنین و گوتم))

- تۆ گوتت چی؟!

((دەستی لە ماست دابوو کە سەیرێکی کردم و گوتی))

- بەراورد کردنی نرخی گەوهەر لەگەڵ ئافرەتی وەك تۆدا, خیانەتە! خیانەت و زیادەڕەوەی کردن لە بەرامبەر تۆ دا! تەرانە! وا بیر مەکەوە من قەدری کارەکانی

تۆ نازانم! تا ئێستا نەمتوانیوە کارێکت بۆ بکەم! بەڵام خوا گەورەیە! هێشتا کات هەیە! با بڵێین گریمان کردم پیاوێك ئیشی خراپ دەکات, بەڵام ئەوە مانای ئەوەی نییە کە خێزانەکەی خۆشنەویستووە! بۆ من تەنها تۆ یەکەمی و یەکەمیش دەبی! هەتا پێش سوگێلیشی کە پارچەیەکە لە گیانم!

(( دواتر پێم پێکەنی و ئەو دەستەی کە نانی پێ بوو, لە ماستی هەڵێنا و خواردی و گوتی))

– کەمێکی دیکەشم برنج بۆ تێکە!

(( خوایە گیان! دەبێ باوەڕ بە چی بکەم؟ بە درۆکانی یان بە سوێندەکانی؟! یانی ئەوەندە هونەرمەندێکی باشە؟ یان ڕاست دەکا؟! ئەگەر هەڵە بووبم چی؟! ئەگەر نەجواش هەڵەی کەردبێ چی؟!

نانی ئێوارە تەواو بوو و سوگێل چوو نووست و بێهروزیش چۆ بەر تەلەفزیۆن و سەتەلایت, منیش قاپەکانم شردن و بیرمکردەوە! بیر! بیر! بیر! بیر!

کاتێك کارەکانم تەواو بوون, چام بۆ برد و ویستم بۆی لەسەر مێز دانێم, کە دەستی گرتم و ڕایکێشام بۆ لای خۆی و لە تەنیشت خۆی داینیشاندم و گوتی))

– تەرانە؟!

ـ چییە؟!

– پێت وا نییە دۆسییەی ئەو کچە بۆ توو نابێ؟!

ـ یانی چی؟!

– کاریگەریی لەسەر داناوی!

ـ لەوانەیە!

– ناتوانی بیگەڕێنیەوە؟!

ـ نا!

- دەزانم ئەركت زۆر قورسە! ئیش زۆر دەكەی! ڕەحمەت لە باب و دایكت! بەڕاستی دەستیان نەڕزێ! چ كچێكیان پەروەردە كردووە! توخوا سوگێلیش وەك خۆت ڕابێنە!

(( بەڕاستی تێكەوتبووم! ڕستەكانی یەكە یەكە وەكو ئاو بوون, كە بەسەر ئاگریان دا بكەی! نەرم ببووم! ئیدی هیچ خەبەرێك لەو نەفرەتەی ناخم نەبوو, یا هیچ نەبێ زۆر كەم بووبۆوە!

خەندەیەكم بۆ كرد! دەمویست پێبكەنم! دەمویست هەر بەو شێوەیە بم! دەمویست بێهروز پاك بێت! ئامادە بووم دە جاریش ئەو كارە بكەم, تەنها بێهروز پاك بێت! لەوانەیە یەكەم جار بێت لە ژیانم دا داوام لە خوا كردبێ, كە هەڵە بوویم!

ویستم هەستم بڕۆم بۆ مدبەق! بۆم قورس بوو, لەو كاتەدا و لە پێش بێهروز, هەستەكانم دەربڕم. وەلێ دووبارە دەستی گرتم و گوتی))

- دانیشە ئیدی! بۆ كوێ دەچی؟!

ـ دەچم میوەت بۆ بێنم!

- سندان لە من دا! سەری كیتەڵە كراوەیە! پشیلەكان حەیایان بۆ كوێ چووە؟! دانیشە بۆ خۆم دەچم دێنم!

(( لەناكاو دەستی ماچ كردم و لە جێی خۆی هەستا و چوو بۆ مدبەق! ئیدی نەمتوانی پێش بە خۆم بگرم! بە نەرمی دەستم بە گریان كرد! فرمێسكەكانم, دانەدانە لە چاوانم دەهاتنە خوار بۆ سەر ڕوومەتم! فرمێسكی غەم! فرمێسكی دەرد! فرمێسكی نەزانین و مانەوە لە دوو ڕێگە دا! فرمێسكی گەمژەیی! فرمێسكی پەشیمانی!))

- تەرانە؟! چیتە؟! چی بووە؟!

- هیچ؟!

– ئەی بۆچی دەگریەی؟!

- هەر وا!

– من بەیانی دەچم بۆ دادگا! هەر چۆنێك بێ دەبێ ئەو فایلە بگەڕێنیەوە!

- نا لەبەر ئەو نییە!

– ئیشت زۆرن گیانەکەم!؟ وایە؟!

- نا! نا!

– بۆچی دەبێ من بەو شێوەیە بم؟! بەخوا! زۆر جار ڕقم لە خۆم دەبێتەوە تەرانە! (( ڕوومەتم سڕییەوە و پێکەنیم, کە گوتی))

– هەستە بڕۆین! هەستە بڕۆین بنوین!

- میوەکەت بخۆ!

– میوە با بۆ شەوێکی دی بێ!

***

(( بەیانیی ئەو ڕۆژە کەمێك درەنگتر چوومە سەر کار! دەبوو دڵنیا بم! پەیوەندیم بە پۆستەچییەکی ماتۆڕییەوە کرد! پۆستەچییەك کە لە دەوروبەری ئێمە نەبوو! چل هەزار و وێنەیەکی بێهروزم وێ دا, ڕۆیشت کە چاودێریی بکات. دواتریش بۆخۆم چووم بۆ کۆمپانیا, بەڵام چی ببینم؟! تەواوی ئەو کارانەی کە ئەو ڕۆژە ئەنجامم دابوون, تێکەڵ و پێکەڵ بوون. فایلی کۆمپانیایەکم بردبوو کۆمپانیایەکی دی. داواکاری یەکێکم لە جیاتی ئەوەی دی بردبوو بۆ دادگا! ئەوە هەر هیچ کە نەمتوانی سێیەم ئیش بکەم و پێی ڕانەگەیشتم! خولاسە سەعات دوو کە گەڕامەوە ماڵ, تازە وەبیرم هاتەوە کە نانی نیوەڕۆم بۆ سوگێل ئامادە نەکردووە!

خێرا تەلەفونم بۆ دەرێ کرد و پیتزام بۆ هێنا. هەرچی چۆن بێ شتێکم بۆ ئێوارە ئامادە کرد و چوومە سەرێ کن نەجوا! دوو سەعاتیش لەوێ بووم و هەر چامان خواردەوە و جگەرەمان کێشا و قسەمان کردن و فکرمان کردەوە و گومانمان بردن!

هەرچی چۆن بێ, بوو بە شەو و بێهروز گەڕایەوە ماڵ و بە گشتیی نان خواردن و کەمێك گاڵتە کردن و نووستن! بەڵام چ نووستنێك؟! تا سەعات دووی نیوەشەو خەوم لێ نەکەوت. دواتریش کە هەر خەونم دەدین.چاودێریی بێهروزم دەکرد. کە بۆخۆم لە پشت ئەو ماتۆڕە پۆستەچییە سوار ببووم و دەبینم کە بێهروز کچێکی لە تەنیشت خۆی سوار کردووە. بەڵام ئەو خێرا دەڕۆیشت , بۆ هەر چوارڕیانێك کە ئێمە دەگەیشتین, گڵۆپ سور دەبوو و لێی دوادەکەوتین!

بەیانییەکە, کە زوو هەستام و نانی بەیانیم ئامادە کرد و سوگێلم لە خەو هەستاند. دواتریش بەڕێم کرد بۆ قوتابخانە. کاتێك بێهروزیش هەستا لە خەو, خوا خوام بوو زوو هەستێ نانەکەی بخوات و بڕوات بۆ فەرمانگە. قەرارمان لەگەڵ پۆستەچییەکە سەعات هەشت و نیو بوو.

بێهروز سەعات هەشت لە ماڵ وەدەرکەوت و منیش وەك چۆن لە پەنجەرەوە چاوەڕێی ڕۆیشتنی بووم, چاوەڕێش بووم تا پۆستەچییەکە بگات. ڕێك لە کاتی خۆیدا بوو سەعات هەشت و نیو کە پۆستەچییەکە گەیشت و لە جەرەسی دا. چوومە خوار! جوابی سەلامەکەیم نەدایەوە, تەنها گوتم))

- چی بوو؟!

- هیچ وەڵا خانم!

- هیچ یانی چی؟!

- هەر لەو کاتەوەی کە چوومە فەرمانگە, تا فەرمانگە تەواو بوو, هیچ خەبەرێك نەبوو. کاتێك فەرمانگە تەعتیل بوو, ئەو پیاوە سواری ماشێنەکەی بوو و چوو بۆ شوێنێکی دیکە, بۆ باڵەخانەیەك.

ـ باڵەخانەکە لە کوێ بوو؟

- لە جادەی کشتوکاڵ!

ـ شەریکەکەی لەوێیە, ئێ؟!

- تا شەویش هەر لەوێ مایەوە, دواتریش کە هاتە دەر, دووبارە سواری سەیارە بۆوە و هاتە ئێرە!

ـ تۆ دڵنیای؟!

- خەیاڵتان ئاسودە بێت خانم, من خیانەت لە کارەکەم دا ناکەم! هەر ئەوەی کە بینیم, گوتم. ئێستا ئەگەر دەتانەوێ, سبەینێش دەچم؟!

ـ نا, سبەی نا. بۆخۆم تەلەفونتان بۆ دەکەم!

- ئەگەر تەلەفونتان کرد, بڵێن ئیشم بە مەنسورە!

ـ باشە, باشە, زۆر زۆر مەمنون. دەستان خۆشبێ.

(( خواحافیزیم لێ کرد و چوومەوە ژوور. کەمێك خەیاڵم ئاسودە ببۆوە. خێرا ئیشەکانم کردن و چوومە سەر کار. ئەو ڕۆژە هێور تر بووم. هەرچەندە کە زۆر بە ڕێك و پێکی دەڕۆیشتم, وەلێ ئیدی گومان و سەرکۆنەکردنیش زۆر کەم ببۆوە.

***

**((شریتی پێنجه‌مم خسته ناو ته‌سجیله ده‌نگییه‌که))**

**شریتی پێنجه‌م**

**دوو شه‌ممه سه‌عات 10:30ی به‌یانی, ڕێکه‌وتی... گرتووخانه‌ی ژنان... دۆسییه‌ی ژماره... ناو ئه‌فسانه...**

ـ سڵاو.

– دووباره سڵاو! بۆچی ئه‌مڕۆ ئه‌وه‌نده دره‌نگ هاتی خانمی پارێزه‌ر! ترسام هه‌ر نه‌یه‌ی!

ـ له شوێنێك كارێكی چكۆله‌م هه‌بوو, ئێ خۆ باشی؟

– خراپ نیم.

ـ ها ! ئه‌وه‌ش چوكلێت!

– ده‌ستت خۆشبێ!

ـ شه‌ربه‌تی ئه‌نه‌ناسیشم بۆ هێناوی!

– ئۆوو! زۆر شه‌رمه‌زارت كردوم وه‌ڵڵا !

ـ شایه‌نی نییه, دانیشه!

– ده‌یبه‌مه ناو گرتووخانه, هاوڕێكانم خۆشحاڵ ده‌بن.

ـ جاخۆ هیچ بۆ تۆ نامێنێتەوە !

– عەیبی نییە, پێکەوە دەیخۆینەوە.

ـ چووبوومە دادگا, هیچی وات بۆ دادگاییکردن نەماوە ها !

(پێکەنین)

– دادگاییکردنی من دەمێکە تەواو بووە !

ـ نا ! ئێستا هیچ دیار نییە !

– بۆچی ئەوەندە گەشبینی؟ !

ـ مرۆڤ دەبێ ئاوا بێ !

– ئەگەر لە ژیانیش دا ئاوا بی, کوڵاوت لەسەر دەنێن!

ـ باشە, تا کاتمان هەیە باس بکە !

– با بگەیە جێ, خۆ ئێستا نەهاتووی؟ دوای !

ـ ئاخر کاتم نییە.

– من کاتم نییە یان تۆ؟ !

ـ هەردووکمان, لە ڕاستیدا ئێمە ئێستا یەکین!

– یانی تۆ لەودیو میلەکان و منیش لەم دیو میلەکان ! کەمێکیش جیاوازیی هەیە !

(بێدەنگی)

– دڵتەنگ مەبە خانمی پارێزەر, دەزانم خەتای تۆ نەبووە !

ـ ئێستا باسی دەکەی؟ !

– بەڵێ ! گوێگرە !

( بێدەنگی)

– ماوەیەك دواتر. هێشتا نەچووبوومە زانکۆ. یانی تەواو ببووم و خەریك بوو دەرسم دەخوێند کە بۆ تاقیکردنەوەی کونکوڕ ئامادە بم. نزیك مانگی بانەمەڕ, ئەو کاتانە

بوو. ئیدی لەو ماوەیە دا زۆر کارم کردبوون. جا گوێت لێ بێ. بیست کوڕم گۆڕیبوون! کوڕە بیستی چی؟! بگرە سی تا چل دانە! هەفتەیەك لەگەڵ ئەم, دە ڕۆژ لەگەڵ ئەویان, دوو هەفتە لەگەڵ سێ دانە, لە یەك کات دا. هەفتەیەك پشوو. دووبارە لە سەرڕا! وەکو یارییەکی لێ هاتبوو بۆم!

کوڕەکانم بە سەری پەنجە دەخولاندنەوە! دە گریانم دەکردن! تا سەر کانیم دەبردن و تینوو دەمهێنانەوە! کاری وام لەگەڵ دەکردن کە شێت و هار دەبوون! لەو نێوەش دا شوکا هەر جارە و شتێکی فێر دەکردم و ئەگەریش کوڕێکم ئازار دا با, چەپڵەی بۆ لێ دەدام و دەستخۆشیی لێ دەکردم. ئیدی لە کارەکەم دا ببوومە مامۆستایەك بۆخۆم. وەکو بەرنامە ڕێژییەك بوو. قۆناغ بە قۆناغ. سەرەتا کوڕە دەهات بۆ ئاشنابوون! دواتر کەمێك لە شەقامەکان دا پیاسەمان دەکرد! یەك دوو جاریش کافتریا! دوای ڕێستورانت! دواتر سینەما!

(بێکەنین)

- ئەگەر دواتریش پێم گوتبا بڕۆ لەبەر من بمرە, دوانەدەکەوت! ئیدی دوای ڕۆیشتن بۆ سینەما, دەبوو بە کۆیلەی من. هەرچۆنێك بێ, هەر کارێکم پێ کردبا, دەیکرد. ئەو کاتە, دەرگای ویستەکانم, دەکرایەوە. پێڵاو, جل, عەتری گرانبەها!

ئیدی دنیا بە ویستی من بوو! وەك شای دەژیام! تەنیا کێشەم ئەوە بوو کە ئەو دیارییانەی ئەوان بۆم دەکڕن, چۆن چۆنی بیانبەمەوە ماڵێ؟ ئیدی نە من و نە شوکاش نەماندەزانی چی بە بابم بڵێین! یانی بڵێین ئەوانەمان لە کوێوە هێناون!

هەرچی چۆن بێ من پارەم لە بابم وەردەگرت! شوکاش بە هۆی منەوە لێی وەردەگرت! بەڵام تا ڕاددەیەك دەمانتوانی ئەو دیارییانە بخەینە بەرانبەر پارەکە, ئەوەی دی دەمانەوە و دەبوو لە سندووقەکەم دا بیانشارمەوە!

ئێستا با بێینە سەر شوکا! پێشتر بۆم باس کردی! مێردێکی کردووە و زۆریش شوەکەی خۆشویستووە! گوایە مێردەکەشی ئەوی زۆر خۆشویستووە, بەڵان لەو نێوانە دا خەسوو و خوشکەمێردەکەی بۆ ببوونە... کەر! لە هەر سات و نا ساتێك دا دەهاتنە ناو ژیانیانەوە!

بەو شێوەیەی کە بۆخۆی دەیگوت, یەك دوو ساڵی سەرەتا نەیان هێشتووە منداڵیان ببیٚ. بەڵام دواتر خەسوو فشار بۆ کوڕە دێنیٚ و بڕیار دەدریٚ کە ئیدی ڕێگر نەبن و منداڵیان ببیٚ!

مانگێك, دوو مانگ, شەش مانگ, کورە ساڵێك, دوو ساڵ, نابیٚ و نابیٚ! فەحس و سۆنەر و ئەو شتانە, دەردەکەویٚ کە کێشە لە شوکایە! ئیدی موسیبەتەکان دەست پیٚ دەکەن, سەرکۆنە کردن و سەرزەنشت کردن و کوچك و پلار دەست پیٚ دەکەن. شوکاش کە بیٚ ئەمەڵ دەبیٚ لە دکتۆرەکان, دەچێتە کن ئەو جادووگەر و فاڵچی و نوشتەچییانە. ئەوانیش ماوەیەك دەیخافڵێنن و ئیدی تەواو. ئاخیرەکەشی کە دووعا و نەزر و ویستەکانی جێبەجیٚ نابن, شوکا و شوەکەی لە هەموو شت بیٚ ئەمەڵ دەبن. پێکەوە بڕیار دەدەن کە بچن بۆ دایەنگە و منداڵێك بێنن و گەورەی بکەن, وەك منداڵی خۆیان.

کاتێك ئەو بڕیارە دەدەن, مێردەکەی تەلەفون بۆ دایکی دەکات و بابەتەکەی بۆ باس دەکات و لەسەر تەلەفون زۆر بە پیاوانە بە دایکی دەڵیٚ: من ژنەکەی خۆمم خۆشدەویٚ و منداڵنەبوونی هیچ لەکنم گرنگ نییە, چونکە دەمەویٚ لەگەڵی بژیم. چەند ڕۆژێکی دی دەچینە دایەنگە و منداڵێك دێنین. هەر ئەوەندە! دایکیشی نیو سەعات دواتر لەگەڵ خوشکەکەی وەسەر ماڵێیان دەگەڕێین و قیامەتێك بەرپا دەکەن کە هەر باسی مەکە! دواتریش بە فێل و تەڵەکەبازی وا خۆیان پێشان دەدەن کە هیچ کێشەیان نییە کە شوکا منداڵی نابیٚ! ئێوە دەتوانن هەزار ساڵی

دیکەش پێکەوە ژن و مێرد بن وەك ئەو هاوسەرانەی کە منداڵیان نابێ. بەشکو تا چەند ساڵی دی خوا بکا و منداڵتان پێ بدات! شوکا و شوەکەشی زۆر خۆشحاڵ دەبن و بەو قسانە قایل دەبن و ئەو قایلبوونە بە خۆشی تەواو دەبێت.

لە لایەکی دیکەش خەسوەکەی هەرچی چۆن بێ, لەولا ئەولا کچێکی جوانی بۆ دەبینێتەوە و پێشانی کوڕەی دەدات و ئەوەندە لەبنی دەخوێنێ و دەخوێنێ و دەخوێنێ, تا کوڕەکە ڕازی دەکات. وەختایەك شوکا خەبەردار دەبێ کە نامەیەکی لە دادگاوە بۆ دێت! فڵان کەسی چی فڵان کەس و نازانم چی و چی, وەرە کە شوەکەت بە هۆکاری نەگونجان دەیەوێ تەڵاقتان بدات. دواتریش چاردە سکە دەخەنە دەستی. مێردەکەی کە گەورەیی دەنوێنێ, شەش سکەی دیکەشی دەداتێ و خەسوەکەی و خوشکە مێردەکەشی, بە ناونیشانی هەدیە, هەر یەکە و دوو سکەی بۆ زیاد دەکەن و هەر بەخێرێی!

ئەمەش ئەو! ئیدی شوکا نەخۆش دەبێ دواتر  شێت دەبێ و وای لێ دێ و وای لێ دێ, پێویست بە گوتن ناکە.

چەند ساڵ دواتریش کە دایکی من دەمرێت, خێزانی بابم شوکای بۆ دە نەزەر دەگرن. شوکاش بە زیرەکی و شارەزاییەکی تەواوەوە دێت و دەبێتە هاوسەری بابم. هەر چەند کە لە ڕووی تەمەنەوە نەدەگونجان, وەلێ هەرچییەك بێ بۆ ئەو پەناگەیەك بوو. ئەگەریش دەگەڵ من گونجاو بوو, بۆ ئەوە بوو کە نەیدەویست دوژمنێك بۆخۆی دروست بکات! هەر بۆیەش ئەوەندە لەگەڵم باش بوو و ئاگای لێم بوو. ئێستا با بگەڕێینەوە سەر چیرۆکی من.

خەریك بوو خۆم بۆ کونکوڕ ئامادە دەکرد. تا ئەو ماوەیەی کە ئەو کوڕانەی کە دەگەڵیان دەبوومە هاوڕێ, وەکو منداڵ بوون بۆم. یانی تەمەنێکی وایان نەبوو. هاوتەمەنی من! بەڵام کچێك لەو تەمەنەدا کە بۆخۆت دەزانی چۆنە, کوڕێك لەو

تەمەنە دا ناتوانیٚ بە خۆی ڕا بگات, چ بگا بە شتی دی! وەکو منداڵ وا بوون. یانی منداڵ بوون ئیدی. بۆ وێنە ئەوەندە بەس بوو, کە لە سینەما دەستیان بگرم و لەسەر دڵمی دانێم و پێیان بڵێم" سەیرکە دڵم چۆن بە توندی لیٚ دەدا"! هەر ئەوەندە بەس بوو بۆیان! دەتگوت دنیایان پیٚ داون. جا ئەگەر ئیشی دیکەشم دەکرد ئەوە هەر لێیگەڕیٚ.

ئیدی دنیا گاڵتەجاڕ بوو بۆم. هەر چەندە سات نا سات ئەو بەرنامەیەم لەسەر کوڕێك جێبەجیٚ دەکرد و دەمدۆشی و کەمێك دواتر بەڕەڵام دەکرد! تا ئەوەبوو ڕۆژێك لە دەرسی کونکوڕ دەگەڕامەوە ماڵیٚ, هەوا باراناوی بوو و جادەش پڕ لە ئاو! لە پۆل هاتمە دەریٚ و چوومە سەر جادە کە سواری تاکسی بم. وەك چۆن ڕاوەستا بووم, لە ناکاو ماشێنێکی پێژۆ هات و بە تەنیشتمدا تێپەڕی و هەرچی قوڕاو بوو, بەر من کەوت!

ئەوەندە توڕە بووم کە هاوارم کرد و گوتم" حەمباڵ"!

سەیارەکە بیست مەترێك لەولاتر وەستا و دواتریش بەگی دانا و هاتەوە پێش من! ئامادە بووم کە هەر دابەزیٚ و هەندیٚ قسەی دیکەشی پیٚ بڵێم, بەڵام لەناکاو دەرگای سەیارەکە کرایەوە و کوڕێکی گەنجی بەهەیکەل جوان و قۆز, تەقریبەن بیست و چوار پێنج ساڵە دابەزی. ڕاستییەکەی قسەم پیٚ نەمان, تەنها پێم گوت: کاکە ئەوە چۆن سایەقییەکە ئەتۆ دەیکەی؟! مەگەر نابینی ئەو هەموو ئاوە لە جادە دایە و خەڵکیش لەسەر جادە وەستاون؟!

(( کوڕە سەیرێکی کردم و گوتی))

- مرۆڤ کاتێك کوێر دەبیٚ, زۆر شت نابینیٚ!

(( دواتر هاتە پێش و گوتی))

- بەڕاستی هەر ئەو حەمباڵەی کە گوتت شایەنی منە!

(( سەیرێکم کرد و گوتم))

ـ ببەخشن بەڵام زۆر تورە ببوم!

- حەقتە ئەگەر دیسانیش قسەم پێ بڵێی هەقتە.

ـ نا تکا دەکەم!

- چاو لێکە چم کرد! تەواوی جلەکانت قوڕاویی بوون!

ـ گرنگ نییە, ئێستا دەچمەوە ماڵێ.

- بەڕاستی داوای لێبووردنتان لێ دەکەم! تکا دەکەم لە بەرانبەر ئەو کارەی کە کردم, بۆ قەرەبوو کردنەوەی بتانگەیەنمە ماڵێ.

ـ نا زۆر سوپاس ئیدی...

(( نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم, خێرا دەرگای سەیارەکەی کردەوە و گوتی))

- تکا دەکەم فەرموون! بەو حاڵە خۆ ناتوانی سواری تاکسی بی. فەرموون تکا دەکەم! خەیاڵتان ئاسوودە بێت! ڕاستەوخۆ دەچینە پێش دەرگای ماڵتان.

(( لەناکاو فکرێك هاتە مێشکمەوە, ئیدی لەوە باشتر نەدەبوو. زۆر دەمێك بوو لەو فرسەتە دەگەڕام! کوڕێکی گەورە و گەنج! گەورەتر لە خۆم! ئەوەندە کە سەیارەی هەبێ! ڕێك وەك ئەمە! خەندەیەکم بۆ کرد و سوار بووم و ئەویش سوار بوو و وەڕێ کەوتین, گەرمیی سەیارەکەی پێ کرد و گوتی))

- سەرماتان نییە؟

ـ نا تەنها کەمێك تەڕ بووم!

- بەڕاستی داوای لێبوردن دەکەم! ئەسڵەن ئاگام لێ نەبوو! ڕاستی ئەوەندە تورە بووم کە ئاگام لە هیچ نەبوو!

ـ لە چی تورە بووی؟

- دەگەڵ خێزانەکەمان کێشەم هەیە, یانی دەگەڵ بابم!

- بۆچی؟

- تۆ خوێندکاری زانکۆی؟

- دەچم بۆ دەرسی کونکوڕ, ئەوساڵ دەبێ بەشداری کونکوڕ بکەم, تۆ چی؟!

- چەند ساڵێکە, بەکالۆریۆسم هەیە! جا کێشەکەش هەر لێرەدایە! یانی بابم زۆریم لێ دەکا کە هاوسەرگیریی بکەم. یەك دوو کچی بۆ هەڵبژاردووم بەڵام من حەزم پێیان نایەت. یانی هەردوو کچەکە جوانن, بەڵان دەگەڵ من نایەنەوە!

- ئێ مادام بۆچی بۆخۆت کەسێکی گونجاوی خۆت نابینیەوە؟

- من زیاتر دەگەڵ ئەوەم کە ئەو جۆرە ناسینانە, دەبێ سوتفە بێ, یان وەك قسمەت! هەر چەند کە کەمێك خوڕافیانە دێتە بەرچاو, بەڵام من باوەڕم پێیەتی!

- ئێستا ئیشت چییە؟

- بابم لە لایەنی مادییەوە حاڵی باشە. فرۆشگایەکی گەورەی ئەشیای ئەندازیاریی هەیە. حەز دەکا منیش بچمە ئەوێ سەرقاڵ بم, بەڵام من حەز ناکەم! نایەوێ بێ ئیش بم.

- ئێ ئەوە بیرۆکەیەکی باشە, بەڵام کارێکی دیکەت لە مێشك دایە؟

- ڕاستی, ناوم سوهەیلە. ببورن کە خۆم نەناساند!

- ناوی منیش ئەفسانە.

- زۆر خۆشحاڵم بە ناسینتان, هەرچەندە کە دەستپێکەکەی باش نەبوو, بەڵام...

(( سوڕا سەیرێکی کردم و گوتی))

- من جاریێ وێنە دەکێشم! ئاوا کەمێك کوڵی هەستەکانم کەم دەکەمەوە! لە ڕاستی دا دەگەڵ ڕەنگەکان و تێکەڵ کردنیان بە جۆرێك قسە دەکەم.! دەگەڵ خەڵك! لەگەڵ گوێگرەکانم!

- چەند خۆشە!؟

– حەزتان بە وێنە دێ؟

- زۆر زۆر!

– منیش زۆرم خۆشدەوێ. بە تایبەت ئەو کاتەی دەچمە شیمال, ڤێلاکەمان! لەوێ بە سەعات لە کەنار دەریا دادەنیشم و وێنە دەکێشم!

ـ بەڕاستی نایابە! تا ئێستا پێشانگاتان کردۆتەوە؟

– نا! هەواداراانی من, یانی ئەوانەی لە زمانی ئەو هونەرە تێدەگەن, زۆر کەمن!

ـ کەواتا دەبێ کارەکەت زۆر قورس و پلەی باڵا بێ!

– بیرۆکەکانمن! هەر بە تەنیا ئەوەندەش نییە, دەگەڵ هەندێ لە هاوڕێیانم, خەریکین لەسەر ئەلبومێکی گۆرانی کار دەکەین! تەقریبەن ساڵێك دەبێ. ئاوازەکان خۆم دایاندەنێم.

ـ بەڕاست؟! کەواتا تۆ بە تەواوی مانا, هونەرمەندی!

– من بەو شێوەیە هونەر لێك دەدەمەوە, هونەر کاتێك هونەرە کە خەڵك قبوڵی بکات! بێجگە لەو دەبێتە کار, کارێکی ئاسایی!

ـ بەهەرحاڵ, ئەوە زۆر گرنگە! هەم وێنەکێش و هەم مۆسیقار!

– سوپاس! ببورن! ڕاستەوڕاست بڕۆم؟

ـ بەڵێ. تکایە لە چوارڕیانەکە بە لای ڕاست دا بادەوە.

(( لە چوارڕیانەکە بە دەستە ڕاست دا بایدایەوە و گوتم))

ـ چوارڕیانی داهاتوو بۆ دەستە چەپ و دواتر ڕێك بڕۆن.

– باشە. پێت وایە لە زانکۆ وەربگرێی؟

ـ لەوانەیە.

– هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم. ئەرێ لە بیرم چوو, ئەگەر ویستت لە چۆنیەتی وڵامدانەوە, دەتوانم یارمەتیت بدەم!

- سوپاس!

– بەڕاستمە! من خۆم بە ڕەوشێکی ئاسایی, لە زانکۆ وەرگیرام. زۆر ئاسان. ئەگەر بتانەوێ فێری ئێوەشی دەکەم! بەو شێوەیەش کە باسی کونکور دەکەن سەخت نییە. مرۆڤ دەبێ بزانێ چ بکات!

- زۆرم بیستووە ئەو قسەیە دەکەن! تەنها زانیاریی بەس نییە. دەبێ چۆنیەتی وڵامدانەوەکەش بزانێ!

– ڕێك بەو شێوەیە!

- ئێستا لەگەڵ باب و داکت دەژی؟

– بەڵێ بەڵام سەربەخۆ. ماڵێك لە نهۆمی کۆتایی هەمان باڵەخانە. باڵەخانەکە هەموو هی بابمە. سێ نهۆممان بە کرێ داون, نهۆمی دووەم و سێیەم و چوارەم. بابم و ئەوان لە نهۆمی یەکەمن و منیش نهۆمی کۆتای کە ماڵەکەی پەنجا مەترییە! هەرچەندە شوێنی کارەکەم جێگەیەکی دیکەیە! باڵەخانەیەکم بەکرێ گرتووە لە نزیك شوێنی کارەکەم!

- ژیانێکی سەربەخۆ, ها؟

– نا! بەو شێوەیە نا! زیاتر بۆ ئەوەیە کە بە تەنیا بم! بۆ ئیش! بۆ بیرکردنەوە! دەزانی چی؟! من هەموو کات حەزم لێ بووە کارێکی نایاب بکەم! چی پێ دەڵێن؟! ئاسودەییەك, ئاسودەییەکی نوێ! داهێنان! دەزانم کە سەردەکەوم, بەڵام دەبێ قۆناغێك تێپەڕێنم. مەرحەلەی سەرەتایی! ئەو مەرحەلەیەی کە هەموو ئێمەی مرۆڤەکان تێیداین! دەبێ لەو ڕۆژە مردووە تێپەڕین! لەو چەق بەستووییە و بە دەوری خۆدا سوڕانەوە! پێم وابێ ژیانی ئەوبەر هەمووی وایە! لە ڕەهەندێکی دی دا! لەو ڕەهەندە دا, هەندێك شت هەن, کە مرۆڤە ماددیی و سادەکان لێی بێخەبەرن و نازانن کە بوونی هەیە! بۆ گەیشتن بەو پلەیەش, دەبێ

پێش لەشمان بکەوین! دەبێ جەستەمان بەجێ بێڵێن و بۆپێشەوە بڕۆین! نابێ خۆمان ئەسیری ئەو خەیاڵ و وەهمانە بکەین! ئەو وەهمانەی کە هەموو ڕۆژ پێمان وایە دەبنە ڕاستی. وەلێ تەنها وەهم و ((یۆتۆپیا))ن. وەکو ئیشکردن. دەرس خوێندن! قسەکردنی پڕوپوچ لەگەڵ ئەوانی دی! یەك جۆر دیتنی هاوڕێیان و تەواوی ئەو کارانەی ئێستا خەڵکی خەریکن دەیانکەن! وەك باوکی خۆم, وەك دایکم!

بابم وەکو تەواوی ڕۆژانی دی دەچێتە فرۆشگا, شتەکانی پێشتر دەفرۆشێ و بە جۆرێك پارەکەی وەردەگرێ و وەك هەموو ڕۆژەکان, پارەکە دەخاتە بانقەوە و دواتر فرۆشگاکە دادەخات و وەکو هەر جارێ دێتەوە ماڵێ!

ئەوی دیش هەر دووبارە و دووبارە! دایکیشم هەر وا! ئەویش بەیانیان کە هەڵدەستێ, پێی وایە ئیشێکی بەسود جێبەجێ دەکات و دەبێتە سودمەندێکی سەمەرە!

دڵی بەو خەیاڵانە خۆشکردووە! لە کاتێك دا من وای دەبینم کە تەنها بەرنامەیەك جێبەجێ دەکات. وەکو شریتێك, کە هەر تەواو نابێ و وەك چۆن دەسوڕێتەوە و شتەکان دووبارە دەکاتەوە و پێشانیان دەدات!

خۆ تێدەگەن دەڵێم چی؟!

(( ڕاستییەکەی نیوەی قسەکانی زیاتریش تێنەگەیشتم, بەڵام گوتم))

- وایە! هاوڕام لەگەڵت! من هەموو کات وا فکر بۆ خۆم و خێزانەکەشم دەکەمەوە, بەڵام بۆخۆم دەڵێم لەوانەیە هەڵە بم و ژیانی من هەر ئەوە بێت!

- نا! نا! هەڵە ناکەی! ڕاستییەکەی هەر ئەوەیە کە تۆ درکت پێ کردووە! چەندە نایابە؟! چەندە خۆشحاڵم کە ئێوەم ناسی؟! ئێستا بەهەرحاڵ, تۆ بیرکردنەوەت زۆر لە هی من نزیکە!

ـ ئەو شریتەی کە خەریکن ئامادەی دەکەن چۆنە؟

– زۆر تایبەت! جیاواز لە هەموو ئەو کاسێتانەی کە ئێستا لە بازاڕ هەن. دەزانی چی؟! ئێستا گۆرانییەکان هەموویان یەکن! کاتێك گوێ لە هونەرمەندێك دەگری, وەك ئەوەیە گوێت لە هەمووان گرتبێ! بەڵام ئەو ئەلبوومە هەمووی جیاوازە!

ـ ناوی چییە؟!

– ئالیاژ[1].

ـ ئالیاژ؟!

– بەڵێ! ناوی خۆی بە خۆ وەیە! لەوانەیە ڕۆژێکیش بیهێنم گوێی لێ بگرن, بەڵا ئێستا تەواو نەبووە!

ـ ئێرە باشە!

– چی؟!

ـ گەیشتین! ئەوە ماڵی ئێمەیە.

– ئەهاا! ببوورن! ئاگام لێ نەبوو! ئەسڵەن ئەو چەند ڕۆژە ئاگام لە خۆم نییە! ون بووم.

(( لەپێش ماڵێمان ڕایگرت.))

ـ هونەرمەندان هەموویان وان!

– ناوەڵا مەسەلە ئەوە نییە! من ئێستا لە مەرحەلەی هەستیاری کار و ژیانم دام! خۆم دیتۆتەوە! دەبێ بزانم کێم و دەبێ چبکەم! پێویستم بە یەکێکە قسەی دەگەڵ بکەم! لەگەڵ یەکێك, کە لە قسەکانم تێبگات و درك بە فکرم بکات. یەکێك

[1] ئالیاژ: تێکەڵاوی دوو یان چەند کانزایەکە, یان کانزایەك دەگەڵ ناکانزایەك دا وەکو( برنج و پۆڵا ).
(( فەرهەنگی دانشگاه )) ماجد مردوخ روحانی

وەك خۆم! دەبێ وەکە من بێ و وەك منیش بیر بکاتەوە! بشبوورن سەری ئێوەشم هێشاند! حەتمەن پێتان وایە من شێتم!؟

ـ نا ئەسلّەن!

– نازانم بۆ ئەوەندە حەزم لێیە دەگەڵ تۆقسە بکەم. لە کاتێك هونەری قسەکرنیش نازانم. یەکێك لە ناڕەحەتییەکانی بابم هەر ئەمەیە! دەڵێ: تۆ خەڵك لە خۆت دوور دەخەیەوە! ڕاست دەکا! ئەوە ساڵێك زیاترە خێزانەکەمم نەدیووە! سێ مانگ لەمەوبەر خوشکەکەم دیتووە تا ئێستا!

ـ مەگەر خوشکەکەت لەگەڵ باب و دایکت ناژی؟

– نا, مێردی هەیە. منیش کە سێ مانگ لەمەوبەر گەڕامەوە لە ئێران هەر ئەوم دیت!

ـ بۆ لە ئێران نەبووی؟

– نا, چەند مانگێك لە فەڕەنسا بووم. نازانم بۆهاتمەوە ئێران! لێرا ناتوانم دەگەڵ کەس ((match))[1] بم. بە دەردی کابرا دەڵێ کۆدەکەم لە زۆران ئیش ناکا! زۆریش فشەیان بەو جۆرە بیرکردنەوانە دێ!

ـ ئێ لەبەر ئەوەیە تێیناگەن! وە نایانەوێ بیسەلمێنن کە تێناگەن! هەر بۆیە فشەیان پێ دێ! ئێمەی مرۆڤەکان, کاتێك دەگەڵ یەکێك ئاشنا دەبین, کە لە بەرانبەر دا هەست بە نەزانی دەکەین, خێرا گاڵتەی پێ دەکەین! بۆ ئەوەی عەیب و عاری خۆمانی پێ داپۆشین و پەردەپۆشی بکەین!

(( ڕووی تێکردم و بە نەرمی گوتی))

[1] Match: گونجان, هەڵکردن.

- ڕێك بەو شێوەیە کە باسی دەکەی! تۆ لەو مەسەلە تێگەیشتووی! ئەوە زۆر گرنگە! نایابە! من هەر کات لە بارەی باوەڕی خۆمەوە دەگەڵ بابم قسە دەکەم, لە کۆتایی دا بە گاڵتەپێکردنی من کۆتایی دێ و منیش پێی ناڕەحەت دەبم!

ـ مرۆڤەکان خەتا بار نین! دەبێ بە پێی پێویست تێکەڵیان بی! زیاتر نا! تۆش نابێ لەگەڵ هەموو کەس باسی فکر و ئایدیاکانت بکەی. سەرتان لێ دەشێوێ!

- ئەوە تۆ چۆن تەواوی ئەو شتانە دەزانی؟! ئەو شتانەی کە زۆر خەڵك هەر لێیان تێ ناگا. تۆ جیاوازیت زۆرە دەگەڵ ئەوانی دی!

ـ من لە قسەکانی تۆ تێدەگەم, چونکە ئایدیاکانی خۆم زۆر لە هی تۆ نزیکن!

- دەتوانم زیاتر تۆ بناسم؟! یانی دەتوانم دیسان تۆ ببینم؟!

ـ لەوانەیە!

(( خێرا لە داشبڵی ماشێنەکەی وەرەقەیەکی دەرهێنا و ژمارە تەلەفونەکەی نووسی و وێیدام و گوتی))

- هەر کات بۆتان لوا, تەلەفون بۆ ئەو ڕەقەمە بکەن! خۆشحاڵ دەبم! زۆر حەز دەکەم زیاتر لەگەڵ ئێوە قسە بکەم. هەر هیچ نەبێ بۆ ئەوەی بتوانم قەرەبووی ئەو کارەی ئەوڕۆ بکەمەوە!

(( شمارەکەم لێ وەرگرت و خوا حافیزیم لێ کرد و دابەزیم. ئەویش پێی لێ نا و ڕۆیشت.

یەکەمین ئامانجم دیتبۆوە! ئامانجی ئەسڵی! گەنجێکی دەوڵەمەند و قۆز و کەمێکیش گێل! بۆ من نایاب بوو! باشترین سات! ئەو بەدوای کەسێك دا دەگەڕا کە گاڵتەی پێ نەکات! منیش بە دوای کەسێك کە ئیدی مەجبووری ئەو گەنجە حەڤدە هەژدە ساڵانە نەبم بە پێ لەگەڵیان ڕێ بکەم و پیاسە بکەم و پارەی دوو مانگیان خڕ بکەنەوە تا هەدیەیەکم بۆ بکڕن!

بەوپەڕی خۆشحاڵی و پێکەنینەوە لە زەنگم دا و چوومە ژوور, هەتا شوکا دەرگای کردەوە, ڕێك خۆم لە باوەشی هاویشت و گوتم))

ـ شوکا پەیدام کرد!

– چیت پەیدا کرد؟! چ خەبەرە؟!

ـ ئەوەی کە بەدوای دا دەگەڕام!

– بەدوای چیدا دەگەڕای؟!

ـ شازادەیەك بە ئەسپێکی سپییەوە! نا! ئەسپێکی خۆڵەمێشی!

– چی؟!

(( زۆر بە پوختی بابەتەکەم بۆ باس کرد کە گوتی))

– ئاگاداربە ئەفسانە! ئەوە جیاوازە لەوانی دی هاا!

ـ هەموویان وەك یەکن! ئەوەش هەر وەك ئەوانی دیکەیە, تەنها کەمێك گەورەتر!

– نا! ئەسڵەن بەو شێوەیە نییە! جارێ بڕۆ جلەکانت بگۆڕە تا پێت بڵێم!

(( خێرا چووم جلەکانم, کە قوڕاویی ببوون دانان و لە سەللەم هاویشتن و جلێکی دیکەم دەبەر کرد. چوومە چێشتخانە کە شوکا دوو فنجان قاوەی لەسەر مێزەکە دانا بوون و بۆخۆشی دانیشتبوو تا من بێم. تا گەیشتم گوتی))

– تەمەنی چەندە؟!

ـ تەقریبەن بیست و چوار پێنج!

– چاو لێکە ئەفسانە! ئەوە ئیدی ئەو کوڕە حەڤدە هەژدە ساڵانە نییە هاا! با پێت بڵێم! ناکرێ وەك ئەوانی دیکە هەڵسوکەوت دەگەڵ ئەوە بکەی! ئەوان تازە سەریان لە هێلکە دەرهێناوە و لە هیچ تێناگەن و زوو کەر دەبن, بەڵام ئەوە نا! دەبی! ئاگات لە خۆ بێ!

ـ ئاگام لە خۆیە!

- نا ! نييە ! ئەوەيان دەزانێ چ دەكات !

ـ من لەو باشتر دەزانم چ بكەم !

- من دەترسم ئەفسانە ! ئەگەر خوا نەكا بەڵايەكت بەسەر بێ چى؟! چ جوابى بابت دەمەوە ؟!

ـ خەياڵت ئاسوودە بێت, من لە كارەكەم شارەزام!

- ئێستا كەى ديدارتت لەگەڵ داناوە ؟!

ـ جارێ مەوعيدم دانەناوە, شماركەى داومێ. يەك دوو ڕۆژى دى تەلەفوونى بۆ دەكەم.

- لەبيرت بێ, تۆ يەكەمين كچى ژيانى ئەو نى !

ـ يانى دەڵێى وازى لێبێنم؟ !

- نا نا ! بەڵام شل مەبە بۆى! خۆت مەدە دەستى !

ـ نە بابا ! خۆ كەر نيم !

- لەوانەيە كوڕێكى باش بێت, ئەوكات ئەگەر زيرەك بى, دەتوانى هاوسەرگيريى دەگەڵ بكەى! ئەگەر بەو شێوەيەى كە دەڵێى گێل و سادە بێت, بە ئاسانى دەتوانى ببيە هاوسەرى! بابيشى ئەوە لە ڕووى دارابييەوە كاملە !

ـ گوتم كەمێك گێلە , خۆ شێت نييە !

- باشە ! بە قسەى خۆى ئەو بەدواى يەكێك دا دەگەڕێ كە هەستى پێ بكات و لێى تێبگات ! ئەگەر بە دڵى وى بجوڵێيەوە , ئاشقت دەبێ !

ـ جارێ با بزانين !

(( بۆ دووبەيانى تەلفونم بۆ كرد.))

ـ ئەلوو! بەڕێز سوهەيل؟ !

- بەڵێ؟ !

ـ سلاو. منم, ئەفسانە!

– ئەفسانە؟! ئەهاا! سەلام سەلام. حالتان چۆنە؟

ـ سوپاس! چاوەڕێتان نەدەکرد؟!

– بۆ نا؟! بۆ نا؟! ڕاستییەکەی سەرقالْ بووم و ئاگام لە دنیا نەمابوو!

ـ کەواتا لە کاتم گرتوون.

– نا, ئەسڵەن! لە کوێی؟

ـ مالێ.

(( هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی))

– دەلێی چی نانێك بخۆین لە چێشتخانەیەکی نایاب؟!

ـ ئیشەکەتان چ لێ دێ؟

– جارێ گەیشتوومە شوێنێك کە ناتوانم زیاتر بڕۆم, سەعاتێکی دی باشە بێم بەدوات دا؟!

ـ بەڵێ باشە.

– کەواتا لەپێش دەرگاتان..!

ـ باشە, جارێ خوا حافیز.

(( تەلەفوونەکەم داخستەوە و چووم خۆم ئامادە بکەم. شوکا دڵی زۆر شڵەژا بوو! کاتێك دیتی وا بە خێرایی کارەکانم دەکەم گوتی))

– ئەفسانە, نەچیە مالێ لەگەلی هاا!

ـ بچمە مالێیان چبکەم؟!

– لەناکاو لە خشتەت دەبات و دەتباتە مالێ!

ـ نا, پێم وانییە لەو کوڕانە بێت! تەنها بڕیار وایە نانی نیوەڕۆ بچینە دەرێ.

– کەواتا زوو بگەڕێوە!

- چی بە بابم دەڵێی؟

– ئەویان کێشە نییە ! دەڵێم بەدوای کتێب دا ڕۆیشتووە ! بۆخۆم دڵم تەنگە !

- با تەنگ نەبێ, چەندە ترسنۆك بووی؟ !

– ئەو عەترە بەخۆت بکە, ڕۆمانسیی ترە !

- ئاڕایشەکەم باشە؟

– ئا, بەڵام کە هاتییەوە لە گەراجەکە خاوێنی کەوە ! لەوانەیە ئەوڕۆ بابت زووتر بێتەوە !

- نەهێڵی بێتامی بکات ها!!

– نا, خەیاڵت ئاسوودە بێت. تەنها زوو بگەڕێوە.

(( تەقریبەن سێ چارەگ دواتر ئامادە بووم و چوومە پشت پەنجەرە کە چەند دەقیقەیەك دواتر سەیارەی سوهەیل گەیشت. لە پەنجەرەوە بە دەست ئیشارەم بۆ کرد و ماڵئاوایم لە شوکا کرد و چوومە خوارێ. هەر کە چاوی پێم کەوت, فیتوویەکی هێواشی لێ دا و گوتی))

– چەندە جوان بووی!

- سوپاس.

(( دواتر دەرگای بۆ کردمەوە و منیش سوار بووم و وەڕێکەوتین. هەندێك ڕۆیشتین کە گوتی))

– زۆر کاتێکی گوجاو تەلەفونت بۆ کردم!

- بۆچی؟

– ئەگەر هەر ئەو کاتە تەلەفونت نەدەکرد, ناونیشانێکی هونەریم لەناو دەبرد !

- بۆچی؟ !

– هەندێ جار ئاوام لێ دێ! دەگەڵ ئیشێك خۆم خەریك دەكەم و خەریك دەكەم, دوایی ڕقم لێ دەبێتەوە و تێكی دەدەم!

ـ نابێ ئاوا بكەی!

– ئێ بەدەست خۆم نییە!

ـ ئەمان لە دەست ئێوە هونەرمەندان! بێ حەد ئاڵۆزن!

– ئەفسانە!

(( دوای سەیرێكی كردم و گوتی))

– دەتوانم بە ئەفسانە بانگت كەم؟! یانی ئیجازەم دەدەی كەمێك گەرمتر بم دەگەڵت؟

ـ حەتمەن!

– دەڵێم مەگەر تۆ تەمەنت چەندە؟

ـ بۆچی مەگەر؟

– قسەكردنەكەت بە پێش زانكۆیی ناچێ! یانی جۆری بیركردنەوەت زۆر لەوە زیاتر خۆیا ئەكا!

ـ دەتەوێ هەویەكەت پێشان دەم؟!

– هەر بەڕاست هەژدەساڵی؟!

ـ ئەرێ!

– وەلێ وەك خوێندكاری زانكۆی مەرحەلە سێ و چوار قسە دەكەی و بیر دەكەیەوە!

ـ مەمنون!

– ئێ, تۆ شوێنێكت پێ شك دێ بۆی بڕۆین؟ چێشتخانەیەك, شتێك؟!

ـ نەوەڵڵا!

- مادام دەچینە ئەو چێشتخانەی کە من هەموو دەم دەچم. خواردنەکەی نایابە !

((تەقریبەن نیو سەعات گەیشتینە بەردەم چێشتخانەکە...و سوهەیل ماشێنەکەی لە شوێنێك پارك کرد و دابەزین و چووینە ژوور. چێشتخانەیەکی زۆر شاز بوو! جوان و شیك و نایاب, دەگەڵ خزمەتگوزار و خواردنی نایاب و بەلەزەت! لەپەسا بیرم لەو شوێنانە دەکردەوە کە دەگەڵ کوڕە هاوتەمەنەکانی خۆم دەچووم, پێکەنینم دەهات! ساندویچ فرۆشی, کافتریای چکۆلە! پیتزا فرۆشی! بەڕاستی پێکەنیناویی بوو! بەڵام لێرە و لەگەڵ سوهەیل شتێکی دیکە بوو!

بەکورتی دانیشتین و داوای خواردنمان کرد, کە سوهەیل گوتی))

- ئەتۆ بۆخۆت تا ئێستا کاری هونەریت کردووە ؟

ـ نا, نەگونجاوە !

- بۆچی تاقی ناکەیەوە ؟

ـ پێم وانییە بتوانم! دەبێ حەز و لێهاتوویت هەبێ! هونەر ئیشی هەموو کەس نییە !(نان بۆ نانەوا, گۆشت بۆ قەساب) تۆ تا ئێستا چەند تابلۆت کێشاوە ؟

- بیست سییەك, وەڵا نازانم !

ـ بیست سییەك زۆر زۆرە ! ئێ پێشانگایەك بکەوە !

- بیرم لێ کردۆتەوە, بەڵام دەترسم خەڵك نائومێدم کەن !

ـ یانی لێت نەکرن؟

- من ئامادە نیم بیانفرۆشم, ئەوان بەشێکن لە ڕوحی من !

ـ وەلێ زۆر لە هونەرمەندان ئەوە دەکەن! خۆ کارێکی خراپ نییە !

- من پێویستم بە پارەکەی نییە !

ـ خۆ مەسەلە هەر پارە نییە! تۆ کاتێك تابلۆیەکت بە کەسێك دەفرۆشی و ئەویش دەیباتەوە لە ماڵ هەڵیدەواسیٚ بە دیوار, لە ڕاستیی دا, بەشێك لە ئایدیا و بیری تۆی قبولٚ کردووە! ئەوە زۆر گرنگە!

– وە ئەگەر کەسێکیش نەیکڕیٚ؟

ـ گرنگ نییە! بیر و فکرەکانت لە کن خۆت دەهێڵیەوە! نەکڕینی تابلۆیەکی وێنە, هۆکاری بەکەڵك نەهاتنی نییە! بەڵام دەکەوێتە سەر کردنەوەی شوێنی پێشەنگاکە, یان ئەو خەڵکەی کە بۆیان دەکەیەوە! فکرێکی باش, کاتێك بەڕاستی ئەنجام دەدرێت, لەوانەیە لە ڕوانگەی هونەرمەندەوە, جێگەی ڕەزامەندیی نەبێت. ئەوە مەسەلەیەك نییە! دەبیٚ لە شوێنێکی دیکە و جێگەیەکی دی و بۆ خەڵکانێکی دیکەی عەرز کەی! بێجگە لەو, ئاسارێکی هونەریش دەبیٚ لەو نێوەدا بێت بۆ ئەوەی نرخی خۆی پەیدا بکات!

– ئەفسانە! من تا ئێستا ئاوا بیرم لیٚ نەکردبۆوە! ئەوە زۆر سەیرە کە تۆ زۆر بە ئاسانی توانیت لە ڕوانگەیەکی دیکەوە تەماشای بابەتەکە بکەی!

((پێکەنیم و گوتم))

ـ هونەر زمانێکە! دەبیٚ بزانی کە لە کوێی ئەو دونیایە, خەڵکەکەی بەو زمانە قسە دەکەن و بیر دەکەنەوە! کاتێك دەیانبینیەوە, هەست بە ئارامیی دەکەی!

((دووبارە سەیری کردم و گوتی))

– لە پشت پەردەوە خەریکە سوپڕایزم دەکەی!

(( دواتر مژێکی لە سیگارەکەی دا و گوتی))

– جارێکیان کە خەریك بوو دەگەڵ کچێك هاوسەرگیریی بکەم, لەگەڵ خۆم بردمە شوێنی کارەکەم! لەویٚ ڕووبەڕووی شتێك بوومەوە کە لە جەڵتە خراپتر بوو بۆم. هەر تابلۆیەکم کە نیشان دەدا, شتێکی گاڵتەجاڕیی دەگوت و پێدەکەنی. وەك

فلام كارتۆنێك ببينێ وا بوو. ئەوەندە لێی بێزار بووم, كە ڕاستەوخۆ هەموو بەرنامەكانم لەگەڵی تێك دا.

ـ هەڵەی تۆ ئەوەیە كە چاوەڕێی زۆر شت لە خەڵك دەكەی! لە خەڵكی سادە و ساكار, چاوەڕێی شتی سادەو ساكاریش دەكرێ!

(( جگەرەكەی كوژاندەوە و گوتی))

— دەمەوێ دان بە شتێك دا بنێم بۆت!

(( سەیرم كرد, كە سەری نەوی كرد و گوتی))

— تا ئێستا هیچ كەسێك حەزی بە ئیشەكانم نەهاتووە!

ـ یانی چی؟!

— هەر كەسێك تابلۆكانمی دیتووە, بە شێوەیەك دەریخستووە كە ئەوانە, كاری هونەریی نین!

ـ ئێ, لەوانەیە بەڕاستیی نەبن!

(( هەڵوەستەیەكی لەسەرم كرد و گوتی))

— مەبەستت چییە؟

ـ ئەگەر تۆ چاوەڕێی كە خەڵكی, تا پێت بڵێن هونەرمەندی, دەبێ سەبر بگری و هەوڵ بدەی! سەبر بۆ ئەوەی پوختەتر بی و هەوڵیش ئەوە ڕوون و ئاشكرایە!

— چۆن پوختە بم؟! تۆ هێشتا جۆری ئیشی منت نەدیوە! لەوانەیە وا بیر بكەیەوە كە وەكو كەمال و مەلیك و ئەوانی دی وێنە دەكێشم؟! ئەگەر وا بیر دەكەیەوە, ئەوە پێت دەڵێم زۆر هەڵەی! ئیشەكەی من واش نییە كە پێویستی بە پوختە و شتی وا بێت, بۆ نموونە شێوەی پرتەقاڵ یان سێوێك جوانتر بكێشم!

ئیش و كاری من جۆرێكە كە دەبێ بینەر, خۆی ئەو شتانەی كە دەیەوێ, لە تابلۆكانم دا بیانبینێتەوە.

ـ کەواتا سەداسەد بینەری کەمترت دەبن!

(( سەری ڕاوەشاند کە گوتم))

ـ ناکرێ پێش دیتنی کارێکی هونەریی, قسەی لە بارەیەوە بکەی و بیهێنیە بەرچاو, بەڵام شتێك دەزانم! لەوانەیە کارێکی هونەریی, لە دیدگای هونەرمەندەوە بێ کەموکوڕی بێ, هەتا لەوانەیە لە کاتی خۆشیدا هەر وا بێ!

– تێناگەم!

ـ چاولێکە! بۆ وێنە خەییام! هەر چەند کە شاعیر نەبوو, بەڵام ئەوەندە شیعرەی کە گوتویەتی, خۆ لە کاتی وی دا کەس لێیان تێنەدەگەیشت! بەڵام دواتر, واتا دوای چەند ساڵێك, خەڵك وردە وردە لە لە مانای قسەکانی گەیشتن! زۆرێك لە هونەرمەندانی ئێمە ئاوا بوون! بگرە هونەرمەندی بێگانە! کەواتا تۆ نابێ چاوەڕێی ئەوە بی کە ئەو دارە, هەر ئەمساڵ میوە دەر بکات! دەبێ سەبر کەی و هەوڵ بدەی!

(( خەریك بوو جگەرەیەکی دی پێبکات, کە خواردنیان بۆ هێناین. ئیدی هیچی نەگوت و پێکەوە نانەکەمان خوارد. نەمدەزانی تا ئێستا ڕاست ڕۆیشتووم یان هەڵە. تا ئێستا لە ڕەوشتی نەگەیبووم تا بزانم چۆن هەڵسوکەوتی دەگەڵ بکەم. دەبوو ئارامتر بەرەو پێشەوە بڕۆم!

کە خواردنەکە تەواو بوو, ڕاستەوخۆ داوای حیسابەکەی کرد و پارەی خواردنەکەی دا و پێکەوە هەستاین و چووینە دەر. سواری سەیارە بووین و وەڕێ کەوتین. چەند دەقیقە دواتر گوتی))

– ئەوە دەڕۆین بۆ کارگەکەم! دەمەوێ کارەکانمت پێشاندەم!

(( ڕاستییەکەی کەمێك ترسام, بەڵام سوهەیل ئاگای لە هیچ نەبوو. ئەو هەر فکری لەسەر کارەکەی بوو. دەتگوت چۆتە دونیایەکی دی! لەوانەیە لەو کاتەدا منی هەر نەبینیبێ. لەوانەشە بە چاوی پسپۆڕێکی هونەریی تەماشای منی دەکرد!

کارگەکەی هەر لەو نزیکانە بوو. لە شوێنێك لەناو باڵەخانەیەکی زۆر کەشخە, لە سەرووی شارەوە! بیست دەقیقەی پێ نەچوو, کە گەیشتینێ و دابەزین و چووینە ژوورێ. باڵەخانەیەکی سەد, سەد و بیست مەتری بوو. بەتاڵ و حەتاڵ! تەنها پڕ بوو لە تابلۆ و سێپایە و چوارچێوەی وێنەکێشان. قەنەفێك لە گۆشەیەك و چەند کورسی و مێزێکیش لە تەنیشتییەوە. لە چێشتخانەکەشی دا, گازێك و سەلاجەیەك و هەندێ قاپیش. هەر ئەوەندە! عەرزی باڵەخانەکە کاشیی بوو و بەس! دەرگای ژوورەکانیش قفڵ بوون و دیار نەبوو لەوێدا چۆنە!

پێکەوە چووینە ناو باڵەخانەکە, کە لە پشتەوەڕا دەرگاکەی قفڵ دا و چوو لەسەر قەنەفە دانیشت و جگەرەیەکی پێکرد و گوتی))

- دەست پێبکە! هەر چەندە دەتەوێ کات هەیە! من هیچ پەلەم نییە! یەك یەك تەماشایان بکە و ڕای خۆتیان لەسەر بڵێ!

(( پێی پێکەنیم و گوتم))

- دیسان ڕای خەڵکت ویستەوە!

- نازانم! نازانم! هەر کارێك کە دەتەوێ بیکە! ڕای خۆت بۆم دەر نابڕی دەری مەبڕە!

(( ماندوو دیار بوو و تووڕە! چوومە بەردەم یەکەم تابلۆ! تابلۆ کە نا! هێشتا زۆرینەیان هەر ئەو چوارچێوە وێنانە بوون, بێ چوارچێوە, هەندێکیان لەسەر سێپایە و هەندێکی دی لە تەنیشت دیوار, لەسەر زەوی و چەند دانەیەکیش لەسەر مێز, لەسەر یەك دانرابوون!

یەکەمین تابلۆم کە دیت, وێنەی چەقوویەکی ژەنگاویی بوو کە نووکەکەی خوێناویی بوو و لە تەنیشتیشی وێنەی چوێلەکەیەك بوو کە سەریان بڕی بوو. دووەمین شتێك بوو هاوشێوەی مرۆڤێکی گۆج کە هەندێ پارەی لە تەنیشت بوو و لەکن دیوارێك ڕاوەستابوو, سوالّی دەکرد. لەوەش گرنگتر کولّاوێك بوو کە لە دەستی دا گوشرابوو. لەو کولّاوانەی کە کاتی تەواوکردنی زانکۆ, قوتابیان لەسەری دەکەن. تابلۆی سێیەمین وا وێ دەچوو کە چەند مشك و پشیلە و سەگێك بن, کە هەموویان کوژرابوون و لەسەر زەویی کەوتبوون! هەرچی چۆن بێ هەندێ شتی وەك مشك و پشیلە و سەگ بوون. وا خۆیای ئەکرد کە هەموو یەکدیان خواردووە! دەکرێ بلّێین چوارەمین وێنەی کچێك بوو کە پرچیان لە بنی ڕا تاشی بوو! پێنجەمینیش شێوەی سرنجێکی بەتالّ و چەند دەنکە شەمچەیەکی سووتاو و شتێکی وەك ژێرسیگار وا بوو. ئەوانی دیش هەر لەو بابەتانە بوون. تەقریبەن بیست و چوار پێنج تابلۆیەك بوون. بە هۆی ئەوەی کە بە خێرایش سەیرم دەکردن, بەلّام نزیك سێ چارەگی خایاند. سوهەیلیش هەر وا جگەرەی دەکێشا و سەیری دەکردم. دوای ئەوەی سەیری ئاخیر تابلۆم کرد, بە هێمنی چووم لەسەر قەنەفێك دانیشتم و بێدەنگ مامەوە. یەك دوو دەقیقە چاوەڕێی کرد و دواتر گوتی))

- ئێ؟!
- ئێ چی؟!
- ڕات چییە؟!
- بەو تابلۆیانەی کە دنیایان دە عازار ناوە!

(( ناوچاوانی تێکنا و گوتی))

- کەواتا تێنەگەیشتی؟

(( شانم هەڵتەکاندن و هیچم نەگوت. دیسان کەمێك چاوەڕێی کرد و گوتی))

- ئێ قسەکەت بکە!

ـ هونەرمەند دەبێ تاقەتی ئەوەی هەبێ کە ڕەخنەی لێ بگیرێ!

- هەمە بڵێ!

ـ دڵنیای؟

- بە دڵنیاییەوە!

ـ بە تابلۆکانت پەیامێکی جوانت گەیاندووە, بەڵام ناشیرن و تلّخ!

(( جگەرەیەکی دی پێکرد کە گوتم))

ـ ئەو شتانەی کە مرۆڤ دەیزانن, بەڵام نایەنەوێ لەبەر چاویان بێ و بەردەوام ببیبینن.

(( لە ناکاو پاڵی دایەوە و سەیری تابلۆکانی کرد, کە گوتم))

ـ من حەز ناکەم کەسێك یان شتێك, بێ فەرهەنگی و نەزانی و بێ تەعەسوبی و بێغیرەتی و کۆمەڵێك شتی دیکەشم بەسەر چاوان دا داتەوە. ئێمە هەموومان سەراپا عەیب و عارین, بەڵام لێمان دیار نییە و بیرمان دێنییەوە. هەر بۆیە بە ئاشکرا دیارە کە کەس حەزی بە ئیشەکەت نەهاتووە, چونکە زۆر کەم و کوڕییەکانیان بیر دێنیەوە!

کارەکەت باشە سوهەیل, وەلێ زۆر بێ شەرم و نا ڕێك قسە دەکەی!

(( سەیرێکی کردم و لەناکاو بە قاقا پێکەنی! پێکەنینێکی درێژ و تورە! دواتر لەناکاو دەستی کرد بە گریان! دەستی بە دەموچاوی وەنا و گریا! ئەوەندە ترسام کە نەکا وەدەست شێتێك کەوتبم؟!))

(( هێواش سەیرێکی دەرگای باڵەخانەکەم کرد, کلیلەکەی لەسەر بوو! خەیاڵم کەمێك ئاسوودە بوو و چووم لەسەر قەنەف لە تەنیشتی دانیشتم و گوتم))

ـ سوهەیل! سوهەیل!

(( بە دەستەکانی فرمێسکەکانی سڕینەوە و ئاوڕی لێ دامەوە و خەندەیەکی بۆ کردم! برژانگەکانی بەرز ببوونەوە و تەڕ ببوون, پێکەوە نووسابوون و دیمەنێکی جوانی پێ بەخشیبوو. بۆ لەحزەیەك هەستم کرد کە زۆرم خۆشدەوێ! هەم خۆشمدەویست و هەم هەستی دڵسوتاویم بەرابنەر پەیدا ببوو.

خەندەیەکی بۆ کردم و گوتی))

– سوپاس ئەفسانە! زۆر سوپاست دەکەم! بێڵە دان بە شتێکی دیکەشتدا بنێم! ئەو ڕۆژەی کە پێت ئاشنا بووم, پێم وابوو لەو قوتابییە کچۆڵانەی کە زیاد لە تەمەنی خۆیان هەڵیان داوە! سەرەتا پێم وابوو درۆیە دەکەی و تەمەنت زۆرترە, بەڵان ئێستا حاڵی دەبم کە زۆر لە تەمەنت تێگەیشتووتری و تێگەیشتنێکی باڵات هەیە! زۆر کچێکی جوانیشی! ئەسڵەن چاوەڕێی ئەو شتانەم لێت نەدەکرد, کە گوتتن!

(( دواتر ئاوڕی لە تابلۆکان دایەوە و گوتی))

– ڕاست دەکەی! دەمتوانی ئەو قسانە کەمێك نەرمتر بگەیەنم!

ـ سەبر و هەوڵدان! پوختەیی, یانی ئەو قسانە بە شێوەیەك بە خەڵکی بڵێی کە دڵیان هیچ نەڵێ!

– ڕاستە, دەبێ هەموو ئەوانە دوور خەمەوە!

ـ نا! ئەسڵەن! ئەوانە مێژووی نایابی تۆن, نابێ ئەو کارە بکەی!

– ئەو قسانەت بە ڕاستینە ئەفسانە؟!

ـ ئاشکرایە کە ڕاستینە! تابلۆیەکان زۆر جوان و پڕ مانان! تەنیا دەبێ کەمێك لەبارتریان بکەی! هەر ئەوەندە!

(( کەمێك سەیری کردم و گوتی))

- بریا ئەتۆم زووتر دیبا ئەفسانە! تۆ نازانی چ یارمەتییەکت داوم!

( بێدەنگی)

ـ هەمان ئەو هەینییە پێکەوە چووین بۆ شاخ. دەیەویست دەگەڵ چەند دۆستێکی پێکمان بناسێنێ. کاتێك لەسەر تەلەفون دەیویست ڕێکەوتێك دیاری بکا, پێم گوت: کە پێڵاوی شاخم نین. بەهانەم هێنایەوە کە ناتوانم جارێ بچم بکڕم. ژمارەی لاقی پرسیم و منیش کەمێك مەکر و ئەولا و لام کردن بە مەرجێك, کە دەبێ پارەکەم لێ وەرگرێتەوە, دەنا لە پێیان ناکەم و نایەم. هەرچی چۆن بێ ژمارەی پێم پێ گوت. دوو سەعات دواتر بوو, کە بەریدێك گەیشتە پێش دەرگا و پارچەیەکی بۆ هێنام. کاتێك بردمە سەرێ و کردمەوە, چبێ باشە؟! کەوشێکی گرانبەهای خاریجیی شاخ و عەترێکی نایابی بۆن خۆش و باو!

تێگەیشتم کە تا ئێرەی کارەکەم باش هاتووم. جوڵانەوەی مووروووەکانی شەترەنج ڕاست بوون. خولاسە بۆ هەینیی ڕێکەوتین و بە بابیشم گوت: کە دەگەڵ چەند هاوڕێیەکم دەچینە شاخ.

بەیانیی هەینی, بە شوکام گوت: ئاگای لە بابم بێ, نەکا لەناکاو چاو لە پەنجەرە بکات, چونکە سوهەیل ڕاستەوخۆ دەهاتە پێش دەرگای ئێمە! دواتر چوومە خوارێ کە چەند دەقەیەك دواتر هات. پاترۆڵێکی پێبوو. دەرگای بۆ کردمەوە و سوار بووین و وەڕێ کەوتین. لە ڕێ ئەو سەبارەت بە خۆی و ئیشەکەی قسەی دەکرد, کەمێکیش من قسەم دەکرد و هەندێکیش گوێمان لە شریت دەگرت, تا گەیشتین. چووینە گەراج و ماشێنەکەمان لەوێ ڕاگرت. موعیدی هەر لەوێ دەگەڵ دۆستەکانی دانابوو. هەندێ ئەولا و لامان کرد کە دەستی ڕاوەشاند و گوتی))

- ئەوەتان! با بچینە کنیان.

(( چاوم لەو شوێنە کرد کە پێشانی دام. تەقریبەن دە دوازدە کەسێك لە کوڕ و کچ ڕاوەستابوون. کەمێك کە لێیانەوە نزیك بووینەوە, توانیم تا ڕاددەیەك بیانناسم. تەقریبەی کوڕەکان هەموو وەك یەك بوون, واتا جۆری پۆشینی جلەکانیان. بەڵام کچەکان... !

دیار بوو کە هەموویان دەوڵەمەند بوون! چ جلێك! چ ئاڕایشێك! ئەو ئەنگوستیلە و ملوانکانە سەیرکە! ڕاستیەکەی شەرمم کرد بچمە کنیان. بەڵان بە ناچاری چووم. کاتێك گەیشتمێ, هەموو سەیریان دەکردم! نزیکەی سێ چوار ساڵ چکۆلەتر بووم لێیان. هەر بۆیە گوێم لێ بوو بە هێمنی یەکێك بە یەکی دی گوت " ئیدی دەبێ لە شاخ ئاگامان لە منداڵانیش بێ "! بەسەر خۆم نەهێنا و تۆقەم دەگەڵ هەمووان کرد و خۆم پێ ناساندن. هەموویان قوتابیی زانکۆی ئازاد[1] بوون. دوو سێیەك لە کوڕەکان خوێندنیان تەواو کردبوو و ئەوانی دیش ساڵی ئاخیری زانکۆیان بوو! هەمووشیان دەوڵەمەند!

خولاسە وەڕێ کەوتین. هەموو پێکەوە قسەیان دەکردن. قسە کە نا, زیاتر گاڵتەیان دەگەڵ یەکدی دەکرد و پێدەکەنین! دیار بوو کە پێکەوە گروپێکن و چاك یەکدی دەناسن. تەنها من لە نێویاندا تازە بووم, بۆیە منیش قسەم نەدەکرد. ڕاستییەکەی کەمێك دەترسام, کە نەکا شتێك بڵێم هەموویان پێم پێ بکەنن. ئاخر هەموویان تەلەبەی زانکۆ بوون و خۆم لەبەر چاوی ئەوان چکۆلە دەهاتە بەرچاو. چکۆلە و نەخوێندەوار!

لەنێو کچەکاندا یەکێکی تێدا بوو, کە لە هەمووان زۆر بڵێ تر و ناجسنتر بوو! هەر ئەو کچەی کە قسەی بە برادەرەکەی گوت لەبارەی منەوە! وەك چۆن دەچووینە سەرێ, جار جارەش توانجیان لە من دەدا! بۆ وێنە دەیگوت: مرۆڤ وا باشە پێنج

[1] زانکۆی ئازاد, ناوی یەکێکە لە زانکۆکانی تاران- ئێران.

شەممە ئەرکیماڵەوە بنووسێتەوە و هەینی ئیسراحەتی بۆ بکات, هەوای شاخیش بۆ منداڵان کە زۆر نایابە! ئەو قسانە و هەندێ گاڵتەی دیکەش, کە بێئەدەبانە بوون! هەرچەند منیش مرۆڤێکی زۆر موئەدەب نەبووم, بەڵام تا ئەو کاتە و لەناو کۆمەڵێکی ئاوا دا, لەو سۆعبەتانەم نەکردبوو!

لێی گەڕام هەرچی حەزی لێیە بیڵێت و گوێی خۆم نەدایە. تا ئەوەبوو گەیشتینە وێستگەی یەکەم و لێی تێپەڕین و گەیشتینە وێستگەی دووەم. ئەو شوێنەی کە نیسکێنە و ئاش و چا و ئەو شتانەی لێیە! کە گەیشتینە وێ, کوڕەکان هەر یەکەو لە کچێکی دەپرسی کە چی دەخوات یان چی دەخواتەوە, بۆ خۆی و بۆ ئەویشی وەردەگرت! سوهەیلیش بە منی گوت چت بۆ بێنم, کە ئەو کچە خێرا گوتی))

ـ پارچەیەك شیر و مەمکەمژەیەك!

(( دواتر کچەکان هەموو لە قاقای پێکەنینێیان دا, کە یەکێك لە هاوڕێکانی سوهەیل ئاوڕی دایەوە و گوتی))

- ساحێل! خەریکە بێتامی دەکەی هاا! شتێك مەکە کە بەرنامەکەمان تێك چێ!

(( کچەش پێی گوت))

ـ ئەوە پەیوەندیی بە تۆوە نییە!

(( لەناکاو هەموو کوڕەکان لە بەرژەوەندیی من دەستیان کرد بە قسەکردن))

ـ لەوەتەی وەڕێ کەوتووین هەر خەریکی تانە و تەشەری لێدەدەی ساحێل!

ـ زۆر کچێکی بەڕێزە کە تا ئێستا جوابی نەداویەوە!

ـ وەختێك جوابت ناداتەوە یانی چی؟!

(( خولاسە هەر یەکەو شتێکی پێ گوت! ئەویش هەر یەکەو جوابێکی دەدانەوە.

" ئەتۆ بێدەنگ بە! پەیوەندیی بەتۆوە نییە! تۆ تەداخول مەکە!"

کوڕەکانیش لێیاندا ڕۆیشتن! کەمێك لە سوهەیل تورە بووم, چونکە ئەو بێدەنگ بوو! منیش دەمارم گرتبوونی, بەڵام دەنگم نەکرد. سوهەیلیش چوو نیسکافەم بۆ بێنێ. کاتێك بەتەنیا ماینەوە لەگەڵ کچەکانی دی, ساحێل چەند هەنگاوێك چۆئەولاتر. منیش یەك دوو شەقاو لەوانی دی دوورکەوتمەوە کە یەکێك لە کچەکان هاتە کنم و گوتی))

– نارەحەت بووی لێمان؟

ـ نا, بەهیچ شێوەیەك!

– ببورن بەڵام لە نێوان ساحێل و سوهەیلدا شتێك هەبووە! ئەویش ئێستا نا قەدیم! هەر بۆیە ساحێل بەو شێوەیەی دەگەڵ ئێوە کرد!

ـ ئەسڵەن کێشە نییە!

– لە ئامادەیی؟

ـ پێش زانکۆ.

– تازە لەگەڵ سوهەیل یەکترتان ناسیوە؟

ـ چەند ڕۆژێکە.

– مرۆڤێکی سەیرە!

ـ ئێمە هەر یەکەمان بە شێوەیەك سەیرین!

– ڕاستە, بەڵام ئەو ڕەوشتێکی تایبەتی هەیە!

(( جوابم نەدایەوە کە گوتی))

– وا بڕیار بوو دەگەڵ ساحێل هاوسەرگیریی بکەن. بەڵام لەناکاو هەموو شتێکی تێك دا!

ـ حەتمەن هۆکاری بۆئەو کارە هەبووە!

– لەوانەیە! هەرچی چۆن بێ ئەو کارانە لە سوهەیل چاوەڕێ دەکرێن.

(( دیسان هیچم نەکوت کە گوتی))

- بەهەرحاڵ, هەرچییەك بێ من داوای لێبووردنت لێ دەکەم!

ـ مەمنوون, بەڵام خۆ گوتم کە ناڕەحەت نەبووم!

- کەوایە با بگەڕێینەوە کن ئەوانی دی!

ـ باشە, با بڕۆین.

(( ئیدی تێگەیشتم ساحێل هەمان ئەو کچەیە کە سوهەیل بۆی باس کردبووم. شتێکی دیش تێگەیشتم! ئەویش ئەوە بوو کە سوهەیل زۆر حەزی لە سۆعبەت و گاڵتە نەبوو و حەزی بەو کچانە نەدەهات کە گاڵتەیان دەکرد! حەتمەن لە بارەی تابلۆ و کارەکەیەوە دەمارگیرییەکی زۆری هەبووە کە ئامادە بووە لە بەرانبەریان دا, هاوسەرگیریی لەگەڵ کچێکی وا دا هەڵوەشێنێتەوە! ئەگەر چی لەسەر خۆ و هێمنیش بوو, بەڵام دەوڵەمەند و جوان دیار بوو و چاوپۆشیی لێ دەکرد. زانینی ئەو شتانە زۆر بۆم گرنگ بوو و دەمتوانی سوودیان لێ وەرگرم!

کەمێ دواتر کوڕەکان گەڕانەوە و هەموومان چووینە شوێنێکی چۆل و دەستمان کرد بە خواردن و قسەکردن. یانی ئەوان قسەیان دەکرد و گاڵتەیان دەکرد و پێدەکەنین, منیش گوێم گرتبوو لەناکاو کوڕێك کە سێ پەرداخ نیسکافەی بە دەستەوە بوون کە دەیویست بە کن ئێمەدا تێپەڕێ. پەرداخەکانی بە جوانی لە دەستی دا نەگرتبوون, هەر لەوێ لە پێش ئێمە یەکیانی لە دەستی بەربۆوە و کەوتە سەر زەوی, نیسکافەکە بە شێوەیەك ڕژابوو, کە پەڵەیەکی لەسەر عەردەکە دروست کردبوو!

کوڕەکە داوای لێبوردنی لە ئێمە کرد و ڕۆیشت. نیسکافەکە بە جۆرێکی سەیر ڕژا بوو. ساحێل چاوێکی لە عەردەکە کرد و وەك چۆن سەیری ئەوێی دەکرد, گوتی))

- سوهەیل! تۆ ئەو هەموو زەحمەتە دەکێشی, تا تابلۆیەکی هونەریی دروست بکەی, بەڵام ئەو کورە بێ ئەوەی بیەوێ و پێیەوە ماندوو بێت, بە ماوەی چرکەیەك تابلۆیەکی لە پێش چاوی ئێمە کێشا!

(( دواتر پێکەنی و بە دەست ئیشارەی بۆ زەویی کرد. هەموو سەریان بۆئەوێ وەرگێڕا. هەم هۆشم لە سوهەیل بوو و هەمیش لە ساحێل و لە زەویش. کە لەناکاو دیتم ڕەنگی سوهەیل خەریکە سپیی دەبێ. ئەوەندە ئەو گۆڕانکارییەی لێ دیار بوو, کە بە ئاسانی هەست پێ دەکرا!

تێگەیشتم زۆر ناڕەحەت و تورە بووە! هەموو بێدەنگ ببوون کە ساحێل گوتی))

- سوهەیل! ئەتو ئەگەر بەخۆت دەڵێی هونەرمەند, دەتوانی ناوی ئەو تابلۆیە بلێی؟!

(( دووبارە هەمان ئەو کوڕە گوتی))

- ساحێل لێی دەبڕییەوە یان نا؟!

ساحێل: دەمەوێ ڕای هونەرمەندێك وەرگرم, کارێکی خراپە؟!

(( لەناکاو شتێك بە مێشکمدا هات و منیش گوتم))

- حەرام بوون! خەسار بوون! ئەوە ناوەکەیەتی!

(( هەموو چاویان لەمن کرد!))

ساحێل: حەرام بوونی پارەی کوڕەکە!

- نا! کاتێك شتێك لە شوێنێك جێگیر دەکرێ کە ئی وێ نییە, لە ڕاستیدا ئەوە حەرام دەبێ. هەر وەك ئەو نیسکافەیەی کە ئێستا ڕژاوە و ناکرێ سوودی لێ وەرگری! وەك کارەکانی سوهەیل! کارەکانی لە شوێنێك پێشکەش کردووە, کە پەیوەندییان بەوێوە نییە! هەر بۆیە خەریکە خەسار دەبن!

ساحێل: تۆ لە وێنەکێشاندا پسپۆڕییت هەیە؟

ـ نا ! ئەسڵەن بڕیاریش وا نییە کە خەڵك لە هەموو بوارێکدا پسپۆڕییان هەبێ, تا حەزیان پێ بێ! بۆ وێنە کاتێك یەکێك گوێ لە گۆرانییەك دەگرێ, حەتمەن نابێ بۆخۆی هونەرمەند یان ئاوازدانەر بێ, تا حەزی بە گۆرانییەکە بێت! هونەر بۆ خەڵکیە ! خەڵکی سادە و ساکار! بەو مەرجەی بتوانن بە هەستیان پەیوەندییەك دروست بکەن, بێ ئەوەی ئازاریان بدات !

ساحێل: هەر بەڕاست ئەو شتانە لە زانکۆ فێری خوێندکاران دەکەن؟ !

ـ نا ! ئەو شتانە خەڵك لە ژیانەوە فێریان دەبێ! هەر لەو ژیانە سادەیە ! تێگەیشتن و درك پێکردن, پێویستی بە دەرس یان شوێنێکی تایبەت ناکا ! تەنها ئەوەندە بەسە کە مرۆڤ بیەوێ فێر ببێ !

(( لەناکاو کوڕەکان دەستیان پێ کرد ! ))

ـ ئافەرین !

ـ نایاب بوو !

ـ فێربە ساحێل !

(( ئاوڕم دایەوە و چاوم لە سوهەیل کرد ! ئیدی ڕەنگی ڕووخساری سپیی نەبوو و خەندەیەکیش لەسەر لێوانی بوو و خەریك بوو چاوی لە من دەکرد ! ساحێلیش چاوی لە من دەکرد, بەڵام لە دیتنەکەی ڕا زانیم کە حەز دەکا هەر لەوێ من بگوژێ ! ))

( بێدەنگی. دەنگی کاغەز)

– برسیمە ! بۆخۆم چوکلیاتەکە دەخۆم, شەربەتەکە دەبەمە ژوورێ! ئەوڕۆ زۆرم قسە کردن ! درەنگت دا نەیێ خانمی پارێزەر؟ !

ـ نا بەڵام لەوەتەی هاتوومە ئێرە شتێکی وام دەست نەکەوتووە, کە لە دادگا بیکەمە بەڵگە ! دەبێ زووتر بچیە سەر ئەسڵی بابەت !

- ئەسڵی بابەت هەر ئەوانەن ئیدی! هەر ئەو شتە چکۆلانە کە لە ژیانی مرۆڤدا ڕوو دەدەن, دواتر ئەسڵی بابەت دروست دەبێ!
- یانی ئەوانە هەموو پەیوەندییان بە فایلەکەتەوە هەیە؟!
- هەموویان! ئەگەر ئەوانە نەبن ئەسڵەن فایلێك دروست نابێ و منیش لە خزمەت تۆدا نەدەبووم!
( بێدەنگی)
- دەمەوێ شتێکت لێ پرسم خانمی پارێزەر!
- چی؟
- ئەتو لە ژیانت دا کێشەیەکی گەورەت هەیە, وا نییە؟!
- هەموو خەڵك کێشەی هەیە!
- بەڵێ بەڵام چکۆلە و گەورە هەیە! کێشەی تۆ گەورەیە!
- جارێ پێویستە بە کێشەی تۆ ڕابگەین!
( پێکەنین. دەنگی کاغەز)
- چوارشەممە؟
- نا! تەقریبەن پێنجشەممە!
- کەواتا جارێ بای بای!
( دەنگی دوگمەی تەسجیل)

(( ئەو ڕۆژە زۆر حەزم لێ بوو سەبارەت بە کێشەکەم لەگەڵ ئەفسانە قسە بکەم, بەڵام گونجاو نەبوو! ئەوە هیچ کە گونجاو نەبوو, زۆریش خراپ بوو! پارێزەرێك کە بۆخۆی لە کێشەدا بێنە و بەرەیەتی!

درەنگ داهاتبوو. هەر لەوێوە گەڕامەوە ماڵێ تا شتێك بۆ سوگێل ئامادە بکەم. هەتا ئامادە بوو, بۆخۆشی هاتەوە و نانی نیوەڕۆم دایە و بۆخۆشم چوومە سەر

ئیش. له ڕاستیی دا خۆم به ئیشەوه سەرقاڵ دەکرد, تا کەمێك غەم و خەفەتم به بۆنەی ئیشەوه له سەرم وەدەر نێم!

نەمدەزانی بابەتی نووسینگەی مەسکین چۆن چارەسەر بکەم! ئەقلیشم بۆ شوێنێکی دی نەدەچوو. دەبوو هەر چۆنێك بووه زانیبام بێهروز بۆچی چۆته ئەو نووسینگەیه. تەنها ڕێگه چاره ئەوه بوو که بچمه ئەوێ و چاودێریی بکەم. له نووسینگەکانی نزیك ئەو. بەڵام حەتمەن تەلەفوونی بێهروزیان له کنه و پێی دەڵێن که ئافرەتێك هاتووه و لێی پرسیوی! ئەو کات هەموو شت ئاشکرا دەبوو و نەمدەویست واش بێ. تەنها ڕێگه چاره هەر ئەو پۆستەچییه بوو. ئەویش که هەموو جار دەبوو چل هەزارێکم پێ دابا ئەگەر بۆ ڕۆژێکی تەواو بەکارمهێنابا. بەڵام ڕێگەیەکی دیکەم نەبوو.

چاوەڕێم کرد تا سوگێل بچێته ژوورەکەی سەر کتێب و دەرسەکانی, تا بتوانم پەیوەندیی به پۆستەچییەوه بکەم. کەمێك دواتر سوگێل چووه ژوورەکەی و منیش چوومه ژوورێکی دیکه و پەیوەندیم به گەراجەوه کرد, که هەمان مەنسورم داوا کرد و بڕیاری بەیانیم لێ وەرگرت. پێم گوت: که ده دەقیقەی بوێ بۆ هەشت, له پێش ماڵێمان بێ, که هەر له وێڕا چاودێریی بێهروز بکات!

ئیدی هیچم بۆ نەمابۆوه بێجگه له فکر و خەیاڵ! هەتا هاتنەوەی بێهروز, هەزار جار ئەو قسانەم له فکرمدا لێك دەدانەوه که پێی گوتبووم. وشه وشەی قسەکانی, لەگەڵ حاڵەتی دڵنیا بوون و متمانەبەخۆبوونی که کاتی قسه کردنی هەیبوو. دەکرا هەموویان قبوڵ بکرێن, ئەگەر بابەتی نووسینگەی تێدا نەبا! ئاخر بۆچی دەبێ ئەو لەگەڵ ئافرەتێك بچێته نووسینگه و باڵەخانەیەك به کرێ بگرێ؟! دەکرێ چ هۆکارێکی هەبێ؟! ئەو ژنه کێیه؟! یانی دەکرێ یەکێك بێ له

هاوکارەکانی کە یارمەتیی لەو ویستبێ؟! نا! بەهیچ شێوەیەك! ئەگەر وا با حەتمەن پێی دەگوتم!

زۆر بە جوانی بە دوای شتێکدا دەگەڕام کە پاکانەی بۆ بکەم, وەلێ شتێکم وەچەنگ نەدەکەوت, بێجگە لە خیانەت! هەتا ئەگەر بیەوێ داوای یارمەتیی لە کەسێك بکا, دەبوو سەرەتا ئیجازە لە من وەرگرێ! ئەسڵەن مافی ئەوەی نییە داوا لە ژنێك بکا یارمەتیی بدات! غەڵەت دەکات! بێ قیمەت! هەر چۆنێك بێ ئەوە خیانەتێکە!

دووبارە تێك چووم! هەستم کرد ناتوانم لەماڵدا بمێنمەوە! تەلەفوونەکەم هەڵگرت و زەنگم بۆ نەجوا لێدا. بەتەنێ بوو و بێ ئیش بوو. بەهانەم بە شتێکەوە هێنایەوە و بە سوگێلم گوت: هەتا دەرسەکانی تەواو دەکات, دەگەڕێمەوە.

چوومە سەرێ. دەرگای باڵەخانەکەیان کراوە بوو. لە دەرگام دا و چوومە ژوورێ کە نەجوا هاواری کرد و گوتی))

– وەرە, لە چێشتخانەم.

(( دەرگام داخست و چوومە ژوورێ. دوو فنجان قاوەی تێکردبوو و لەسەر مێزی دانابوو. هەر کە گەیشتمێ, جگەرەیەکم لە پاکەتەکەی دەرهێنا و پێم کرد و گوتم))

ـ لەبیرم بێ دوو پاکەت جگەرە بێنم لێرەیان دانێم, هەر لە هی تۆ نەکێشم!

– شێتبووی؟! چ خەبەر!

(( بابەتەکەم بۆ باس کرد! باسی پۆستەچییەکەشم کرد, کە هیچی لێ نەدیوە, کە قسەکانم تەواو بوون, نەجوا گوتی))

– کەواتا ئێمە بەهەڵەدا چووینە؟

ـ نازانم, خۆ بە جارێك چاودێریی کردن, هیچ دەرناکەوێ!

- ئەو بابەتی نووسینگەیە زۆر خەتەرە. بە تایبەتی ئەوانەی کە لەبن سەریاندا دروست دەبیٚ, باڵەخانەیەکی بچووك دەگرن, تا ژنەکە ببەنە ویٚ. زۆرینەیان هەر وا دەکەن! لەوێش وەك ژن و مێرد خۆیان بە جیرانەکان دەناسێنن تا بێتام نەبیٚ.
- خۆ ئەوانیش لە نووسینگەکە هەر وا خۆیان ناساندووە!
- هەویەکانیانت دیتن؟!
- نا, چەند گێلم من!
- بەهەرحالٚ سیغە[1] لە هەویەدا دەرناکەویٚ!
- با بچمە خواریٚ بیهێنم, لە دۆلابەکەدا, لە جانتایەك دایە.
- جاریٚ ئەوە بۆ دوایە!
- ناتوانم سەبر بگرم. تۆ نازانی ئەو ماوەیە چ حالێکم هەیە! ئەوە هاتمەوە.
(( خێرا لە شوێنی خۆم هەستام و چوومە خواریٚ و دەرگای مالێم کردەوە. چوومە ژووریٚ کە سوگێل گوتی))
- هاتییەوە دایە؟!
- نا دایەگیان! بۆشتێك هاتوومەوە! دەچمەوە سەریٚ و زوو دێمەوە!
(( خێرا چوومە زگ دۆلابەکە و هەرچی جانتا و کاغەز و شت هەبوو, دەرمهێنان, بەلام هەرچەند گەڕام, هەویەکەی تێدا نەبوو! دە جار ئەو دۆلابەم سەراوبن کرد, نەبوو و نەبوو. حەزم دەکرد هەر لەوێڕا هاوار بکەم. حەزم دەکرد بیکوژم. بیٚ قیمەت, سەخیف, خوێڕی!
بەخۆم نەبوو, فرمێسك لە چاوانم هاتنە خوار! دەبوو هەندێك هەر گریابام, تا ئارام ببمەوە. دەبوو کەمێك لەو کینەیەم دەر دابا دەنا جەلتە لێی دەدام.

1

دە دەقیقە دواتر, دەم و چاوم سڕینەوە و هەستام و چوومەوە سەرێ. هەر گەیشتمێ و نەجوا سەیرێکی کردم و گوتی))

– نەبوو؟!

ـ نا!

– دڵنیای هەر لەوێ بوو؟

ـ بەڵێ هەموو کات هەر لەوێ بووە! هەر کات ئێشێکی پێ با پێی دەگوتم کە لە دۆڵابەکەدا بۆم دەر بێنە و هەر وە دەستی خۆشمی دەدایەوە و دەیگوت لە شوێنی خۆی دانێوە!

(( پێکەوە چوینە چێشتخانە و دانیشتین. ئیدی هیچ نەمابوو بەهانەی پێوە بێنمەوە. ئەوە ڕاستییەکی دیار بوو! شوەکەی من, ئەو کەسەی کە هەموو ژیانم خسبووە بەردەمی! ئەو کەسەی کە ئاشقی ببووم. ئەو کەسەی کە ئیجازەم پێ دابوو لەگەڵ ناخم تێکەڵ ببێ. وە سەرەتای ژیانێکی نوێ, کە نیوەی پەیوەندیی بەویەوە هەیە, سوود وەربگرێ! ئەو کەسەی کە ڕوحم لە خزمەتی ئەو دا بوو, خەریك بوو خیانەتی لێ دەکردم!

– تەرانە!

ـ ها؟!

– باشی؟!

ـ نا! یانی بەڵێ! دەبێ قبوڵی بەکەم!

– ئەوەندە ئازاری خۆت مەدە!

ـ هیچ کات بیرم لەوە نەدەکردەوە کە شتێکی ئاوا بۆ من ڕوو بدات! هەموو جارێك کە گوێم لەو شتانە دەبوو, هەتا بۆ سانیەکیش بە فکرمدا نەدەهات کە سەرەی

منیش بێ! ئەویش کێ؟! بێهروز! کەسێك کە ماوەیەك بە دوامەوە بوو, بابم بە هاوسەرگیرییەکە ڕازی نەدەبوو! چەندە هەوڵی دا تا من بەدەست بێنێ!

– هەمیشە هەر وا بووە, ئەو پیاوانە هەموویان هەر وان, هەوەسبازن!

(( چوو چایەکی بۆ تێکردم و لە پێشی دانام و گوتی))

– جا ئێستا دەتەوێ چ بکەی؟!

ـ نازانم!

– کرێنامەی ئێرە بەناوی کێ وەیە!

ـ ئەو!

– هەژدە هەزارت بارمتە داناوە؟

ـ ئیدی چ جیوازییەکی هەیە؟!

– جیاوازیی زۆرە, پارەی نەقدەکە چی؟!

ـ هەمانە! حساب بانکییەکی زۆر!

–چەندیش دەبێ؟

ـ بیست ملیۆن تمەن!

– حەتمەن ئەویش بە ناوی ئەوە؟!

ـ بەڵێ!

– ئەتۆ کە پارێزەری, بۆ تۆ نابێ!

ـ هیچ کات ئەو قسانەم لەگەڵی نەبووە. ئەوەندە متمانەم پێ بووە کە شەرمم دەکرد سەبارەت بە پارە قسەی دەگەڵ بکەم! بەڵام لەو بیست ملیۆنە, پانزە ملیۆنی هی منە!

– پارەی بەستەزمانێکت داوەتە دەس زماندارێك! ئیدی چی ماوە؟ سەیارەکە چی؟

ـ بە ناوی منە!

- چەند سەیرە!

ـ بە خودای بۆ ئەویش دەمگوت نا! بەڵام بە زۆر منی برد و بە ناوی کردم! هەرچەند کە پارەی ئەویش هی من بوو! لە سێ شەریکە کرێ وەردەگرم! کەمێکیش بابم پێی دابووم! پێش مردنیشی, کەمێك زەویم بەرکەوت!

- ئەی چت لە وی کرد؟!

ـ هەر لە سەرەتای هاوسەرگیرییەوە بە کەمێك پارەی دی, عەردێکمان لە کەرەج کڕی!

- حەتمەن بە ناوی ئەوە؟!

ـ ئێ من چووزانم ئاوای لێ دێ؟!

- چت پێ بڵێم تەرانە؟! بەڕاستی ..!

ـ خۆشمدەویست! ئامادە بووم هەر کارێکی بۆ بکەم!

- ئێمەی ئافرەتان هەموو کات ڕەگی هەستەکانی خۆمانمان بڕیوە! جا ئێستا دەتەوێ چی بکەی؟!

ـ جارێ هیچ! دەبێ سەرەتا بزانم ئەو ئافرەتە کێیە! دەمەوێ بیبینم! دەمەوێ بزانم ڕای بەرانبەر من چییە کە ئەوی هەڵبژاردووە!

- غەڵەت دەکات! قوڕی بەسەری بۆ کوێ دەچێ! دڵی خۆش بووە ها! بێ چاوورووت کردووە! ئیدی چی دەوێ لە ژیان؟! ژنێکی نەجیب و ماڵدار! هەر پەنجەیەکی هونەرێکە! پارێزەری ئەو میللەتەشی! لە سێ شوێنیش ئیشێ دەکەی! ئیدی چ مەرگیەتی!

ـ هەرچۆنێك بێ تەڵاقی لێ وەرناگرم! تەڵاق یانی دۆڕان! زۆر زۆرەکەی مارەییەکەم دەداتێ! قەرزەکەیم دەداتێ! دەتوانێ سوگێلیشم لێ وەربگرێ! یانی لە ڕاستیی دا من لەو نێوەندە دا دۆڕام!

- دەتوانی چی دی بکەی؟!
- ڕێیەکی دی! کارێکی دیکە!
- چ شتێك؟!
- هێشتا بیرم لێ نەکردۆتەوە! یانی هێشتا ڕازیی نەبووم!
- هێشتاش وا بیر دەکەیەوە کە بە هەڵەدا چووبی؟!
- نا, بەڵام هێشتا بۆ بڕیاردانی کۆتایی زوویە! دەبێ زیاتر بیری لێ بکەمەوە! زۆر زیاتر! ئەگەر وا بڕیارە من بدۆڕێم, دەبێ ئەویش بدۆڕێ!

(( جگەرەیەکی دیکەم پێ کرد و کێشام, دواتر هاتمە خوارێ. هەر چەند لە ڕاستییەکە نزیکتر دەبوومەوە, باشتر دەمتوانی لە باسەکە بگەم! لانی کەمەکەی ئەوە بوو کە لە ون بوون و خۆ گێل کردنەکە بۆم باشتر بوو! زیاتر لە حاڵی خۆشم تێدەگەیشتم!

بەیانییەکە, نەمزانی چۆن سوگێلم هەستاند و نانم دایە و بەڕێم کردە قوتابخانە! دواتریش چاوەڕێم کرد تا بێهروز کارەکانی بکات و لە ماڵ بچێتە دەرێ. هەر دەقیقەیەکی بۆم وەك ساڵێك وا بوو! دواتر لە پەنجەرەوە ماتۆڕە پۆستەچییەکەم دیتبوو لە سوچێکی گەڕەك ڕاوەستاوە! خولاسە بوو بە سەعات هەشت و بێهروز چۆ دەرێ لە ماڵ, کە مەنسووریش بەدوایدا ڕۆیشت! نیسکافەیەکم بۆ خۆم دروست کرد و دانیشتم! کات بە شێوەیەکی وا قورس دەڕۆیشت کە هەتا هەناسەکانی خۆمم دەژماردن! خەریك بوو حسابم دەکرد دەبێ چەندە چاوەڕێ بکەم تا کەمێك زیاتر حاڵی ببم, بەڵام وا نەبوو!

دوو سەعات زیاتری نەکێشا کە زەنگیان لێ دا. ئایفۆنم هەڵگرت و دیتم کە پۆستەچییەکەیە! خێرا دەرگام کردەوە و چارشێوەکەم بە خۆمدا دا و چوومە خوارێ, هەر کە دیتم, گوتم))

ـ چی دەکەی لێرە؟! مەگەر بەدوایدا نەچوو بووی؟!

(( سەلامی کرد و گوتی))

– با خاتون, بەڵام ونم کرد!

ـ بۆچی؟!

– له ترافیك له سوورم دا. یانی ئەو ڕۆیشت منیش به مەجبووری بەدوایدا! بەینمان کەمێك بوو! پۆلیس منی گرت!

ـ ئێ دواتر چوبای به دوای دا!

– چووم بەڵام نەمدیتنەوه!

ـ نەتدیتنەوه؟! بۆ مەگەر بەتەنێ نەبوو؟!

– نا خاتون!

ـ لەگەڵ کێ بوو؟!

– ئەسڵەن ئەو بۆ شوێنی پێشتری نەچوو! چوو بەڵام نەچۆ ژووریٚ!

ـ فەرمانگه؟!

– بەڵێ! ئەوڕۆ که لێرەڕا ڕۆیشت, چوو بۆ شوێنی پێشتر و سەیارەکەی له گەراجێك ڕاگرت و چوو بۆ پێش فەرمانگه و وەستا! کەمێك دواتر سەیارەیەکی پڕاید هات و لەوێ وەستا! خاتوونێك له پشت سووکانەوه بوو! مێردەکەشت سوار بوو و سەلام و عەلەیکیان کرد و ڕۆیشتن! چوون بۆ لای وەلەنجەك. هەر لەوێ بوو که پۆلیس منی گرت و ئەوان ڕۆیشتن!

(( هەر وا تەماشام دەکرد که سەریی لەبەر خۆی نا و گوتی))

– ببورن خاتوون که ئەو هەواڵەم پێدان! خەجاڵەتم به خودای!

ـ ئێوه چ گوناهێکتتان هەیه؟!

ـ فەرموون!

(( ئەو پارەیەی کە پێم دابوو لەبەر دەمی ڕاگرتم و گوتی))

– ئەوەش پارەکەتان!

- بۆچی؟!

– هەم نەمتوانی تا کۆتایی بەدوای دا بچم و هەم...

- نا کاکە! ئەوە مافی خۆتانە! لەوانەیە دووبارە ئیشم پێ بیەوە!

– ئاخر...!

- پێداگریی مەکەن تکایە! سوپاس! ئەگەر کارم هەبوو زەنگتان بۆ لێ دەدەم! سوپاس!

– زۆر سوپاس, ئیشەڵڵا هەموو شت باش دەبێ!

- سوپاس! سوپاس!

– کەواتا بەیارمەتیتان!

(( دەرگام داخستەوە و چوومەوە ژوور. شتێکی سەیر ڕووی دابوو! هەستێك! هەستێکی ئارامبەخش و سەیر! سەیر لەوەی کە ڕێك لەو حاڵەتە دا ئەو هەستەم هەیە! لە کاتێك دا پێشر پێم وا بوو ئەگەر ئەو هەواڵە بزانم, حەتمەت لە ناڕەحەتیان جەڵتە لێم دەدا! بەڵام وا نەبوو! لەوانەیە لەبەر ئەوە بێ, کاتێك مرۆڤ بە ڕاستەقینە دەگات, هەرچۆنێك بێ قبوڵیەتی! و دەبێ قبوڵی بکات! منیش گەیشتبوومە ئەو ئاستە! بە ڕاستەقینە! چاوەکانم لێك نان. سەیر ئەوە بوو کە یادگارییەکانی کۆن هەر لە زەینمدا بوون! ئەو یادگاریانەی کە لەگەڵ بێهروز هەمبوون! ڕێك ئەو کاتەی کە یەکترمان ناسی! هەر لەو فەرمانگەیە ناسیم! کارمەندێك کە هیچیشی نەبوو!

ڕۆژێك لەگەڵ بابم بۆ کارێکی ئیدارە چووبووین کە منی دیت! بۆ کارێکی سادە, دوو سەعات ئێمەی ڕاگرت! هەتا بابم توڕە بوو و وە قسە هات, ئەوجا

کارەکەمانی بۆ کردین! دواتر پێی گوتم کە بە تایبەت ئەو کارەی لە بەر من ڕاگرتووە کە زیاتر لەوێ بمێنمەوە! دواتریش ناونیشانەکەمانی لە فایلەکە دەرهێنا بوو و ڕۆژێکیش بۆ خوازبێنی لەگەڵ دایکی هاتبوونە ماڵێمان. بابم هەر ئەوکات جوابی نەدانەوە, بەڵام وازیان نەهێنا. ئەوەندە هاتن و ڕۆیشتن تا بابم ڕازی بوو. ئەویش لەبەر خاتری من! ئەویش زۆر بە جوانیی وازی لە کار و ژیانی خۆی هێنا بوو و لەسەر ڕێی من قیت دەبۆوە! ئەوەندە بێتامی کردبوو کە سەرەتا لەگەڵی ڕاهاتبووم و دواتریش ئاشقی ببووم! ئیدی ڕاهاتبووم کە بۆ هەر شوێنێك بچم, ئەویش لەوێ ببینم! لە گۆشەیەك ڕادەوەستا و چاوی لە من دەکرد! ستەملێکراو و بێدەنگ! دوو ساڵ ئەوە ئیشی بوو!

ڕاستییەکەی ئەو کاتە حەزم بەو پێداگریەی هات! کاتێکیش کوڕێك دوو ساڵ بە دوای کچێکەوە بێ, زۆر ڕوونە کە کچەکە چ هەستێکی بۆ دروست دەبێ!

دواین جار ئەو کاتە بوو کە لە پێش بابم دەستی کرد بە گریان! دەستی بابمی دەگرت و ماچی دەکرد! ئێمەش لە پەنجەرەوە تەماشامان دەکرد! هەر لەوێڕا بوو کە هەستم کرد خۆشمدەوێت! کاتێکیش بابم کۆتا جار بە نەرمی و بە سۆزەوە پێی گوتم: کە ئەو کوڕە هیچی نییە و وەلێ بەڕاستی ئاشقی تۆیە! سەرم نەوی کرد و بێدەنگ بووم! هەموومان لە بەرانبەر وەستان و بەردەوامیی بێهروز دا تەسلیم ببووین!

خۆم شرد و لە حەمام هاتمە دەرێ! سوودی چی بوو, ماوەی ژیانێك , کە لە کۆتایی دا بگاتە ئێرە!؟ ماوەی خوێندکاریم لە کن دکتۆرێك یاسایی ئیشم دەکرد.

زۆرێك لەو فایلانەمان دەهاتنە کن, کە بیرم دێتەوە من بەسەری ڕا دەگەیشتم!

دادگا, دانیشتن, وتوێژ, ئامۆژگاری, تەبایی, سەرکۆنە, داوەری, هەموو ئەوانە بۆ چی بوون؟!

ئەو هەموو خەڵکە ئیشیان چی بوو لە دادگا؟!
ئەو ژن و پیاوانە چییان دەکرد لەوێ؟!
بەدوای چییەوە بوون؟!
چ حوکمێکیان بۆ دەردەچوو؟!
ئێ! ئەو هەموو ئەزموونە نابێ بە بەلاش بڕوات! من لەسەر هەر یەکێك لەو فایلانە ئیشم کردووە و زەحمەتم کێشاوە! لە پای هەر یەکێك لەو مافانە, لە بەرانبەر مێردەکانیان دا, بەرگریم کردووە! ئێستا سەرەی خۆمە! دەبێ بەرگریی لە خۆم بکەم, بەڵام نەك لە دادگا! نە بەپەلە و نە بە تووڕەیی و نە بە تەڵاقیش! تەڵاق کارتێکی براوەیە لە دەستی پیاو دا! تەواوی ئەو ژنانەی کە لە کۆتایی دا دەدۆڕان, سەرەتا تووشی تووڕەیی دەبوون و دوای چەند شەڕێك و لێدانێك دواتریش تەڵاق. مێردەکانیشیان هەر ئەوەیان دەویست. من ئەو مافە بە بێهروز نادەم. سوگێل هەقی بوو کە هەم بابی هەبێ و هەم دایك! ژیانی ئەفسانە لە چ کاتێك دا بەرەو لەناوچوون چوو؟! لەو کاتەی کە دایکی لەدەست دا! من نایەڵم ژیانی سوگێل وەکی ئەفسانەی لێ بێ؟! من هەم و دەمێنمەوە!
عەسرەکە لەگەڵ سوگێل چوینە دەرێ. سەرەتا لە عەترە هەرە گرانەکانم بۆخۆم کڕی, دواتریش جل و بەرگی ماڵێ. ئەو شتانەی کە هەمیشە حەزم لێیان بوو, تیشێرتی جوان, عەزیزیی جوان, دوو سێ پاتۆڵی ڕەنگ جوان و کراوە, جلی خەوی ئەورووپی, بۆچی دەبێ هەموو کات وەك کەنیزەك بم لە ماڵ دا؟! منیش دەتوانم وەك ئافرەتانی دی, ڕێك و تەڕ و خاوێن بم! دوو چارشێوی جوان, دوو جووت پێڵاوی جوان, ئەشیای ئاڕایشیش کامل, من بۆخۆم باشتر دەزانم پارەکەم سەرف بکەم, هەم بۆ خۆم هەم بۆ کچەکەم!

گەرەنتی چییە کە ئەوەی تازە دێ ئەو پارەیەی کە من بە زەحمەت بە دەستی دێنم, بۆ خۆی خەرج بکات! جل و پێڵاو و بووکەشووشەشم بۆ سوگێل کڕی! دەبوو بە شێوەیەکی دی چاوم لە دونیا کردبا! وە چاویشم لێ کرد! ئەو ڕۆژە بۆ ئێوارە هیچم ئامادە نەکرد. کاتێك بێهروز گەڕایەوە ماڵ, لە کاتێکا خەریکی حەمام بوو, تەلێفونم کرد بۆ ئەوەی ساندویچمان بۆ بێنن. کاتێك هاتە دەرێ لە حەمام و جلەکانی دەبەر کردنەوە, زەنگی دەرگایان لێ دا! بە سەر سوڕ مانەوە سەیری کردم و گوتی: کێیە بەو کاتەی شەو؟!

– خواردنم هێناوە.

ـ خواردن؟

– بەڵێ ساندویج!

ـ ساندویج؟!

– بەڵێ ئەوڕۆ لە بازاڕ شتم کڕیوە و پێ ڕانەگەیشتم هیچ دروست بکەم!

(( ئەوەم گوت و دەرگام کردەوە و ساندویجەکانم وەرگرتن و بردمنە چێشتخانە و لەسەر مێزم دانان. بێهروز هەر وا چاوی لێ دەکردم! دواتر شانی هەڵتەکاندن و گوتی))

– ئێ بڵێ ئەو شەو وەك کاتی ڕەبەنی دەیگوزەرێنم!

(( دواتر پێکەنی و گوتی))

– یالاا بەرەو ساندویچ!

(( هەرسێك چووینە سەر مێز و سەرقاڵی خواردن بووین, کە کەمێك دواتر سەیرێکی جلەکانمی کرد و گوتی))

– ئەوانەت کڕیون؟!

ـ بەڵێ, جوانن؟!

– زۆر! پیرۆزە!

ـ ئەمڕۆ چوومە بازار کەمێك شتم کڕیوە! جل و پێلاو و ئەشیای ئاڕایش و ئەو شتانە!

– بۆ جەژنە؟!

ـ نا هەر وا!

– ئاخر خۆ تۆ تا ئێستا ئەو کارانەت نەکردوون!

ـ هیوایەتە بەسەر چووەکان!

– چی؟!

ـ هەموو کات حەزم لێ بووە هەر وا بم, بەڵام نەمتوانیوە ئاوا بم و نەمکردووە! پێم وایە ئیدی بتوانم بەو شتانەی کە حەزم لێیانە نزیك ببمەوە! لە ناکاو دەیبینی کە ناتوانم هیچ بکەم!

– بۆ ناتوانی گیانەکەم! کێ لە تۆ باشتر ئەوە بکات؟! هەرچەند کە تۆ وەکو شەوی مانگی چواردە دەمێنیەوە, بەڵام کێشەیەك نییە! هەرچی حەزت لێیە بکڕە!

(( لە دڵی خۆمدا گوتم: باشە, بەڵام بۆخۆتی نەك من! چاوەکانت دەڵێن درۆ دەکەیت))

ـ تۆ ئاوا حەزت لێ نییە؟!

– بۆچی نا؟! هەم ئاوا و هەم وەکی دی!

ـ ئێ تۆ ئەمڕۆ چیت کردووە؟!

– وەکو هەموو ڕۆژەکان! فەرمانگە, شەریکە, ماڵ!

(( هەر وا سەیرم دەکرد, بە شێوەیەکی ئەوەندە سادە و ساکار درۆی دەکرد, کە دەتگوت سەد ساڵە هونەرمەندە! نەکا لە ڕاستیی دا لە ژێر کاریگەریی تەمرین و

تێپەڕینی کات, بووبێتە هونەرمەند! چەند ساڵە ئاوا یاریم پێ دەکا. چەند ساڵە وەك کەو سەرم لە ژێر بەفر بووە ! ))

– تەرانە!

(( سەیرم کرد ))

– دەڵێم لەوانەیە بمەوێ سەیارەکە بفرۆشم!

ـ سەیارەکە؟! بۆچی؟!

– بە کەڵکی چ دێ؟ چەند ملوێنمان خستۆتە بن پێمان! خۆ تۆش سواری نابی! منیش هەر پێی دەچمە فەرمانگە و کۆمپانیا و لەوێ پارکی دەکەم تا شەو دەگەڕێمەوە! خۆ بە تاکسی و پاسیش دەتوان بچم! ئەوە چ ئیشێکە کە بەو شێوەیە واز لە سەرمایەکەمان بێنین, کە ڕۆژ بە ڕۆژیش لێی کەم بێتەوە! هەر ساڵێك بڕوا مۆدیلێك دێتە خوارێ ئیدی!

(( حەیوانی خوێڕی! حەتمەن دەیەوێ پارەیەکی بێتە دەست تا بۆ ئەو بێقیمەتە خانوێك بگرێ! یان لەبەر ئەوەی بە ناوی منەوەیە دەیەوێ لە دەستمی دەر بێنێ! ))

ـ بۆچی بیفرۆشی؟! هەرچی چۆن بێ لەوانەیە شەوێك یان نیوە شەوێك پێویستیمان پێ بێ!

– گەراج! زۆر زۆرەکەی تەلەفون بۆ گەراج دەکەین! ئێستاش ئەوە هەموو گەراجەکان دایمین!

(( حەزم دەکرد لەوێ بە هەرچی هێزم هەیە لە سەری ڕاکێشم! هیچوپوچ, وا دەزانێ کەری بەرانبەرە! ئەوەندە توڕە ببووم کە نەمدەتوانی هیچ بخۆم! بەڵام دەبوو پێش بە خۆم بگرم))

ـ جارێ, دواتر قسەی لە بارەوە دەکەین!

(( ئیدی هیچ قسەیەك نەكرا و نانی ئێوارەمان خوارد, موبایلەكەی زەنگی لێ دا!
خێرا هەستا و لە چێشتخانە چۆ دەرێ! بەهەرحاڵ توند هاوارم كرد و گوتم))

ـ ئیدی ئەو كاتەی شەو كە دێیەوە ماڵ ئەو بكوژێنەوە! ئاخر تۆ چەند كار دەكەی؟!

(( هەر وا كە بەرەو هۆڵ دەچوو گوتی))

- گیانەكەم ژیانە ئیدی! چارە چییە؟! ئەلو!

(( گوێم هەڵخست بەڵام وەك ئەوە وابێ قاپەكان خڕ دەكەمەوە))

- سڵاو, چۆنی؟!
- بەڵێ لە ماڵێم!
- باشە! باشە!
- زۆر لێم دوور نەبوو
- لەوانەیە خۆی بێ!
- چی خەریكە ڕوو دەدا؟! دەبێ بزانم!

(( هێواش چوومە دەرێ كە تەنها گوێم لەوە بوو!))

- هەشت و نیو!

(( دوای كە منی دیت لە ژوور ڕەت دەبووم, بە دەنگی بەرز گوتی))

- ئەگەر ئەو فایلە بە خێر و خۆشی تەواو بێ, خێرێكمان لە سەرە!

(( چوومە هۆڵ و دووبارە گەڕامەوە چێشتخانە. ئیدی خەریك بوو بەرز قسەی دەكرد, تایبەت بۆ ئەوەی من گوێم لێ بێ!))

- ئەرێ كاكە ئێستا ئیدی وەختی پشوویی منە! خۆ ناكرێ ئیشی ڕۆژێ شەوێ بێنیە ماڵێ! باشە هەر سبەینێ لە فەرمانگە! قوربانتم! قوربانتم! خوا حافیز!

(( موبایلەكەی كوژاندەوە و هاتەوە چێشتخانە و گوتی))

– کەریمی بوو! فایلێك لە فەرمانگەدا ون بووە ! جا قسە لەسەر ئەو بەرتیل و دزی و دزیی کارییەیە ! خەریکە دەکەوێتە ئەستۆی هەموانەوە !

ـ پەیوەندیی بە تۆوە چییە؟! تۆ خۆ پاکی!

– بەڵێ! بەڵام هەرچی چۆن بێ لە بەشی ئێمەدا کراوە و منیش بەرپرسم ئیدی!

(( بە تەوسەوە خەندەیەکم کرد و گوتم))

ـ شوکری خوا کە تۆ تێوە ناگلێی!

(( سەیرێکی کردم, هیچی نەگوت و چۆ سەرئاو. سوگێلیش لە ژوورەکەی دا خەریك بوو جانتاکەی خاوێن دەکردەوە! خێرا چوومە سەر موبایلەکەی پێم کردەوە, بەڵام حەرامزادە کۆدی لەسەر دانابوو و هەڵنەدەبۆوە!خێرا لە شوێنی خۆیم دانایەوە و گەڕامەوە چێشتخانە, کە دوو دەقیقە دواتر لە سەرئاو هاتە دەرێ و هاتە مدبەق و گوتی))

– تەرانە؟!

ـ ها؟!

– تۆ ماوەیەکە جۆرێکت لێ هاتووە! هیچ شتێك ڕووی داوە؟!

ـ نا, چ شتێك؟!

– لە شتێك دڵتەنگی؟!

ـ دڵتەنگ کە نا, بەڵام ئەو فایلە کەمێك قورس و لێڵە! منی بە خۆیەوە قاڵ کردووە!

(( وەك ئەوەی خەیاڵی ئاسوودە بووبێت, گوتی))

– چەندەم پێ گوتی: بڕۆ بیگەڕێنەوە؟!

ـ نابێ!

– کەواتا زۆر خۆتی پێوە خەریك مەکە!

ـ باشه ! ئیدی هێندەی نەماوه !

– نایەی سەیری سەتەلایت بكەین؟

ـ نا, كارم هەیه, تۆ بڕۆ!

(( ئەو شەوه تێپەڕی. دەمزانی سبەی دیسان دیداری هەیه, بەڵام هەرچی بیرم كردەوه نەمدەتوانی هیچ بكەم! لە پێش وی نەدەكرا تەلەفون بۆ گەراج بكەم بۆ سبەی! حەتمەن تێدەگەیشت! لێی گەڕام تا ڕۆژ داهات!

بەیانییەكە كە كارەكانم تەواو كردن, سوگێلم نارده قوتابخانه. نزیك سەعات هەشت بوو كە بێهروزیش جانتاكەی دەست دایه و خوا حافیزی كرد و ڕۆیشت!

تەبعەن منیش تەلەفونم بۆ گەراج كرد. ده دەقیقەی پێ چوو تا گەیشت!

ناونیشانی فەرمانگەی بێهروزم دایه و ده هەزارم دا به سایەقەكه و گوتم: هەتا بۆت دەكرێ خێرا بڕۆ! خێراش ڕۆیشت! بەڵام كاتێك گەیشتمه بەردەم فەرمانگه, خەبەرێك نەبوو! سەیری وێم دەكرد كه سەیارەكەی خۆمانم لە فەرعی كۆڵانێك دا لە فەرمانگە دیت! نیو سەعاتیش چاوەڕێم كرد, بەڵام هیچ هەواڵێك نەبوو! هەر لەوێ بە تەلەفونی گشتیی تەلەفونم بۆ فەرمانگەكەیان كرد! یانی تەلەفونم دا بە سایەقەكە كە داوای بێهروز بكات, بەڵام پێیان گوت كە ئەمڕۆ ڕۆیشتووه! ئەوەنده لە خۆم توڕه ‌ه بووم كە بۆچی لە كاتی خۆیدا نەگەیشتووم! بەڵام هیچ نەدەكرا!

هەر بەو تاكسییه گەڕامەوه ماڵێ. دەرگام كردەوه و چوومەوه ژووری! دەتگوت دار و دیواری ماڵ خەریكه گاڵتەم پێ دەكەن و پێم پێ دەكەنن! بە سادەییم! به گێلیم! به ژنێك كه ئەو هەموو ساڵه بێ ئاگا بووه لە ژیانی! لە شوەكەی! لە هاوسەرینەكەی! لە كەسێك كه لە خۆی نزیكتره! لە بابی منداڵەكەی!

كاتێك پارێزەرێك نەزانێ لە بن سەری چی ڕوو دەدا, ئیجازه به خۆی دەدا بەرگریی لە مافی مرۆڤێكی دی لە ئەستۆ بگرێ!

لە نارەحەتیان گوڵدانێکی کریستاڵم هەڵگرت و توند بە عەرزێم دا دا, کە کەمێك دواتر لە دەرگایان دا! نەجوا بوو! بە دەنگی شکانی گوڵدانەکە هاتبۆ خوارێ!

***

(( ئێستا کە ئەمڕۆ لێرە دانیشتووم, بیر دەکەمەوە کە چەندە لاوازم! هەموو کات لە بەرانبەر بێهروزدا خۆمم بە بەهێز دەهاتە بەر چاو و حەقەکەم دوو بەرابەر! وەلیّ ئێستا تێدەگەم کە چەندە لاوازم!

شریتی شەشەمم خستە ناو تەسجیلەکە! سەیر بوو کە ئەوانە بۆ دووبارە ببنەوە!

**شریتی شەشەم**

**پێنجشەمبە سەعات 9ی بەیانی, ڕێکەوتی ... زیندانی ژنان... دۆسییەی ژمارە... ناو ئەفسانە...**

–سڵاو سڵاو سەد جار سڵاو!

(پێکەنین)

ـ سڵاو, باشی؟

– زۆر باش! لە چاوەڕوانیی هەتا هەتایی دا!

ـ بیّ هیوا مەبە! خوا گەورەیە!

– ئەوانە چین؟

ـ مۆزم بۆ هێناوی.

- دەستت خۆش بێ! دەڵێی هەموو ئەو پارەیەی وەری دەگری, میوە و چوکلێت بۆ بریگرتەکانت دەکڕی!

( بێدەنگی)

- بەھ بەھ! چەند بەتامە! دەستت خۆش بێ!

(بێدەنگی)

- بۆ خۆت ناخۆی؟

ـ نا, سوپاس!

- لە دەرێ چ خەبەر؟

ـ هیچ شتێك نییە!

- شەقامەکان هێشتا لە شوێنی خۆیانن؟

(پێکەنین)

ـ ئێ, ئێستا دەست پێ بکەین؟

- یانی من دەست پێ بکەم ئیدی؟!

(بێدەنگی)

- باش! خەریك بووم باسی شاخم دەکرد. گەیشتمە ئەو شوێنەی جوابی کچەکەم دایەوە! چاو لێکە چەند بە دەقیق بۆت دەگێڕمەوە! لەو کاتەوەی دەڕۆی, تا وەختی هاتنەوەت, لە زینمدا هەموو بۆ ئامادە دەکەم ڕاست و دروست هەمووت بۆ ڕێك دەخەم تا هەموو شتێکی باسکەم!

ـ سوپاس!

- جا ئێستا گوێگرە: ئەو ڕۆژە کاتێك لە شاخ هاتینە خوارێ, ئەو کاتەی کە هەموو خوا حافیزیان لێك دەکرد, ساحێل هاتە کن من و بە هێمنی گوتی:

- دڵنیابە سوهەیل هەمان ئیش لەگەڵ تۆ دەکا کە لەگەڵ منی کرد!

(( جوابم نەدایەوە کە گوتی))

- هەر چەندە دیار نییە! سەرەتا کە دیتمی وامزانی لەو کچۆڵانەی کە هەست بە گەورەیی دەکەن, بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە ملە[1]ی! چاکت کەر کردووە!

(( ڕووم وەرگێڕا ئەولاتر و چوومە کن سوهەیل خوا حافیزیم لە لەوانی دی کرد و دووقۆڵی سوار بووین و وەڕێ کەوتین. لە خوار وەلەنجەك, لە سەر (چەمڕان[2]), هەندێك بەولای دا ڕۆیشتن و هەندێکی دی بە لایەکەی دی دا, خولاسە کەمێك زیاتر هەموو لێك جیا بووینەوە! ئێمەش بە (وەلی عەسر) دا هاتینە خوارێ کە سوهەیل تەسجیلەکەی کوژاندەوە و گوتی))

- ئەفسانە؟

- ها؟

- ئەو شتانەی کە لەو سەرەوە گوتتن, بەڕاستیت بوون؟ یانی باوەڕت پێیان هەیە؟

- بە دڵنیاییەوە!

- ئەوانەی کە پێشتریش گوتتن هەر وا؟

- بەڵێ! سوهەیل بۆچی ئەوەندە خۆت بە کەم دەزانی؟! تۆ هونەرمەندێکی! باوەڕ بەوە بکە! کارەکانت هەموویان ئیشی هونەری و بە نرخن! بۆچی ئەوەندە گومانت لە خۆت هەیە؟!

- نازانم! هەموو کات وا بوومە!

- ئێ ئەو ڕەوشتەت باش نییە!

- دەزانم, بەڵام بە دەست خۆم نییە!

[1] ملە: ئەو دەعبایەیە کە بە ژێر زەوی دا دەڕوا و هەرچی بکەوێتە پێشی دەیقرتێنێ و جێگەکەشی لە سەر زەوی پۆز دەبێ, واتا: دیار دەکەوێ کە ئەو شوێنە ملە پێیدا ڕۆیشتووە.

[2] چەمڕان: ناوچەیەکە لە تاران پێی دەگوترێ چەمڕان. لە چەند گەڕەکێك پێك هاتووە.

- تۆ پێویستە لە ژیان دا شتێك بگۆڕی!

– بۆ وێنە چی؟

- تۆ ئێستا چی دەکەی؟ بەس وێنەکێشان!

– بەڵێ. بڕیارە ئەلبومێك دەرکەین, بەڵام دەمێکە وازمان لێ هێناوە.

- بۆچی؟!

– نازانم! پێم وابێ ئەویش شتێکی باش نییە!

- ئێستا ئامادە بووە؟

– کەمێکی!

- هەر کات حەزت کرد بیهێنە پێکەوە گوێی لێ دەگرین!

(( سەیری کردم و هیچی نەگوت. کەمێك کە ڕۆیشت, هەر وا سەیری پێشەوەی دەکرد, کە بە هێمنی گوتی))

– من لە ژیان دا زۆرم کێشە هەبوون! ئێستاش هەمن!

(( پێکەنیم و گوتم))

- خەریکەوەك کوڕی هەڤدە هەژدە ساڵ خۆت دەنوێنی؟

– نا, هەرگیز! تۆ ئاگاداری ژیانی من نی!

- ژیانت نایابە! لە ڕووی ماددییەوە ئەوە هەر زۆر باشی! چەند باڵەخانە و فرۆشگا! پێم وا بێ ڤێلایەکیشت هەیە؟!

– بەڵێ.

- ئەو سەیارەش هی خۆتە؟

– سەیارەی خۆم ئەوڕۆ هەڵنەبوو. ئەوە سەیارەی بابمە!

- ئێ! دوو سەیارەی جوان و گرانبەهاشتان هەیە خۆ! باڵەخانەیەکی بچووکیشیان داویەی! زانکۆشت ئەوە تەواو کردووە! ئیدی چیت دەوێ؟!

(( سەیرێکی کردم و تەوس خەندەیەکی کرد و گوتی))

- هەموو شت پارە نییە !

ـ خەریکە وەك منداڵان بەهانە دێنیەوە !

(( کەمێك بێدەنگ بوو و دواتر گوتی))

- من دایکم نییە !

ـ دایکت چی لێهاتووە !

- جیا بوونەوە ! چەند ساڵێکە !

ـ ئێ جا ؟ !

- یانی زۆر شت! تۆ تێناگەی من دەڵێم چی! تۆ لە مانای جیا بوونەوەی دایك و باب تێناگەی!

ـ بە کوێڕا دەزانی؟ !

- تێدەگەی؟ !

ـ منیش دایکم نییە ! دایکم چەند ساڵ لەمەوبەر مردووە !

(( هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی))

- دواتر خۆ بابت نەچوو ژن بێنێ ! ؟

ـ بۆ نا؟ چوو!

(( سەیرێکی کردم و دواتر بە وەڕەزییەوە گوتی))

- دایکی تۆ مردووە ! ئەوە جیاوازە لەوەی کە من دایکم زیندووە و جارێ بە ڕواڵەت بەتەنێ ژیان بەسەر دەبات !

ـ بە ڕواڵەت!

- بەڵێ! بە ڕواڵەت! بە شێوەیەك کە هەموو کات وا خۆی نیشان دەدا کە لە گوڵ پاکترە !

ـ جا نییە؟!

– نا! نییە!

ـ چۆن دەزانی!

– ئێمە پیاوان ئەو شتانە زۆر باش دەزانین!

ـ ئێ, کاتێك بابت ژنی هێناوەتەوە, دەبێ ئەو مافەش بە دایکت بدات کە...

(( لە ناکاو ئیستۆپی گرت و بەسەرمدا هاواری کرد و گوتی))

– هیچیان ئەو مافەیان نییە! هیچیان!!

(( هیچم نەگوت کە سێ چوار سەیارە لە پشتمانەوە دەستیان کرد بە هۆڕنە لێدان!

وەڕێ کەوت و کەمێك دواتر گوتی))

– لە خۆوە بەسەر تۆدا هاوارم کرد!

ـ کێشە نییە! تێدەگەم چەندە ناڕەحەتی! ڕاستییەکەی سەرەتا منیش وا بووم کە بابم ژنی هێنایەوە, بەڵام بوونی ئەو وەزعەم قبوڵ کرد! بەهەرحاڵ من کچم! کوڕان هەستێکی تایبەتیان هەیە! دەمارگیری لەسەر دایکیان! ڕاست دەکەی! دایکی من مردووە! ئەوە جیاوازە لەگەڵ جیا بوونەوە! بەڵام تۆ دەبێ لە خەمی خۆت دا بی!

– من دەمارگیر نیم!

ـ چەند ساڵە لێك جیا بوونەتەوە؟!

– پێنج شەش ساڵ!

ـ تۆ کامیانت پێ خەتابارە؟

– هەردووکیان! بەڵام زیاتر بابم! سەرەتا ئەو بوو دەستی پێ کرد!

ـ تۆ دڵنیای کە دایکشیت...

(( هیچی نەگوت منیش  ڕستەکەی دواترم نەگوت. کەمێك دواتر گوتی))

- نازانم!

- سەیرکە سوهەیل! ئەوە بوختانێکی گەورەیە ها! ناکرێ هەر ئاوا بوختان بە کەس بکەی! تۆ بۆخۆت ئەوەت دیوە؟

- نا!

- گوێت لە کەس بووە؟

- نا!

- کەواتا چۆن شتێکی وا دەڵێی؟!

- ئاخر چۆن ژنێك دەتوانێ دوای چەند ساڵ بە پاکی بمێنێتەوە؟! من کە پیاویشم ناتوانم! ئەوە بابیشم هەر باسی مەکە! بۆ ڕۆژێکیش ناتوانێ خۆی ڕاگرێ!

- ژن لە پیاو جیاوازە! من ئامادەم سوێند بخۆم کە ئێستا دایکت پاك و نەجیبە!

- چۆن دەزانی؟!

- چونکە ئێمە هەستی هاوشێوەی یەکمان هەیە! ئەو لەبەر خاتری تۆ بە پاکی دەمێنێتەوە!

- قورسە بۆم باوەڕ بکەم!

- چونکە زۆر قەلەق و ڕەشبینی! دایکێك بۆ منداڵەکەی لە زۆر شت دەگەڕێتەوە!

- کەواتا بۆچی ئامادە نەبوو لەبەر خاتری من دانیشێ و ژیان بەسەر ببات!

- ئەوە جیاواز بوو! ئێستاش دانیشتووە و دەژی! ئێستا چاو لە بابت بکە! حەتمەن لەبەر ئەوەی هەستی بریندار بووە! ئیدی نەیتوانیوە دەگەڵ بابت هەڵکا! ئەوە هۆکاری ئەوە نییە کە کارێکی خراپی کردبێ, یان نەیتوانیبێ خۆی بە پاکی بێڵێتەوە!

(( هیچی نەگوت. منیش بێدەنگ بووم.دە دەقیقە دواتر لە شوێنێك ڕایگرت و چێشتخانەیەکی پێشان دام و گوتی))

– بچین نانی نیوەڕۆ پێکەوە بخۆین؟

ـ نا سوهیل گیان, دەبێ بگەڕێمەوە ماڵێ!

(( وەڕێ کەوت و بیست دەقیقە دواتر گەیشتینە سەری کۆڵانەکەمان کە پێم گوت: هەر لێرە ڕایگرێ و نێیەتە ناو کۆڵانەکە. لە تەنیشت جادە ڕایگرت و کاتێك ویستم دابەزم گوتی))

– چاوەڕێکە ئەفسانە!

(( دواتر بە دەستی زنجیری زێری لە ملی دەرهێنا. پیتی یەکەمی ناوەکەی بوو بە ئینگلیزی. هێنایە پێش و گوتی))

– دەمەوێ ئەوە بدەم بە تۆ. وەك یادگاری.

ـ ئاخر...

– ئاخری پێ ناوێ! تۆ ئەوڕۆ زۆر شتت فێری من کرد!

(( دواتر زنجیرەکەی لە ملی کردم و گوتی))

– تەلەفونم بۆ دەکەی؟

ـ سبەی!

(( دواتر لە سەیارەکە دابەزیم و وەستام تا وەڕێ کەوێ و بڕوات! دواتر بۆ لای ماڵێ چوومەوە و چوومە گەراجەکە و ئاڕایشکەم خاوێن کردەوە. زنجیرەکەم لە ملم کردەوە. یەك(( S )) ی گەورەی زێڕ! قورس بوو! هەموو ئەو کاتانەی کە شتم لە کوڕان وەردەگرت زۆر خۆشحاڵ بووم, بەڵان ئەو جارەیان نا! ئەو جارەیان لەبەر پارەکەی خۆشحاڵ نەبووم! ئەو زنجیرە مانایەکی دیکەی هەبوو بۆم! ئاشقی ببوم!

(بێدەنگی)

- دەزانی من ئێستاش ناوت نازانم! ؟ خێزانەکەتم پرسی و دەزانم, بەڵام ناوت نا!

ـ ناوم تەرانەیە!

- تەرانە؟! تۆ ئاشقی ئەو کوڕانە ببوی؟

ـ نازانم! لەوانەیە! یانی بەڵێ!

- ئاشقی هەموویان؟!

ـ پێم وا بێ! یانی لەو کاتە دا و لەو تەمەنەدا, کچ زوو ئاشق دەبێ! تەنها ئەوەندە بەسە کە چەند مەرجێك هەبن!

- چ مەرجێك؟

ـ کوڕە باڵای خراپ نەبێ و چەند ساڵێك لە کچەکە گەورەتر بێ! سەیارەی هەبێ و کەمێکیش نهێنیی پارێز بێ! هەر ئەوەندانە بەسن!

- بەڵێ! پێم وا بێ هەر ئەوانەن کە باسیان دەکەی! بەهەر حاڵ ئەو شەوە, کە دەمویست بنووم هەستم کرد کە ئاشقی بووم! ئیدی بۆ پارە نەمدەویست! دەمویست لەگەڵی بمێنمەوە! دەمویست خۆشی بوێم! زۆر شتی دیکەش کە زۆر بۆم گرنگ بوون!

بەیانییەکە دەرسم هەبوو. کاتێك بابم لە ماڵێ چۆ دەرێ! تەلەفونم بۆ کرد و سەعاتێك دواتر لە دووم هات و سوار بووم و وەڕێ کەوتین! سەرەتا چووینە پارکی جەمشیدیە و تا لای نیوەڕۆ لەوێ بووین. پیاسەمان دەکرد. زیاتر ئەو قسەی دەکرد. لە بارەی کارەکەی و شریتەکەی. منیش گوێم گرتبوو کە لەناکاو گوتی:

- دەتەوێ گوێ لە شریتەکەم بگری؟!

ـ لە سەیارە دایە؟!

- نا! لە کارگەیە!
- یانی بچینە وێ؟
- بەڵێ!
- باشە با بڕۆین!

(( دووقۆڵی لە پارك هاتینە دەرێ و سواری سەیارە بووین. چووینە هەمان ئەو باڵەخانەیەی کە وێنەی لێ دەکێشا. سەرەتا تەلەفونێکی کرد و دوو پیتزای داوا کرد و دواتر منی دانیشاند لەسەر قەنەفێك و گوتی: هەر لێرە بمێنەوە و بۆخۆشی دەرگای یەکێك لە ژوورەکانی کردەوە و ڕۆیشت. کەمێك دواتر دوو مکەبەرەی گەورەی هێنان و دواتریش خودی تەسجیلەکەی هێنا! هەمووی لە هۆڵەکەدا ڕێکخستن و شریتەکەی خستە سەر تەسجێلەکە و گوتی))

- ئێستا چاوەکانت ببەستە, دەبێ بە تەواوی هەستتەوە گوێی لێ بگری!

(( چاوم لێك نان کە دووگمەکەی داگرت و کەمێك دواتر دەنگێك هات کە خەریك بوو بتۆقم! دەنگێکی وەك ئەوەی لۆرییەك نیوەی شەوێ لەسەر باڵەخانەیەکڕا ئاسن بەتاڵ بکات!دوای دەنگێکی وەك پێمەڕە هات! یەکێك خەریك بوو بە پێمەڕە لە قیڕی ڕا دەکێشا! دواتر دەنگی کوتك لێدان و دەنگی بزمار داکوتان, یان بزمار فڕێدانە ناو قاپێکی ئاسنی! ڕێك وەك ئەوەی یەکێك چووبێتە سەر باڵەخانەیەك و ئەو دەنگانەی تۆمار کردبێ!

ڕاستییەکەی سەرەتا پێکەنینم گرتبوو, بەڵام کەمێك دواتر کە تێپەڕی دیار بوو بەرەو خۆش بوون دەڕویشت!

ئەو دەنگانە کەمێك کپ بوونەوە و دواتر دەنگی کرێکارانی بینا هات کە هەندێ شتیان بە یەکدی دەگوت. دواتر دەنگی نەی یان فلوت کە سەرەتا نەرم بوو و کەم کەم بەرز بوو و دواتر دەنگی گیتار! ئاهەنگەکە خۆش ببوو کە دەنگی هونەرمەند

بەرز بۆوە! دەنگی سوهەیل بوو! خراپی نەدەگوت! یانی خراپی کە نەدەگوت هیچ, دەکرا بلێی دەنگێکی خۆشیشی هەبوو!

تەبعەن شیعری نەدەخوێندەوە, تەنها ئاااا ئاااا ئااااا ئاااا ی دەکرد, بەڵام بە ئاوازێکی تایبەت! دواتریش چەند کەسێك یارەمەتییان دەدا! وەکو گروپێکی هاودەنگ!

لەو کاتەدا ئیدی ئاهەنگەکە کەوتبۆ سەر سکە! دەنگی پێمەڕە و کوتك و کەرپوچ وەك جاز[1]ێکی لێ هاتبوو! جوان بوو بەڵان لەو کاتەدا هەندێ دەنگ بەرگوێ کەوتن! سەرەتا زۆر کز و لەسەر خۆ بوو دواتر وردە وردە بەرز بۆوە و ئاشکرا بوو! دەنگی ناخۆش! دەنگی هانکە هانك! هەروەها هەندێ شتی خراپتر! دەتگوت دوو کەس لە بن باڵەخانەوە...!

ڕێك لەوێ گۆرانییەکە تەواو بوو و پچڕاندی و گوتی:

- چۆن بوو؟

(( کەمێك سەیرم کرد و گوتم))

ـ کوێی ئەو شریتە کاری تۆیە و فکرەی خۆتە؟

- دەنگەکە کە هی خۆم بوو, گیتاڕەکەش بۆخۆم لێم دەدا.

ـ گۆرانییەکە کێ دایناوە؟

- هەمووی کاری خۆمە, بەڵام برادەرانیش یارمەتییان داوم. ئێستا بڵێ بزانم چۆن بوو!

ـ بەڕای من تۆ بەڕاستی لێهاتووی!

((پێکەنی و گوتی))

- بەڕاستتە ئەفسانە؟!

[1] جاز ئەو ساز و مۆسیقایەیە کە چەند تە پلێك و سینییەك پێکەوە بەستراون و نەفەرێك بە هەموویان مۆسیقا دروست دەکات.

ـ به خوای بەڕاستمە! ڕاوەستیٚ با له سەرەتاوە بیلێم چ هەستێکم هەبوو! سەرەتا نەفرەت! دواتر پێکەنین و گاڵتەجاڕ! دواتر وردبوونەوە! دواتر کەوتنه ژێر کاریگەرییەوە و کەمێك هەیەجان بوون و کاسبوون و بوونه بزمار! سوهەیل! من تا به ئێستا نەبووە هیچ گۆرانییەك یان شتێکی دی ئەو هەموو هەستەم لەسەر یەك پیٚ بدات! وە کاتێك گۆرانییەکی چەند دەقیقەیی بتوانیٚ ئەو هەموو کاریگەرییەی لەسەر مرۆڤ هەبیٚ, بەڕاستی دەبیٚ پێی بلێی کارێکی هونەرییە! شێوازێکی کار! شریتێك! بەس پێم بڵیٚ بۆ تەواوت نەکردووە؟!

(( خەریك بووم سەیرم دەکرد, چاوەڕیٚ بووم جوابم داتەوە, که له ناکاو چۆ سەر قەنەفێك دانیشت و دەستی به ڕووخساریەوە گرت و دەستی به گریان کرد! خێرا هەستام و چوومە تەنیشتی دانیشتم و گوتم))

ـ چییە سوهەیل؟! من خۆ قسەیەکی خراپم نەکردووە! به خوای ئەو گۆرانیەی داتناوە زۆر نایابە! به گیانی تۆ...

(( له ناکاو دەستی له ڕووخساری کردەوە و گوتی))

ئەفسانە! ئەفسانە! تۆ نازانی من ئێستا چ هەستێکم هەیە! تۆ نازانی لەبەر فکرەکانم چەندە سوکایەتیم پیٚ کراوە!

ـ ئاخر بۆچی؟!

(( هەستا و ڕۆیشت بۆ دەستشۆر ڕووخساری شرد و هاتەوە ژووریٚ و گوتی))

ـ هەر ئەو شریتەم جارێك بۆ بابم لیٚ دا! ئەوەندەی گاڵتە پیٚ کردم که وەك کرێکار قسەی دەکردن و دەیگوت: وەستا نیوە کەرپوچێکت ویٚ دەم؟! وەستا چیمەنتۆ لێك دەم؟! گیانەکەم!"

ـ بە ڕای من بابت هەڵەی کردووە. من ڕاستییەکەت پێ دەڵێم. بێجگە لەو بەشەی کۆتایی کە مرۆڤ وشك دەکات. هەستێکی زۆر خراپ دەداتە مرۆڤ. پێم وانییە ئیجازەت پێ بدەن!

– دەزانم! دەزانم! تەنیا تۆ پێم بڵێ لەو بەشەدا چ قسەیەك دەکات؟!

ـ لەوانەیە ڕاستییەك! هەستێکی پیس بەرانبەر بە دونیا!

(( لەو کاتەد لە جەڕەسیان دا. پیتزایان بۆ هێنابووین. سوهەیل پیتزاکانی وەرگرتن و لەسەر مێزی دانان و پێکەوە دانیشتین. ئارام ئارام بە بێ دەنگی سەرقاڵی خواردن بووین. هۆشم لە کنی بوو! زۆر سەیر لە فکر دا بوو! بەتایبەت منیش هیچم نەگوت تا بیری ئاڵۆز نەکەم.

کاتێك نانی نیوەڕۆمان خوارد, هەستام و کارتۆنەکانم فڕێ دان و بە کلێنس مێزەکەم خاوێن کردەوە و چوومە چێشتخانە, کتریەکەم شرد و ئاوم تێکرد و لەسەر غازم دانا و غازەکەشم پێ کرد. هەتا گەڕامەوە دیتم لە پێش دەرگی چێشتخانە ڕاوەستاوە و بە پێکەنینەوە سەیرم دەکا! سەیرێکم کرد و گوتم))

ـ هەڵەیەکم کردووە؟

– نا!

ـ خۆ حەزت لە چا هەیە؟!

– بەڵێ!

ـ ئێستا ئاوەکە گەرم دەبێ و دێمی دەکەم!

(( دووبارە پێکەنی و ڕۆیشت! منیش بە دوایدا ڕۆیشتم و لەسەر قەنەفە دانیشتین کە پێم گوت))

ـ سوهەیل ئەو کارە تەواو بکە!

– کامە کارە؟!

ـ شريتەكە ! زۆر جوانە !

– سوودى چييە ؟ مۆڵەتى پێ نادەن !

ـ ئەو بەشەى كۆتايى كەمێك نزمتر بكە ! دەنگەكەى نزم بكەوە و كورترى بكەوە. بە شێوەيەك كە لە ناو ئەوانى ديكەدا ون ببێ و تەنيا كەسێك لێى تێبگات كە چەند جارێك گوێى لێ بگرێ !

(( كەمێك بيرى كردەوە و دواتر پێكەنى و گوتى))

– دەڵێى ئەتۆ بێنم و بتكەمە بەرێوەبەرى بەرنامەكان ! ئەو شتانەى كە تۆ باسيان دەكەى زۆر نايابن !

ـ سوهەيل ! كاتى ئەوەيە كە هەندێك هێور تر سەيرى دونيا بكەى !

– ناتوانم !

ـ دەبێ بتوانى !

– نابێ !

ـ ئاخر بۆچى ؟ !

– كاتێك چوار دەورم هەمووى پيس و پۆخڵە, چۆن دەتوانم بە ئارامى سەيرى دونيا بكەم ؟ ! چۆن بتوانم لەگەڵ پيس و چەپەڵ بێمەوە و نەرم بم دەگەڵيان ؟ !

ـ لەوانەيە ئەو شتانە بە ڕاى تۆ پيس و چەپەڵ بن ! لەوانەيە لە ڕاستيى دا وا نەبێ !

– بۆچى نا ؟ هەيە ! دانەيەكيشم پێ گوتوى !

ـ چى ؟ !

– دايكم ئيدى !

– ئەوە خۆ تەنها هەستێكى ڕەش و كوێرانە بوو لە زەينى خۆتدا !

(( چاوێكى لێ كردم و گوتى))

- هەر بەڕاست تۆ ئاوا بیر دەکەیەوە؟!

- بەڵێ! نازانم چۆنە ئەو وێنایەت لە زەینتدا دروست کردووە! تۆ تا چەند ماوە دایکت دەبینی؟!

- لەوانەیە دوو هەفتە جارێك.

- ئەوە خۆ زۆر کەمە! تا ئێستا بووە جانتا هەڵگری و بڕۆی بۆ چەند ڕۆژێك لە کنی بمێنیەوە؟

- نا!

- بۆ چی؟!

- نازانم!

- بەڵان من دەزانم! دەترسی لەوێ هەندێ شت ببینی کە شك و گومانەکەت وەڕاست بگەڕێ!

(( سەری نەویی کرد. چوومە کنی دانیشت و گوتم))

- بڕۆ! بڕۆ تا دڵنیا بی! کاتێك تێگەیشتی ئیدی ئازاد دەبی!

- ئەگەر بەڕاستی کە من بیرم لێ دەکردەوە چی؟

- خۆ ئێستاش بۆ تۆ هەر وایە! تۆ پێت وایە داکت کاری خراپ دەکات! ئیدی چ جیاوازییەکی هەیە؟ بەڵام ئەگەر بۆت دەرکەوت کە دایکت پاکە, زۆر شت دەگۆڕێ بۆت! هەر چەند کە شك و گومانەکەت ئەسڵ و ئەساسێکی نییە!

- بۆ نا, هەیە!

- مەگەر تۆ پێت نەگوتم تا ئێستا نە هیچت دیوە و نە هیچیشت گوێ لێ بووە؟!

- لە بارەی دایکمەوە نا!

- ئەی چی؟!

(( جگەرەیەكی پیێ كرد و بێدەنگ بوو. لێی گەڕام هەر كات حەزی لیێ بوو قسە بكات. هەستام و چوومە چێشتخانە. ئاو گەرم ببوو. چای وشكم دیتەوە و لە كتریم كرد و ئاویشم تێكرد. دووبارە هاتە بەردەم دەرگای چێشتخانە و سەیری كردم. پێكەنیم و چەند فنجانێك كە لەسەر كابینەیتخانە چیێ بوون هێنامنە خواریێ شردمن و لە شوێنی قاپانم دانان و گوتم))

- ئێرە تۆزی زۆر لەسەر نیشتووە, ئەگەر پەڕۆیەكی لیێ بیێ هەندێكی خاوێن دەكەمەوە.

- نا, نیمانە. تۆش ئەزیەت مەكێشە. ئێرە شوێنی كارێمە.

- ئیێ باشە خۆ دەبیێ شوێنی كاریش خاوێن بیێ. لە شوێنێكی خاوێن باشتر دەتوانی ئیش بكەی!

(( هیچی نەگوت و چوو بۆ هۆڵەكە. منیش دەستم كرد بە هەندیێ قاپ شردن كە بانگی كردم))

- ئەفسانە! نایەی؟!

- با ئەو قاپانە بشۆم ئەوجار!

- لێیان گەڕیێ! دوای چەند ڕۆژێكی دی دەڵێم یەكێك بێت هەمووی خاوێن كاتەوە. وەرە ئیشم پێی!

(( چوومە هۆڵەكە و دەستم ئیشككردنەوە كە گوتی))

- وەرە ئێرە لە تەنیشتم دانیشە.

(( چوومە سەر قەنەفێك و لە كنی دانیشتم. هەڵوەستەیەكی كرد و دواتر گوتی))

- بە ڕای تۆ من شێتم؟

(( پێكەنیم و گوتم))

- بۆچی ئەو پرسیارەت كرد؟!

- تکا دەکەم جواب دەوە!

ـ تەواوی هونەرمەندان وانە! بەڵام شێت نین! تەنها مرۆڤە سادەکان ناتوانن بە ڕاستی لێیان تێ بگەن!

- من بۆ خۆم دەزانم, هەندێ جار زۆر تێکدەچم!

ـ من لەو ماویەدا هیچی خراپم لە تۆ نەدیوە!

- ئاخر هێشتا زوویە!

ـ چۆن تێکدەچی؟!

- خوو و ڕەوشتم خراپ دەبێ!

ـ لەوانەیە ئەوە بە هۆی ئیشەکەتەوە بێ!

- ئیش و شتی دیکەش!

ـ چ شتێك؟! حەتمەن دایکت!

- گومان! گومان وەك نەخۆشی دەکەوێتە گیانم! هەندێ جار شێتم دەکات.

ـ ئاخر من نازانم کاتێك تۆ نە هیچت دیوە و نە هیچت گوێ لێ بووە, بۆچی ئەوەندە بەدبینی؟!

(( دووبارە بێدەنگ بوو و دوای کەمێکی دی گوتی))

- کاتێك بابم دووبارە ژنی هێنایەوە, یەکەم ساڵی زانکۆم بوو. نزیکەی بیست ساڵ بووم. ئەو ڕۆژەی کە دەستی ژنەکەی گرت و هێنایەوە ماڵێ, قەت لە بیرم ناچێتەوە! ئەوەندە حەپەسابووم کە هەتا قسەشم پێ نەدەکران! بۆ ئەوەی کە جوابی سەلامەکەیان بدەمەوە!

ـ بۆچی؟! دەبوو تۆ چاوەڕێی ئەوەت کردبا, وەك چۆن من دوای مردنی دایکم چاوەڕێی بووم!

- ئاخر ئەو ژنەی کە هاوسەرگیریی لەگەڵ کردبوو زۆر جحێڵ بوو!

- ئێ باشە زڕ دایکی منیش زۆر گەنجە! جیاوازیی تەمەنیان لەگەڵ بابم زۆرە!

– یانی نزیکەی بیست و چوار پێنج ساڵ؟!

- ئەوەندەش نا, بەڵام ئەویش گەنجە!

– ئەو ژنەی کە بابم هاوسەرگیریی دەگەڵ کرد, بیست و یەك ساڵ بوو. یانی نزیکەی دوو ساڵ لە من بچووکتر بوو. ئەو ڕۆژەی کە هێنایەوە ماڵێ گوتی: لەوڕۆ بەولاوە ئەوە داکتە, ڕاستییەکەی سەرەتا پێکەنینم پێ هات و سەرم سوڕ ما! ئەو دەکرا خۆشەویستی من بێت!

- هەرچی چۆن بێ ئەو شتانە ڕوو دەدەن! بابت دەوڵەمەندە و زۆر کچی جحێڵ ئامادەن هاوسەرگیریی دەگەڵ بکەن! ئێستا وەزعەکە ئاوای لێ هاتووە ئیدی! تۆ دەبێ ڕوونتر لەوە بیر بکەیەوە!

(( پێکەنی و جگەرەیەکی دیکەی پێکرد و گوتی))

– ئەو ڕۆژە بە بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکەم, چوومە ژوورەکەم و توند دەرگام لەسەر خۆم گەڵە دا, کە دوای من بابم هاتە ژوور! تووڕە بوو و کارێکی کرد کە ئەسڵەن چاوەڕێم نەدەکرد! وەك دووژمنێك! یەقەی گرتم و توند بە دیواری دادام و گوتی:" خوێڕی! لەمە بەدوا ئەوە دایکتە و لێرەدا دەژی! ئەگەر دەشتهەوێ کەرێتیی بکەی, بە شەق دەتکەمە دەرێ کە بچیە کن دایکە فلان و فلانت! باسی یەك قرپانیش نەکەی! تێگەیشتی؟!"

(( مژێکی لە جگەرەکەی دا و هیچی نەگوت, بە ئارامی گوتم))

– هەڵسوکەوتی بابت زۆر خراپ بووە!

(( بە تەوس خەندەیەکەوە گوتی))

- خراپ و سرکەر! بە چاوێکی ژەهراوییەوە سەیری کردم و هەڵەی کرد! زۆر هەڵە بوو! لە هەموو شتدا هەڵەی کرد! ئێستاش دەیکا!

- چی دەکرێ؟! هەرچی چۆن بێ بابتە! تۆ دەتتوانی بچیە کن داکت و لەگەڵ ئەو بژی!
- باری دارایی داکم باش نەبوو! ئێستاش باش نییە!

ـ ئەی کەواتا چۆن دەژی؟!

- من یارمەتیی دەدەم! مارەییەکەی دا, بە بارمتەی ئەوەی کە لەوێیە! ئەگەر من نەبام, دیار نەبوو چۆن بژیەت!

ـ ئێ؟! دواتر چی بوو؟!

- ئەو ڕۆژ و شەوە لە ژوورەکەم نەهاتمە دەر. بەیانییەکەش گوێم لێ بوو کە بابم خوا حافیزی لە زوهرە کرد و چۆ سەر کارەکەی!

ـ لە کێ؟!

- زوهرە!

خولاسە چاوەڕێم کرد تا دەنگی دەرگا هات و دواتر کە خەیاڵم ئاسوودە بوو لەوەی کە بابم ڕۆیشتووە, لە ژوورکەم هاتمە دەرێ. برسیم بوو! چووم دەم و چاوم شردن و چوومە چێشتخانە کە سەلامی لێ کردم! جوابم نەدایەوە چووم کە بۆ خۆم چا تێکەم, بەڵام نەیهێشت و بۆ خۆی بۆی تێکردم و لە سەلاجە نان و پەنیر و کەرە و مەرەبا و هەنگوین و شیر و خولاسە هەموو شتێکی هێنا و مێزەکەی پێ ڕازاندەوە. من یەك قسەشم دەگەڵ نەکرد, دانیشتم و سەرقاڵی خواردن بووم. هات دانیشت و هەر وا چاوی لێ دەکردم. ڕاستییەکەی شەرمم لێ دەکرد! نازانم بۆ, بەڵام هەستێکی شەرمنی لە لەشمدا پەیدا ببوو! لەوانەیە بە هۆی کرداری خراپی بابم! هاوسەرگیریی لەگەڵ کچێك کە بەڕاستی لە جێی کچی بوو!

کەمێك کە لەوێ دانیشت, دیتی کە هەتا سەیریشی ناکەم, هەستا و چۆ ژوورەکەی! منیش خێرا چەند پارویێکم خوارد کە زوو بچمە سەر دەرسەکانم.
تا لە جێی خۆم هەستام و ئاوڕم دایەوە, چی ببینم واووو!
ئەسڵەن بڕوام نەدەکرد! جلێکی خەوی دەبەر کردبوو کە هەموو لەشی تێڕا دیار بوو! خێرا سەرم لەبەر خۆمنا و چوومە ژوورەکەم و دەستم کرد بە دەرس خوێندن! ئەوەندە ترسابووم کە دەستم دەلەرزین! خێرا هەستام و دەرگاکەم گەڵە دا! کتێبم هێنا بۆ پێش خۆم بەڵام چاوم هیچیان نەدەدین! بەدبەختی ئەوە بوو کە لە هەفتەدا تەنها چوار ڕۆژم لە دەرس هەبوون دەنا سێ ڕۆژەکەی دیکە دەبوو لە ماڵێ مابامەوە!
خولاسە ئەو ڕۆژە لە ژوورەکەمدا مامەوە تا سەعات دوو و ئەو کاتانە بابم بۆ نانی نیوەڕۆ هاتەوە ماڵێ. کاتێك گوێم لە دەنگی دەرگای بوو, خەیاڵم ئاسوودە بوو و کەمێك دواتر بابم لەوێڕا هاواری کرد کە بچم نان بخۆم. بە هێواشی قفڵی دەرگاکەم کردەوە و چوومە دەرێ و سەلامم لە بابم کرد و چوومە چێشتخانە و لە سەر مێزەکە دانیشتم. جورئەتی ئەوەم نەبوو سەر بەرز بکەمەوە و چاو لە زوهرە بکەم! دەترسام! یانی شەرمم دەکرد کە بەو جلانەوە بیبینم!
دوای کەمێك هاتە چێشتخانە و هەر کە گەیشتێ بە بەرزی دەستی کرد بە قسەکرد! کاتێك سەیرم کرد, دیتم جلەکەی گۆڕیوە و جلێکی ئاسایی دەبەر کردووە! کەمێك دواتر بابیشم هات و زوهرەش نانی تێکرد و لەسەر مێزەکەی دا نا و گوتی:" بەڕاستی سوهەیل کوڕێکی باشە هاااا! ئافەرین بۆ ئەو پەروەردە و ئەدەبە! ئەوڕۆ هەم دەرسەکانی خوێندووە و هەم یارمەتیی منی داوە! " هەر کە ئەوەی گوت, واقم وڕما! زۆر بە ئاسانی خەریك بوو درۆی دەکرد! من ئەو ڕۆژە یەك وشەشم قسە دەگەڵ نەکردبوو! لە ژوورەکەشم نەهاتبوومە دەرێ! ئەویش

ئاوا بە ئاسانی درۆی دەکرد! کە نانم خوارد, هەستام و چوومە ژوورەکەم, کەمێك دواتریش بابم بە پێکەنینەوە هات و دەستێکی لە پشتم دا و پارەی لە باخەڵی دەهێنا و گوتی:" ها بگرە لە گیرفانتی باوێ! لەمڕۆ بە دواوە پارەی هەفتانەت دوو هێندەیە!"

(( جگەرەیەکی دیکەی پێ کرد و بێدەنگ بوو! لێی گەڕام دیسان بۆ خۆی وە قسە بێ. کەمێك دواتر گوتی))

- چەند ڕۆژێك تێپەڕی! ڕاستییەکەی ڕقم لێ نەدەبۆوە! بە هاتنی خوو و ڕەوشتی بابیشم باش ببوو و بە ڕاست و چەپدا پارەی وێ دەدام! ئیدی کاتێکیش دەمویست لەگەڵ هاوڕێیان بچمە دەرێ, ڕێگری لێ نەدەکردم! ڕێگری لێ نەدەکردم هیچ, زۆریشی پێ خۆش بوو, چونکە بەتەنێ لەگەڵ زوهرە دەمایەوە! منیش بەو وەزعە ڕازیی بووم! جار جارەش قسەم لەگەڵ زوهرە دەکرد, وەلێ تەنها ڕستەی کورت کورت بوون!

دوای مانگێك, تەقریبەن وەزعی ماڵێ ئاسایی ببۆوە! یانی هەم عادەتم بە بوونی زوهرە گرتبوو و هەم ئەویش بە بوونی من! بە تایبەت کە دەمدی زۆر ئیشانم بۆ دەکات, زۆرتر ڕێزم دەگرت! جلەکانمی دەشرد, ژوورەکەی بۆ خاوێن دەکردمەوە, هەرچییەك لە خواردن کە حەزم لێ با بۆی ئامادە دەکردم! زۆر بە ڕێك و پێکی وەسفی دەکردم و بەرگریی لێ دەکردم!

ماوەیەك کە تێپەڕی, شەوێك بابم گوتی: کە دەبێ بچێتە باشوور تا هەندێ پێداویستیی بۆ فرۆشگاکەی بێنێ! جار جارە دەچۆ باشوور و ئەشایی دێنا. بڕیار وا بوو کە دوو ڕۆژی پێ بچێ و بگەڕێتەوە! بەیانییەکە کە لە خەو هەستام بابم ڕۆیشتبوو! منیش وەك عادەتی خۆم نانی بەیانیم خوارد و چوومە سەر دەرسەکانم! نیوەڕۆش هەر وا, نانی نیوەڕۆمان خوارد و زوهرە سەرقاڵی شردنی

قاپەکان بوو و منیش چوومە ژوورەکەم. عەسر بوو کە بانگی کردم. ڕۆیشتمە دەرێ. میوەی بۆ دانابووم. سوپاسم کرد  چوومە مدبەق. ئەویش هات دانیشت و گوتی: هەر بەڕاست تۆ کوڕێکی باشی, یان لە کن من وا خۆت پێشان دەدەی؟! تەنیا سەیرم کرد کە دووبارە گوتی: بە خوای شێت بووم لەو ماڵەدا! گوتم: دەتەێ ئەمشەو بچینە سینەما؟ گوتی: بەڵێ! بۆ نامەوێ؟! گوتم: باشە ئامادەبە سەعاتێکی دی دەڕۆین. گوتی: باشە.

سەعاتێك دواتر جلمان دەبەر کردن و چووینە دەرێ. چووینە سینەما... کە فیلمێکی تازەیان هاویشتبۆ سەرێ. هەر لەو فیلمە...! خولاسە کە فیلم تەواو بوو, هاتینە دەرێ و لەسەر ڕێ گوتی با بۆ ئێوارە باسترمە[1] بخۆین. ئەویشمان کڕی و گەڕاینەوە ماڵێ و جلەکانمان گۆڕین و زوهرە مێزەکەی ئامادە کرد. منیش ساندویجێکم بۆ خۆم دروست کرد و تا ویستم بیخۆم, گوتی نابێ باسترمە بەتەنێ بخورێ! گوتم: دەبێ لەگەل چیی بیخۆی؟! گوتی: چاوەڕێکە!

هەستا و چوو لە سەلاجە بتلێك ویسکیی دەرهێنا و لەسەر مێزی دا نا و گوتی: دەبێ لەگەڵ ئەوەی بخۆی! گوتم: من تا ئێستا نەمخواردۆتەوە! گوتی: هیچی وا نییە! تەنیا کەمێك مرۆڤ کەیفخۆش دەکات! گوتم: ئەگەر بابم بزانێ زۆرم لێ توڕە دەبێ! گوتی: ئەگەر من پێی نەڵێم بە کوێدا دەزانێ؟! گوتم: من ناخۆمەوە, تۆ بخۆوە! گوتی: بەتەنێ تامی نییە!

هەستا کە بتڵەکە لە سەلاجە باوێتەوە, ڕاستییەکەی نەمویشت بێتاقەتی بکەم, هەر بۆیە گوتم: باشە وەڵێ من تەنها کەمێك دەخۆمەوە! گوتی: ئێ منیش کەمێك دەخۆمەوە ئیدی!

---

[1] باسترمە: خواردنێکی تێکەڵەیە لە گۆشت و چەوری و بەهارات و ... کە دوای چەرخ کردن, دە کیسەیەکی  دەئاخنرێ و کوڵاوە.

دواتر بە پێکەنینەوە دوو پەرداخی هێنان و سەهۆڵی تێکردن و کەمێکیش ویسکیی تێکرد و کەمێك لە ئاوی پرتەقاڵیشی تێکرد و لە پێش منی دا نا.

پەرداخەکەی خۆی هەڵگرت و وتی: بە خۆشی!

منیش پەرداخێکم هەڵگرت و کەمێکم لێ خواردەوە! ئەوەندە تامی ناخۆش بوو کە حاڵی تێکدام, بەڵام بە ناچاری خواردمەوە! ئەویش دەستی کرد بە قسەکردن بۆم! باسی ڕابردووی دەکرد و چۆن چۆنی دەگەڵ بابم ئاشنا بووە و چەندە ناخۆشیی دیون لە ڕابرووردا و ئەو شتانە. زۆر بە جوانیش پەرداخەکەی هەڵدەگرت و دەیگوت: بە خۆشی و منیش کەمێك لە پەرداخەکەم دەخواردەوە.

پەرداخی یەکەم کە تەواو بوو, دووبارە بۆی تێکردمەوە. گوتم: من ئیدیی ناخۆمەوە. گوتی: زۆر کەمم بۆ تێکردووی! مەترسە! خۆ هیچت لێ نایە! مەگەر منداڵی؟! بەقەد قامکێکیشت نەخواردۆتەوە! نەکا توانای خواردنەوەت نەبێ کە ناخۆیەوە؟! خولاسە کەری کردم و پەرداخی دووەمیشم خواردەوە. کەمێك دواتر دیتم چاوم ڕێشکە و پێشکە دەکەن. ئیدی لە قسەکانی تێنەدەگەیشتم! خەریك بوو تێکدەچووم! سەرم گێژ ببوو و ئەو خانووە لە پێش چاوم دەسوڕایەوە! هەر چەند هەوڵم دەدا خۆم کۆنتڕۆڵ بکەم نەدەکرا!

هەستام کە بچمە ژوورەکەم بەڵام نەمتوانی. خێرا هات بن باڵی گرتم و یارمەتیی دام کە بچمەوە ژوورەکەم. هەر ئەوەندە ئاگام لە خۆم بوو کە خۆم هاویشتە سەر جێیەکەم! ئەوەندە حاڵم خراپ بوو, کە لە هیچ تێنەدەگەیشتم!

(( دووبارە بێدەنگ بوو و جگەرەیەکی دیکەی پێکرد و گوتی))

– حەتمەن ئەوەی دیکەی بۆ خۆت تێدەگەی؟! کاتێك چاوەکانم کردنەوە و کەمێك حاڵم هاتەوە سەر خۆی, تێگەیشتم کە لە سەر قەرەوێڵەی ئەو و لە ژوورەکەی ئەو دا نووستووم! ئاوڕم دایەوە چاوم لەولاتر کرد, کە دیتم ئەویش لە بەشەکەی

دیکەی قەرەوێڵەکە نووستووە! بۆ ساتێك چاوم بەستن و بیرم کردەوە! تازە هەموو شت بیرم دەهاتەوە! سات بە سات! بەش بە بەش!

لەناکاو دەستم کرد بە گریان! نەفرەتم لە خۆم و لە زوهرەش کرد! وا دەگریام, کە بە ترسەوە لە خەو ڕاپەڕی! هەتا ویستی قسە بکا, لە قەرەوێڵە هاتمە خوارێ و چوومە حەمام. ئەویش بە دوام کەوت! چوومە حەمام مووس تاو بدەمێ و دەمارم ببڕم! خۆی هاویشتە کن من و نەیهێشت! ئەوەندە ڕقم لێی هەستا بوو کە قورگم گرت خەریك بوو بیخنکێنم! هیچ بەرگرییەکی نەکرد تەنیا گوتی: ئەگەر بە کوشتنی من ئاسودە دەبی, کەواتا بمکوژە! گوتی: بۆ مەگەر ئێستا چیی بووە؟!

گوتم: ئێستا من چۆن بتوانم چاو لە چاوی بابم کەم؟! ئەسڵەن چۆن دەتوانم زیندوو بم؟! گوتی: بۆ چی؟! گوتم: بێ قیمەت ئاخر تۆ لە جێی دایکمی!

گوتی: کێ ئەو قسەیەی کردووە؟! من هەتا سیغەی بابیشت نیم!

واقم وڕما لێی! دەستی گرتم و بردمیە ژوورێ. خێرا جلم دەبەر کردنەوە و گوتم: مەگەر تۆ هاوسەرگیریت نەکردووە لەگەڵ بابم؟! گوتی: نا! گوتم: ئەی چی؟! گوتی: بابت هەر وا منی هێناوە بۆ ئێرە! وەعدی پێ داوم ئەگەر لێم ڕازیی بێ سیغەم بکات! گوتم: تۆ بۆ قبوڵت کرد؟! گوتی: لە ژیانی پێشترم باشترە!

ئیدی تێنەگەیشتم و توند زللەیەکم لێ دا و چوومە ژوورەکەم! دەرگام گەڵە دا و توند دەستم کرد بە گریان! نەفرەتم لە خۆم و لە زوهرە و لە بابم و لە هەموو دنیا دەبۆوە! نەمدەزانی دەبێ چیی بکەم؟!

(( دووبارە بێدەنگ بوو. سەری لە نێو دوو دەستی گرت و هیچی نەگوت. چووم پەرداخێك ئاوم بۆ هێنا و خواردییەوە و گوتم))

ـ دواتر چ بوو؟!

- هیچ! دوو سێ سەعات لە ژوورەکەمدا بووم  کە هات لە دەرگای دا. نەمدەویست کە دەرگای لێ کەمەوە, بەڵام ئەوەندە زۆری کرد تا مەجبور بووم. هاتە ژوورێ و دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵم. سەرەتا بە ئارامی و هاوڕێیانە! کاتێك دیتی هیچ لە قسەکانی قبوڵ ناکەم, دەستی کرد بە هەڕەشە!

گوتی: بە بابت دەڵێم کە ئەو بۆ خۆی مەشڕوبی خواردۆتەوە و شەوێ کە من نووستوو بووم, هاتۆتە کنم! پێم گوت: بابم من دەناسێ و تۆش دەناسێ! دواتریش حەتمەن دەرت دەکا لە ماڵێ! هەر کە ئەوەم گوت, پێکەنی! بە شێوەیەك پێکەنی کە بەڕاستی ترسام! گوتی: لە بیرت چوو ڕۆژی یەکەم چیی لەگەڵ کردی؟! ئەوجار, بابت ئەوەندە ئاشقی من بووە کە حەتمەن تۆ وەدەرێ دەنێ!

دەنگم نەکرد کە دەستی بە مووی پرچم دا هێنا و گوتی: سوهەیل کەر مەبە! من خۆشمدەوێی! کارێك مەکە کە ببمە دووژمنت و هەتا بابیشت ئامادە بێ خوێنت بڕێژێ! دەزانی ئەو کاتانە کە خوێن بەری چاوی مرۆڤی گرت, باب و کوڕ یەکتر ناناسن!

((دووبارە بێدەنگ بوو و جگەرەیەکی دیکەی پێ کرد و کەمێك دواتر گوتی))

- ئێستا تێگەیشتی چەند بریندارم؟!

- دواتر چی؟! یانی ئێستاش هەر ئاوان؟!

- نا! یانی تا ماوەیەکیش هەر وا بوو, بەڵام من بە هەر بەدبەختییەك بێ ڕازیم کرد کە من بچمە قاتێکی دیکە لەو باڵەخانەیە ژیان بەسەر ببەم! دواتر پەیوەندییم دەگەڵ کەم کردەوە, تا ئاخیرەکەی هەر نەدەما! ئەویش کە دیتی وەزعەکە ئاوایە, وازی لێ هێنام!

- چەندی خایاند؟

- تەقریبەن ساڵێك وەزعەکە وا بوو! بەخوای ئەفسانە من هەمیشە ڕقم لێ بووە, بەڵام دەترسام! دەترسا بابم لە ماڵێ وەدەرێم کا!

ئەوکات, هەم من بێچارە دەبووم هەم دایکم! چونکە خەرجەکەی من دەمدا! لەو پارەیەی کە بابم وێی دەدام! هەموو کات ئازارم هەبووە! ئێستاش هەر وا! شێت بووم! هەر لەو کاتەوەش دمم بۆ ئەو شتە پیسە نەبردۆتەوە!

- بۆچی؟!

- بۆئەو مەشڕوبە پیسەی کە ئەو هەموو بەڵایانەی تووش کردم! تۆ نازانی من چ حاڵێکم هەیە! ئەوە چەند ساڵێکە کە شەوانە دەنووم, هەزار شتی خەراپم دە خەوێ دێ! وەك شێتانم لێ هاتووە! ئازاری ویژدان لە کۆڵم نابێتەوە! حەز دەکەم خۆم بکوژم! تا ئێستاش چەند جار ویستوومە ئەو کارە بکام, بەڵام غیرەتم نەبووە!

(( دووبارە بێدەنگ بوو. سەری لەبەر خۆی نابوو. قورگی گرابوو. بە دەنگێکی گراوەوە, وەك چۆن چاوی لە عەردی دەکرد, گوتی))

- زۆر بێ شەرم بوو! لە پێش بابم کاری وای دەکرد کە خەریك بوو لە ترسان بمرم! یانی ئەگەر بابم دیتبای, ڕێك هەردووکمانی دەکوشت! بۆ وێنە تا بابم دەچۆ ئەو ژوورە, خۆی هەڵدەدا و ماچی دەکرد! یان بۆ نموونە ئەگەر بابم پشتی لە ئێمە با, دەستی بە ڕوخسارمدا دێنا!

ئەوەندە ترسام و ترسام, تا ئاخیرەکەی نەخۆش کەوتم! بەرهەنگم گرت[1]! تووشی تەنگە نەفەسیی بووم! لە ترس و شەرمنی و ئازاری ویژدان!

[1] بەرهەنگ: واتا نەخۆشیی تەنگە نەفەسی یان هەناسە تەنگی.

بە هۆی ئەوەی کە بابم دەهاتەوە ماڵێ، حاڵەتێکی توڕەیی تووشم دەبوو و هەناسەم دەگرا! بە شێوەیەك حاڵم خراپ دەبوو کە بابم بردمیە دکتۆر! هەموویان دوای تەواوی فەحس و ئەو شتانە گوتیان: کە حاڵەتێکی توڕەییە! دەیانگوت: بۆی هەیە بەهۆی دەرس و ئەو شتانەوە بێت، بەڵام بۆ خۆم دەمزانی هۆی چییە! ئێستا عەجەب ئەوەی کە ڕێك بە پێچەوانەی من، زوهرە هەر گوێشی لێ نەبوو! هەرچەند داوام لێ دەکرد و لێی دەپاڕامەوە کە وازم لێ بێنێ، سوودی نەبوو و خەراپتر دەبوو! ئاخیرەکەی هەڕەشەی ئەوەی لێ کردم کە بە بابم دەڵێ! هەر لەو کاتەوە ڕقم هەم لە ژن و هەم لە کچ بۆوە! ئەسڵەن حەساسەتم بەو مەسەلەیە دروست بوو! تا ماوەیەکی زۆر جیا لەوان ژیانم بەسەر برد، بۆ کن هیچ کچێك نەدەچووم! نەفرەتم لێیان دەکرد، تا ئەوە بوو لەگەڵ ساحێل ئاشنا بووم. پێم وا بوو ئەو لە تەواوی کچانی دی جیاوازە، وەلێ تێگەیشتم کە ئەویش وەك هەمو ئەوانی دیکەیە!

ـ هەر لەبەر ئەوەیە کە هەمیشە گومانت لە دایکت هەیە؟

– بەڵێ! چونکە ئەویش ژنێکە وەکو هەمووانی دی!

ـ ئەو دایکە! دایك جیاوازە! ئەگەر ئەو قسەیەی تۆ ڕاست بێ، کەواتا منیش وەك ئەوانی دیکەم! ڕاستە؟

– نا! پێم وایە تۆ جیاوازی!

ـ دەربارەی ساحێلیش هەر وا بیرت دەکردەوە!

– نا! نا! دڵنیام کە تۆ وەك ئەوانی دیکە نی!

ـ ئێستا ئاخیرەکەی چیی بوو؟!

- تا ساڵێکیش دواتر تووشی حاڵەتی تورەیی دەبووم, بەڵام دوای وردە وردە باش بووم. وەلێ ئێستاش کابووسم بەردەوامە! زۆر شەوان خەوی خراپ و ترسناك دەبینم! بە شێوەیەك کە بە هات و هاوار لە خەو دەردەپەڕەم!

ـ ژیانێکی قورست هەبووە!

- ئەفسانە! ئەوانەی کە پێم گوتی نهێنییە! حەز ناکەم کەس بزانێ! تەنیا بە تووم گوتووە!

(( پێیی پێکەنیم و گوتم))

ـ خەیاڵت ئاسوودە بێت! هەتا لە دڵی خۆشمدا دووبارەیان ناکەمەوە!

- سوپاس! دەزانم کە ڕاست دەکەی!

ـ تۆش وردە وردە ڕابردوو لە بیر کە! هەڵەیەك بووە و ڕۆیشتوە! گرنگ ئەوەیە کە دووبارە نەبێتەوە!

- ڕاستی ئەم شەوی هەینییە بانگهێشتیی میوانییەکم هەیە! دەتوانی بێی؟

ـ نازانم.

- پێم دەڵێیەوە؟

ـ با بزانم! تەلەفونت بۆ دەکەم.

(بێدەنگی )

- تەرانە؟! ئاگات لە منە؟!

ـ بەڵێ! بەڵێ!

- هەر دەڵێی لێرە نی!

ـ بۆ نا! گوێم لە هەمووی گرت!

- تۆ شتێکتە! من دەزانم!

ـ نا! هیچم نییە!

– با, هەتە, بەڵام ناتەوێ بە منی بڵێی!

ـ باقیی چیرۆکەکە باس بکە.

– ئیدیی بەسە. ئەوەی دیکە با بۆ دوایی بێ.

ـ نا! بڵێ, کاتمان هەیە!

– با بۆ جاری داهاتوو بێت, دەڵێی حاڵت باش نییە!

ـ بۆچی وا بیر دەکەیەوە؟!

– من منداڵ نیم! ئێمە زۆر باش یەکتر دەناسین! کاتێك دوو ژن نیو سەعات سەعاتێك لە کن یەك دانیشتوون, هەردووك لە حاڵی یەکتر تێدەگەن! لەو غەم و پەژارەی کە لە دڵی یەکتر دا هەیە! منیش دەزانم دنیایەك غەم و پەژارە لە دڵی تۆ دا هەیە, بەڵام ناتەوێ وە سەر خۆتی بێنی!

(بێدەنگی )

هەر کەسێك لە دونیا دا غەم و پەژارەیەکی هەیە, منیش وەك یەکێك لەوان!

– پێم بڵێ, لەوانەیە بتوانم یارمەتیت بدەم!

ـ هیچ شتێکت بۆ من پێ ناکرێ!

– پێت وایە تۆشتێکت بۆ من پێ دەکرێ!

ـ لەوانەیە!

– کەواتا زۆر هەڵەی! ئەو شتانە تەنها ڕواڵەتین! تۆیان بۆ من هەڵبژاردووە, کە هەر چۆنێك بێ یاساکە جێبەجێ بکەن, دەنا زۆر چاك دەزانم لە دادگا هیچ کارێکت بۆ من پێ ناکرێ! کەواتا بۆ وەکالەتی منت قبوڵ کرد؟

ـ ناچاری! ئەی تۆ بۆ قسەت لەگەڵ کردم؟

– چونکە کەیفم پێ هاتی! هۆیەکی دیش ئەوە بوو کە من پێویستم بە یەکێك بوو قسەی بۆ بکەم. مرۆڤ ئەگەر لە زیندان بەتەنێ بمێنێتەوە, شێت دەبێ! هەر

ئەوەندەی دەمزانی دێیە سەردانم و ژیانمت بۆ باس بکەم, زۆر بوو! ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کە لە زیندان دا هزرم ڕێك کەمەوە و خاوێن بیّ!

ـ لەوانەشە توانیم لە دادگا یارمەتیت بدەم!

– ئەوەیان کە زۆر گرنگ نییە! گرنگ ئەوەیە کە وەك هاوڕێیەك دانیشتووی و گویّ لە قسەکانم دەگری! هەر ئەو ڕێگەیەش کە هەفتەی دوو سیّ جار دێی قورسە!

ـ من زۆر گەشبینم بە فایلەکەت!

– تەرانە؟!

ـ ها!

– کاتێك ژنێك ئەوەندە چاوی غەمگینە, حەتمەن پێی ژنێکی دیکە هاتۆتە ناو ژیانی مێردەکەیەوە! وایە؟!

(بێدەنگی )

– من دڵنیام کە کێشەی تۆ کێشەی ماڵ و دارایی و ئەو شتانە نییە!

(بێدەنگی )

– باشە ناچارت ناکەم بۆم باس بکەی!

ـ ئیّ, دواتر چیی بوو؟!

– هیچ, ئیدی ئەو ڕۆژە کەمێك دواتر منی گەیاندەوە ماڵیّ و بۆخۆشی ڕۆیشت. ئیدیی ئەو جارە هەموو شتێکم بۆ شوکا باس نەکرد. تەنیا مەسەلەی شریت و ئەو شتانەم بۆ باس کرد. شوکاش کەمێك ئامۆژگاریی کردم و مەسەلەکە تەوا بوو. بەرنامەی پێنجشەمەشم لەگەڵ شوکا ڕێك خست و بەهانەیەکم دروست کرد کە بابم تێنەگات. تا پێنجشەمەش یەك دوو جار پێکەوە قسەمان کرد. باقیەکەی با بۆ جاری داهاتوو بێت کە هاتی.

(بێدەنگی)

– کچەکەت حاڵی باشە؟

ـ ئەفسانە؟!

– گیانی ئەفسانە!

ـ ئەگەر مێردێك خیانەت لە ژنەکەی بکا, خەتای ژنەکەیە یان نا؟

– پەیوەندیی هەیە!

ـ بە چی؟

– زۆر شت!

ـ بۆ نموونە؟

– یەکەم شت ئەوەیە کە ئەو پیاوە چۆن بیر دەکاتەوە! یانی تا چ ڕاددەیەك هەق بە خۆی بدات!

ـ یانی چی؟!

– زۆر جار پیاوان زیاد لە حەد ماف بە خۆیان دەدەن! یاساش کە پشتگیرییان دەکات! ئەوکات لە بن سەریان هەڵدەدا!

ـ یانی خیانەت دەکەن؟!

– ئەوان ئاوا سەیری وەزعەکە ناکەن! ئەسڵەن ناوی خیانەتی لێ نانێن! بە وتەی خۆیان برنج و شلە, یان ساوار! بۆ ئەوان جۆرێك جیاوازە!

ـ ئەوکات داوای ژن چیی دەبێت؟

– دیسان پەیوەندیی هەیە بەو ژنەوە! دەبێ چاو لێ کەی داخوا ئەو ژنە کێیە!

ـ چ پەیوەندییەکی هەیە؟

– پەیوەندیی زۆرە! ئەگەر ژنێك بێ کە هیچ دەسکەوتێکی نەبێ, دەبێ دانیشێ و بسوتێ و ئامادە بێت!

ـ ئەگەر دەسکەوتی هەبێ چی؟!

– ئەوكات وەك تۆی لێ دێ!

(بێدەنگی )

ـ ئەگەر وەك من بوو دەبێ چ بکەی؟

– داش بە داش!

ـ ئەگەر بەڕەڵای کەم دەزانی چیی بەسەر دێ؟!

– دز هەتا نەگراوە پاشایە! دەبێ وریا بێت!

ـ ئەگەر پیاوێك خیانەتی لە ژنەکەی کرد, حەتمەن ئەو ژنە خەتای هەیە!

– نا! لەوانەیە هەندێ جار وا ببێت, بەڵام هەموو کات بەو شێوەیە نییە! بۆ وێنە کاتێك پیاو سەیارەیەك دەکڕێ و دوو ساڵ دواتر دڵی لێ دەدا و دەچێ سەیارەیەکی مۆدیل بەرزتر و جوانتر دەکڕێ, هۆکارەکەی چییە؟!

(بێدەنگی )

– مێردەکەت خیانەتت لێ دەکات؟

(بێدەنگی )

– وڵام دەوە دەی! مەترسە! خۆ سەرزەنشتت ناکەم!

ـ وای بۆ دەچم!

– دڵنیای؟!

ـ پێم وا بێت!

– هەتا دڵنیا نەبی نابێ هیچ کارێك بکەی هاا!

ـ دڵنیام!

– چاودێریت کردووە یان کەسێك هەواڵی پێ داوی؟!

ـ یەك دوو نەفەر دیویانە. یەکێك جیرانەکەمان و یەکی دیش پۆستەچی.

– پۆستەچی؟!

ـ لەو پۆستەچییە ماتۆڕیانە! پارەم پیٚ دا کە چاودیٚریی میٚردەکەم بکات.

– چی دیکە؟

ـ لەگەلٚ ژنیٚك چۆتە بنکەی مەسکین. وستویە باڵەخانەیەك بە کریٚ بگریٚ.

– ئیٚ کەواتا تەواوە!

ـ پیٚم وایە!

– نەکا ڕۆژیٚك بتەویٚ بلٚیٚی من براوەم و یان بتەویٚ لە کاتی خۆیدا بیگری هاا! ئاوا تەنیا ئیشەکەی بۆ ئاسانتر دەکەی!

ـ ئەی چ بکەم؟!

– گویٚی مەدەیە!

ـ یانی چی؟!

– وەك ئەوەی کە هەر مرۆڤیش نەبیٚ!

ـ چۆن وا دەبیٚ؟!

– بۆ نابیٚ؟! وەختیٚك ئەو خیانەتی لیٚ کردووی, یانی پەیمانەکە هەلٚوەشاوەتەوە! تۆ کاتی پەیمانەکە, خۆ بڕیاری وات نەداوە؟!

ـ کیٚ ئەو ئیجازەیە بە میٚردەکەی دەدا؟!

– ئیٚ هەرچی بیٚ ئەو لە ڕاستیدا مامەلٚەکەی تیٚك داوە! خیانەتی لە شەریکایەتی دا کردووە! خیانەتی لە هاوبەشەکەی کردووە!

ـ پیٚت وایە ئەوەی کە دەیلٚیٚی ڕیٚی ڕاستە؟!

– حەتمەن وا بیر دەکەیەوە کە ژنیٚکی زیندانی ئەگەر ئاقلٚ با, لە زیندان نەدەبوو ها؟!

ـ نا! بەلاٚم...!

- گویّ بگرە تەرانە! تۆ ئەگەر ئیسپاتی بکەی کە مێردەکەت دەگەلّ ژنێکی دی پەیوەندیی هەیە, ئاخیرەکەی ئەوەیە کە دەچیّ پەیمانی لەگەلّ دەبەستیّ! یان لە کۆتایی دا سیغە! ئەگەریش بتەویّ تەلّاق وەرگری, مارەییەکەت دەدەن و تەواو! مارەییەکەت چەندە؟!

ـ نییە!

- خانوو مانووێکت بە ناوەوە نییە!

ـ نا!

- کەواتا دۆڕاوی! تەلّاقیشت دەدا و منداڵەکەشت لیّ دەستێنیّ و ئیدی بە خەیاڵی ئاسوودەوە دەستی ژنەکەی دەگریّ و لە جێی تۆی دادەنیّ! سەیارەی مۆدیل بەرز لە جێی سەیارەی مۆدیل کۆن!

(بێدەنگی )

- بیّ نرخ مەبە تەرانە! زرینگ بە! تۆش کارێکی دەگەلّ بکە کە دلّی بسوتێنی! بەلّام ئاگادار بە!

ـ ناتوانم!

- کەواتا بیرت لێی کردۆتەوە!

ـ بەلّیّ, بەلّام ناتوانم!

- جاری یەکەم قورسە! دوای ڕادێی!

ـ تۆ پێت وایە ئاوا لەززەتی لیّ دەبینم؟!

- بەلّیّ, بەلّام نەك ئەو تام و خۆشییە! بەلّکو تام و چێژی تۆلّە! لانیکەم ئەوەیە کە هەر جارێك سەیری دەکەی, وا هەست دەکەی کە لە دلّی دا پێت پیّ دەکەنیّ, تۆش دەتوانی لە دلّتدا پێی پێبکەنی!

(بێدەنگی)

- ئەو شتۆکەڵەیە بکوژێنەوە ئیدی! فایلەکەمان زۆر کەمە, نۆرەی ئەوەیە بچێتە سەری!

( دەنگی دووگمەی تەسجیل)

(( لە یادمە ئەو ڕۆژە کاتێك تەسجیلەکەم کوژاندەوە, ئەفسانە زۆر شتی پێ گوتم! کە ئەگەر پێشتر هەتا وێناشم کردبان, حاڵم تێك دەچوو! کاتێك لە زیندان هاتمە دەرێ, ئیدی تاقەتی چوونە شەریکەم نەبوو. هەر بۆیە گەڕامەوە ماڵێ. لە ڕێگا تەنها بیرم لە قسەکانی ئەفسانە دەکردەوە! بە تۆڵە! بە قەرەبوو! بە شتێك کە دڵم ئاو بخواتەوە پێی! بە کارێك کە لانیکەم مرۆڤێك تێبگەیەنێ کە هیچ کەس بۆی نییە پەیمانێك بە تەنها تێك بدات و بەتاڵی بکاتەوە! بە تەمبێ کردنێك! بە سزادانێك, بەڵام کام سزادان؟! چ کەسێك پارێزگاریی لە من دەکرد؟! یاسا؟! لە کۆتایی دا یاسا چی بۆ دەکردم؟! ئەگەر بمتوانیبا ئیسپاتی بکەم, مارەییەکەیان پێ دەدام؟! یان کەمێك لەو پارەیەی کە بە دەستمهێنابوو و دەو ژیانەم هاویشتبوو! ئەی ئەوەی دیکە چی؟! چەند ساڵ ژیان! چەند ساڵ ئەشق! چەند ساڵ هیوا!

ڕاستی هیوا بە چی؟! ئەسڵەن بۆ هاوسەرگیریم کرد؟! من هەموو کات لەوە دڵنیا بووم کە لە ڕووی ماددییەوە هیچ کێشەم نابێ! دڵنیا بووم لەوەی کە ئەگەر خوێندن تەواو بکەم, دەتوانم بەرەی خۆم لە ئاوێ دەربێنم. وەزعی ماددیی بابیشم باش بوو. ئەوەندەی کە دەمزانی دوای مردنی بابم هەندێ میراتم پێ دەگا, کە پێشم گەیشت. هەر بەو پارەیە دەمتوانی باڵەخانەیەکی چکۆلە بکڕم و دوای چەند ساڵێك بیگۆڕم, بۆ ئەوەی کە دەمەوێ, پێی بگەم. کەواتا لەبەر خاتری پارە هاوسەرگیریم نەکردوە. کەواتا دەلیلی ئەو کارەم چ بوو؟! ئەشق؟! بەڵێ, هەر

ئەوە بوو! عاشق بووم. لێی گەڕام بە تەبیعەت ئەوەی کە هەیە ڕوو بدات. ژن، مێرد، هاسەرگیری، لەدایکبوون، تا کۆتایی!

بەڵام بۆچی؟! من دەمتوانی چەند دانە لەو عەشقانەم هەبێ! ئەی بۆ نەمکرد؟! دەمتوانی لە جێی لەدایکبوون و هەتاهەتایی، ژیان هەڵبژێرم! ئەو ژیانە دەیتوانی درێژەپێدەری ئەشق بێت بە بێ زیندانی! بە بێ پەیمان! بە بێ کەرێتی!

ئەی بۆچی هەڵبژاردنێکی دیکەم کرد؟!

لە بیرمە ڕۆژێك بابم بوکەڵەی بۆ کڕیم! عاشقی بووم! بۆچی؟! چونکە بەشێك بوو لە ویستی غەریزەم؟! لەدایکبوون؟! زاوزێ؟! یانی ئەو هەستە پێش کڕینی ئەو بوکەڵەیە لە مندا نەبوو؟! یانی حەزم دەکرد مریشکێك بام؟! مریشکبوون چ تامێکی هەیە؟! ئەوەیە کە دانەیەك یان چەند دانە مندالێ بێنیە سەر دونیا و من شاد بم؟! کە چی؟! کە بەدبەختیی بچێژم و گەورەیان بکەم کە دووبارەیەکی دیکە بێتەوە بوون؟! ئێستا هەر ئەو منداڵە نییە کە بۆتە هۆی لاوازیی من؟! ئەوە خۆ زۆر پێکەنیناوییە! ڕۆژێك پیاوێك لە دەرگای ماڵێ بدا و بەو نیەتە بێتە پێشێ کە من بە دەست بێنێ و لەگەڵ خۆی بمبا و منداڵێکی بۆ بێنمە دونیا و دواتر ئەوە ببێتە خاڵی لاوازی من و بەندم بکات، ئەوکاتیش بۆخۆی سادە و ساکار بچێت بە دوای خۆشگوزەرانی و بێ ئەخلاقی؟! ئێستا من بۆ کوێ دەڕۆم؟! ماڵێ؟! بۆچی؟! چونکە سوگێل دێتەوە ماڵێ و دەبێ ئاگاداری بم؟! دواتر چی؟! بۆ ئەوەی دووبارە ئەو چارەنووسە دووبارە بێتەوە؟! ڕۆژێك پیاوێك لە دەرگای ماڵێمان بدا و بەو نیەتە بێتە پێشێ کە دەستی سوگێل بگرێ و بیباتە ماڵێ، کە منداڵی بۆ بێنێتە سەر دونیا و دواتریش بەند بێت و بۆخۆشی ئازاد بێت و بچێت بە دوای خۆشگوزەرانی دا؟!

نا ! ئاوا نابێ! ئەوە دروست نییە ! لەوانەیە تا ئێستا وا بووبێ, بەڵام لە ئێستا بە دواوە نابێ وا بێ! من چاودێریی سوگێل دەکەم و پێی ڕادەگەم, بەڵام مافی ژیانیشم هەیە ! ڕاستی, مافی ژیان واتای چییە ؟ ! یانی هەر خواردن و نووستن و هەناسەدان و کارکردن؟ ! یانی بە زیندوویی مانەوە ؟ ! یانی بەڕێکردنی ڕۆژەکان بە بێ مانا ؟ !

نا ! ئەوە تەنها کلێشەیەکی وێنەییە ! دووبارە بوونەوە ! دووبارە بوونەوەی دایکم! دووبارە بوونەوەی نەنکم! کەواتا ئەوە ژیان نییە ! ئەوە تەنها بەیەک گەیاندنی ڕۆژمێرە ! شەممەی بگەیەنی بە یەکشەممە و یەکشەممە بگەیەنی بە دووشەممە ! ئەوە نەفیی ویستەکانە ! ئەوە تەنها دامرکاندنەوەی ئارەزووەکانە !

کەواتا ژیان چییە ؟ ! ئەوە چ جۆرە ژیانێکە کە چەند ساڵێك لێی تێپەڕی و گەنجیی بەڕێ کرد, لە جێگەی یادگاریی جوان, داخێکت بۆ نەمابێتەوە ! ؟

ئەوە ژیانە, کە وەك ئێستا دەتەوێ بگەڕێیەوە ماڵێ, ناچار نەبی هەندێ ڕێ بە پێ ببڕی, تا بگەی بە شەقامی ئەسڵی و ڕێ لە تاکسییەك بگری و بڵێی: ڕاستەڕێ و دوای دابەزی و دووبارە کەمێك بە پێ بڕۆی بۆ ئەوەی بە شوێنێکی دیکە بگەی و دیسان پێش بە تاکسییەکی دیکە بگری و بڵێی: ڕاستەوڕاست و دیسان دابەزی و بە پێ بڕۆی و دیسان پێش بە تاکسی... !

بۆچی؟ ! بۆ ئەوەی کەمتر پارە سەرف بکەی و زیاتر پاشەکەوت بکەی؟ ! بۆچی؟ ! کە ئەو پاشەکەوتەت مێردەکەت باشتر بتوانێ خەرجی کا؟ ! ڕێ کورتەکان, فەرعە چۆڵەکان ! بۆچی ؟ ! بەس بۆ ئەوەی کەمتر خەرج بکەی و زووتر بگەیەوە ماڵێ و ئاگات لە منداڵەکەت بێ؟ !

لەوانەیە تەنها لەسەر شەقام بوەستین و چاوەڕێ بکەین و بهێڵین تەکسییەك بێت و بڕوات، تا چارەنوسێکی دیکە لەبەردەمت قیت بێتەوە ؟ !

هەروەك ئێستا، كە سەيارەيەك كەمێك دوورتر وەستاوە و گەنجێكى نزيكەى سى، سى و دووساڵە تێيدا دانيشتووە و بە پێكەنينەوە سەيرم دەكات؟

يانى ئەوەش دەيەوێت ڕاستەوڕاست بڕوات؟!

نەء؟

سەيارەكەى چييە؟! بەتەواوى نازانم بەڵام زۆر جوان و قەشەنگە!

لەوانەيە ئەو جۆرە سەيارانە تەنها ڕاستەوڕاست نەڕۆن!

نەكا ئەوە هەمان چارەنوس بێت؟!

لەوانەشە ئەوە هەمان ويستى دڵ و ئارەزووى كوژاوە بێت ؟!

لەوانەشە خۆ هيلاك كردن! لەوانەشە تۆڵە!

ـ ببورە ! چاوەڕێى كەسێك دەكەى؟

- تكايە بێزارم مەكە!

ـ مەبەستم بێزار كردن نييە!

- كەواتە تكايە بڕۆ، چونكە چاوەڕێى تەكسيم!

ـ منيش خەريكم بەڕێدا دەڕۆم! ئەگەر بتانەوێت دەتانگەيەنم!

(( گەنجێكى باڵابەرز و جوان بە سەيارەيەكى جوانەوە! ئێستا دەبێ چى بكەم؟! ديسانيش چاوەڕێ و ماندوويى و ڕاستەوڕاست؟!))

ـ خەريكە بڕيار دەدەيت؟!

- لەوانەيە ڕێمان وەك يەك نەبێ؟!

ـ تەواوى ڕێگاكان بۆ يەك شوێن دەچنەوە!

(( عەجەبە چ وڵامێك! حەتمەن بێهەروزيش ڕۆژێك لە ڕۆژان تووشى ئەو وڵامە بووە و ئيدى نەيوستيووە ڕاستەوڕاست بڕوات! كەواتا بۆچى ئەو وڵامە نەتوانێ من ڕازيى بكات؟!

دەرگای سەیارەم لیٚ کردەوە و سوار بووم و دواتر وەڕێکەوتین! ئێستا یان ڕاستەوخۆ یان نا!))

ـ بۆ کویٚ دەچی؟!

– بۆ هەر شوێنێك کە ویستی ئێوە بێت.

ـ من لە خزمەتدام.

– شەقامی...

و ڕاستەوڕاستی شەقامی...؟

– ڕاستەوڕاستی شەقامی...

ـ هەر جۆرێك ئێوە بتانەویٚ.

– سوپاس.

ـ من فەرنووشم.

– منیش تەرانە.

ـ من شەریکەیەکم هەیە.

– باشە!

ـ هەروەها باڵەخانەیەکیش!

– گوتم ڕێمان یەك ناگرێتەوە! تکایە هەر لێرە ڕایگرن!

ـ من کە شتێکی خراپم نەگوتووە!

– منیش شتێکی خراپم نەگوتووە!

ـ کەواتا ڕێگە بدەن ئەو دوو شتانە لەبیر بکەین!

– باشە.

ـ باشە کەواتا من تەنها یەك شەریکەیەکم هەیە. شەریکەیەك کە تەنها کەلوپەلی کۆمپیوتەری تێدا دەنێم!

- ئەوەش باشە!
ـ ئەدی ئێوە؟!
- من شەریکەم نییە!
ـ لێتان ناوەشێتەوە ، کە بەڕێوەبەری شەریکە بن!
- بەس لەبەر ئەوەی چاوەڕێی تەکسیی بووم؟!
ـ نا نا!
- ئەی چی؟!
ـ وا پێدەچێت کارمەندی کۆمپانیایەك بن! وایە؟!
- نەخێر.
ـ مامۆستا یان قوتابی؟!
- نەخێر.
ـ ناتەوێت باسی کەی؟!
- بۆ نا! پارێزەرم!
ـ بەڕاستی !
- پێناچێت!؟
ـ چەند سەیرە؟!خاتونێکی پارێزەری جوان!
(( ئاوڕم دایەوە و سەیرم کرد زوو گووتی ))
ـ جوان، بەڵام بە نیگایەکی سارد و ڕقاویی!
ـ چاوەڕێی سەیرکردنێکی ئاگراویی بووی؟!

(( تەنیا سەیرم دەکرد! خەریك بوو چیم دەکرد؟! جێبەجێکردنی ئەو ئامۆژگارییانەی کە کچێکی گرتووخانە پێی گوتبووم؟! ئەو ئەگەر باش بیری کردبایەوە، خۆ ئێستا لە گرتووخانە نەدەبوو!))

– دەتوانم داوایەکتان لێ بکەم؟!

- بە دڵنیاییەوە!

– تکایە هەر لێرە ڕایگرن, دەمەوێ دابەزم!

- ئێ خۆ ئێستا بە شەقامی ... نەگەیشتووین؟

– ئیدی نامەوێ بۆ ئەوێ برۆم!

- ئێ بۆ هەر شوێنێکی دیکە دەڕۆن دەتانگەیەنم.

– ئێوە بە هەڵە گرتووتانە!

- بڵا! لەوانەشە نا!

– خەریکە ئیهانەم دەکەی؟!

- بە هیچ شێوەیەك! ئەگەر بڵێم چەند دەقیقە لەمەوبەر بۆ کوێ دەڕۆیشتم؟! نووسینگەی پارێزەر! ئەرێ! هەر بەڕاست ئێوە پارێزەرن؟!

– ئهم!

- ئێ کەواتا بە هەڵەدا نەچووم! ئەوە هەمان چارەنووسە! من زۆر باوەڕم بەو شتانە هەیە!

– بەلأم من نیمە!

- بە چارەنووس و قسمەت؟!

– ئێمەی مرۆڤەکان لەوانەیە لە سەدا نەوەدی چارەنووسی خۆمان، بۆخۆمان تۆکار بکەین! لە سەدا —دە—ش شانس و بەخت و ئەو شتانە!

- وەك ئەمڕۆ؟!

– وەك ئەمڕۆ.

ـ یانی ئەوە سەیر نییە کە من ئەمڕۆ لە ڕۆژنامەدا بە دوای پارێزەردا گەڕاوم و نەفەرێکم سواری سەیارە کرد، کە بچمە نووسینگەی پارێزەر و لەگەڵ تۆ ڕووبەروو بوومەوە؟

– سەیرە، بەڵام چارەنووس نییە! یانی ئەو چارەنووسەی کە لە بیری ئێوە دایە!

ـ کەواتا دەکرێ چی بێت؟

– ڕووداوێکە! ئەگەریش شانس لەبەرچاو بگرین! دەبێتە ڕووداوێکی شانسیی سەیر! نەك چارەنووسێکی بەهێز! چونکە لەوانەبوو هەر لەو کاتەی دا کە من چاوەڕێی تاکسیی بووم، هۆشتان لە شوێنێکی دیکە بێت، یان بۆ وێنە سواری سەیارەکەتان نەبووبام! بێجگە لەوانەش، ئەدی ئەگەر وەکالەتەکەت قبوڵ نەکەم! لێرەدا تەواوی ئەو چارەنووس و قسمەتەی کە ئێوە باوەڕتان پێیەتی، دەگۆڕێت!

ـ وایە! ئیستا ئیدی دڵنیا بووم کە پارێزەرن!

– کێشەتان چییە؟

ـ دوو بابەتە.

– ئێ!

ـ یانی وەکالەتەکەم قبوڵ دەکەن؟

– نا، وەلێ لە پای ئەوەی کە بەرانبەر منتان کرد، بەشکو بتوانم یارمەتییەکتان بدەم.

ـ باشە! بابەتی یەکەم ئەوەیە کە من کارمەندێکم هەبوو، چوار ساڵ بوو ئیشی بۆ دەکردم، ماوەیەك لەمەوبەر تێگەیشتم کە خیانەتی لە حیساباتەکەدا کردووە و کەمێکی دزیوە! منیش دەرم کرد. ئێستاش هەق و مافی ئەو چوار ساڵەی لە من دەوێ.

- وە تۆش ناتەوێ بیدەیەی؟!

- بەڵێ!

- هەڵە دەکەی!

- بۆچی!

- سەرەتا لە ڕێی مەنتیقەوە پێتان بڵێم! شکایەت کردن لەو بە قازانجی تۆ نییە! چونکە سەرەڕای ئەوەی پارەی وەکالەت کە هەمان شتە، لە ئیشیش دەبن. لە کۆتاییدا لەوانەیە پێویست بکات شکایەتی لە ئاسایشیش لێ بکەی کە دەکەوێتە سەر دزیی دزەکە و لەسەری ئیسپات دەبێ و کارمەندەکەت دەگرن! ئەوکات مەسەلەی ویژدانی دێتە گۆڕێ! ویژدان و سۆزی مرۆڤایەتی! هەرچەندە مرۆڤێکی دڵ لاوازیش بی، دوای ماوەیەك دەچی و پەشیمان دەبیەوە! ئەگەر باری دارایی کارمەندەکەتان باش نەبێ، یا بۆ وێنە کارمەندەکەت ژن و منداڵی هەبێ! چونکە حەتمەن ژن و مناڵەکەی دێن بۆ کۆمپانیایەکەت و دەست دەکەن بە گریان و هاتوهاوار تا پەشیمانت بکەنەوە!

ئێستا بە ڕاشکاوی! مافێکی مامناوەند بە کارمەندەکەتان دەدەن؟

- ئا، بەڵام بەو شێوەیەش نا!

- بە تەئکید دەبێ چاوەڕێی دۆخێکی ئاواش بکەی! مافی کەم، دەبێتە هۆی فریودانی کارمەند!

- یانی هەرچی چۆن بێ باشترە کە هەقی چوار مانگی پێ بدەم و بابەتەکە تەواو بکەم؟

- ئەوە باشترە! یانی بە قازانجی تۆیە!

- پێم وابێ ڕاست دەکەی! باشە! ڕاوێژەکانت پەسند دەکەم! هەر بەیانی هەقی چوار مانگی دەدەمێ!

- دەبێ ڕەزامەندیی نامەی لێ وەرگری!

ـ وەردەگرم. سوپاس . باشە! بۆ ئەو ڕاوێژە دەبێ چەندە خزمەتتان بکەم؟

- هیچ! ئەوە لەبەرامبەر لوتفی ئەمڕۆی ئێوە بوو! یان هەمان چارەنووسی بەهێز کە ئێوە باوەڕتان پێ هەیە و ئەو کە من پێم وایە!

ـ دووبارە سوپاس! دەزانی چی؟! کاتێك پارێزەرێکی ئافرەتی جوان ڕاوێژ و ئامۆژگاریی مرۆڤ دەکات، زۆر بە ئاسانتر قسەکانی پەسند دەکرێن و وەڕاست دەگەڕێن!

- سوپاس بۆ وەسفەکەتان .

ـ نا، بەڕاستی وا دەڵێم.

- ئێ باشە منیش بەڕاستی سوپاس.

ـ ئەی بابەتی دووەم چی لێدێت؟ کەی کاتت دەبێت؟

- پێموابێ گەیشتین! کات بۆ بابەتی دووەم نییە!

ـ دەتوانم داوایەکتان لێبکەم لە بارەی بابەتی دووەم ، کە وەکالەتەکەم قەبوڵ بکەن؟

(( سەیرم کرد! ئایا بەڕاستی ئەوە ڕووداو بوو یان هەمان چارەنووس؟! خەریك بوو ئەو شتانەم جێبەجێ دەکرد کە ئەفسانە پێی گووتبووم! لە وەسفی ئەو کچەیدا ، کە لەوانەیە تەواوی تەمەنە کورتەکەی بە هەڵە بەسەر بردبێت ؟! بەڵام ئەگەر وەکالەتی فەرنووشم قەبوڵ کردبا خۆ کارێکی خراپ نەدەبوو؟ من پارێزەرێك بووم و فەرنووشیش بریگرتەیەك! ))

ـ خەریکن بیر دەکەنەوە !

- دڵنیا نیم دۆسییەکەت قەبوڵ دەکەم! لەبەر ئەوەی کەمێك سەرقاڵم، لەوانەیە کاتم نەبێت!

(( لە گیرفانەکەی کارتێکی دەرهێنا و بۆی ڕاگرتم و گوتی ))

ـ ئەگەر کاتتان هەبوو پەیوەندیم پێوە بکەن؟

(( کارتەکەم لێ وەرگرت و گوتم ))

– تکایە هەر لێرە ڕای گرن!

(( لە تەنیشت شەقامێك ڕایگرت و گوتی ))

ـ دڵنیابە دوای ئەوەی وەکالەتەکەت قەبوڵ کردم، هاوڕێیەکی باشیش پەیدا دەکەی!

– تەنها یەك هاوڕێ؟

ـ ئەگەر ئاوا بتەوێت!

(( دووبارە سەیرم کرد و دواتر لە سەیارە دابەزیم. ئەویش سەرێکی بۆ لەقاندم و ڕۆیشت. چاوەڕێم کرد تا دوور کەوتەوە و دواتر کارتەکەم خستە ناو جانتاکەمەوە و وەڕێ کەوتم. نزیك ماڵێ ببووم. حەزم دەکرد بیر بکەمەوە. هەرچەندە چەند ساڵ بوو بیرم کردبۆوە و حاڵم بە ئێستا گەیشتبوو! لەوانەیە بەبێ بیرکردنەوە ئەو چەند ساڵەم بەڕێ کردبێ؟! لا ئیرادی بیرم هەر لەکن فەرنووش بوو! فەڕنووش! چ ناوێکی سەیر! دەکرا ناوی کوڕانیش بێ! هەروەها کچانیش! چەند ساڵێك لە خۆم بچووکتر بوو! ئەوە یانی چی؟! هەوایەکی تازە؟!

سوڕامەوە بۆ شەقامێکی دی! شەقامێکی تازە! ژیانێکی تازە! یانی تازە کە نا! چەند ساڵێك لەمەوبەر پێیدا هاتووم, وەلێ ئەمڕۆ بۆم تازە بوو! ژیانیشم چەند ساڵێك تێپەڕاندبوو, بەڵام بۆ ئێستا پێم وا بوو تازەیە؟! هەر لەبەر ناسینی فەڕنووش؟! نەفرەتت لێ بێ بێهروز! بۆچی ئەو کارەت کرد؟! بۆچی کارێکت کرد, کە پێچەوانەی میل ئەو کارە بکەم؟! بریا ئێستا هەواڵیان بۆ هێنابام و گوتبایان تووشی ڕووداوی هاتوچۆ بووە و مردووە! ئەوکات ئیدی خەیاڵم

ئاسوودە دەبوو و من و سوگێل دەماینەوە! دادەنیشم و سەیری گەورە بوونی سوگێل دەكەم. دواتریش ئیدی دەزانم لە ژێر گڵ نووستووی و سات بە سات گومانم بۆ ئەوە ناچێ كە لە كوێی و دەگەڵ كێی!

هەموو شتێكت تێكدا, بەڵام ئەمیش دەزانم چت لەگەڵ بكەم! وا دڵت داغ بكەم قەت لە بیرت نەچێتەوە! پیسی پۆخڵ! پێت وایە هەر خۆت زیرەكی؟! پێت وایە هەر لەبەر ئەوەی ژنم هیچم لە دەست نایە؟! پێت دەڵێم پووت چەند كیلۆیە! هەتا ئەگەر بە سووكبوونی كەسایەتیشم تەواو ببێت!

گەیشتمەوە ماڵێ, وەختایەك, زۆر دووریش نا, لە هەر كوێ بووم, لە ماڵ یان لە دەرەوە, بە ئەشقەوە كاتەكانم بەسەر دەبرد, ئەدی ئێستا؟!

دەرگام كردەوە و چوومە ژوورێ. ماڵ ئیدی ئەو ماڵە نەبوو! ئیدی ئەشق لە ناویدا نەبوو! لە هەموو شوێنێكی تۆز و خۆڵ و بەدبینی و نەفرەت نیشتبوو!

جلەكانم گۆڕین و چوومە چێشتخانە. تاقەتی هیچ كارێكم نەبوو! سوگێلی فەقیر! كچەكەم! كچە جوانەكەم! ئەو چ گوناهێكی هەبوو؟! بێهروزی هیچ و پوچ, ئەو چ گوناهێكی هەبوو؟! شەرمت لە كچەكەت نەكرد؟! شەرمت لەو منداڵە بێ تاوانە نەكرد؟!

قابلەمەم دەرێنا و دوو مستم برنج تێ كردن.

ئەی بۆخۆم چی؟! شەرم لە سوگێل ناكەم؟! بەلام خۆ سەرەتا من دەستم پێ نەكرد! خۆ هیچیشم نەكردووە هێشتا! بەڵام شەرم دەكەم! لە خۆم! لە سوگێل! لە دار و دیوار! ئەی مادام هێشتا هیچ نەبووە ئەو هەستەم بەرانبەر بە خۆم هەیە, ئەی دواتر چی؟! من لەسەر سفرەی باب و داكم دانیشتووم و نانم خواردووە! ناتوانم ئەو كارەی بكەم! لە من ناوەشێتەوە! ئەدی كە وایە چ بكەم؟! مەیدانی بۆ چۆڵ بكەم بۆ ئەو بێقیمەتە؟! ڕێی پێ بدەم هەر غەڵەتێك

حەزی لێ بوو بیکات؟! ئەگەر زیاتر چۆ پێشێ چی؟! ئەگەر کار گەیشتە جیابوونەوە و سوگێلی لێ ستاندنم ئەوکات چی؟! ئەوکات پەشیمان نابمەوە تۆڵەی لێ کەمەوە؟! بەڵام چۆن دەتوانم ئەو کارە بکەم؟! وەك مردن وایە بۆم! شەرم, خەجاڵەتی, عەزابی ویژدان! لەوانەیە تەحەمولکردن لەسەر ئەوەی بێهروز خیانەتم لێ بکا, ئاسانتر بێ لەو کارە! ئەسڵەن ناتوانم لە مێشکمدا وێنای بکەم کە بۆ نموونە...! ئۆف خوایە گیان! ئاخر چۆن دەبێ؟! دواتر هەر تووشی خۆکوژی نابم؟! ئەسڵەن دوای ئەوکات دەتوانم بژیم؟! دەتوانم سەیری چاوەکانی خۆم بکەم لە ئاوێنەدا؟! چوومە لای جانتاکەم و کارتەکەی فەرنووشم دەرهێنا و لە تەنەکەی خۆڵێم هاویشت و زبڵەکەشم بەسەردا کرد. لەناکاو هەستم بە ئارامییەك کرد و هەر لەوێ لەسەر عەردەکە دانیشتم و داوای لێخۆشبوونم لە خودا کرد و دواتر هەستام و دەستم کرد بە شێو دروستکردن.

ئیدی وردەوردە وەختی هاتنەوەی کچەکەم نزیك دەبۆوە. دەبوو شێوم بۆ ئامادە کردبا. حەتمەن ڕێیەکی دیش بۆ چارەسەر هەر هەیە! بە شێوەیەك کە کەس نەزانێ! بەڵام چۆن چۆنی؟! پارە بە یەکێك بدەم کە بە سەیارە بیخاتە ژێر خۆیەوە! نا! نا! ئەوکات زۆر بە جوانی دەبێ بەرتیل بدەم و هەزار شتی دیکەش! ئەسڵەن مەگەر من پیاوکوژ و قاتیلم؟!

دەبوو ڕێیەکی دی هەر هەبێ! ئەگەر دەمزانی ئەو ژنە کێیە زۆر باش دەبوو! هەر چۆنێك با دەچوومە کنی و بە هەر شێوەیەك با لە سەر ڕێی شووەکەمم دوور دەخستەوە! ئەدی دواتر چی؟! دانەیەکی دی! چما دەکرێ هەر خەریکی ئەم و ئەو بم تا مێردەکەم بە پاکی بمێنێتەوە؟! کێشە لە خوودی مێردەکەی منە! ئەو نمەك بە حەرامە خەتابارە! ئەی کە وایە چ بکەم؟! خۆ بدەمە دەستەوە و حەواڵەی خوای بکەم؟!

نامەوێ ئیدی بیر بکەمەوە! نامەوێ! ئێستا کچەکەم دێتەوە! کچە نازدارەکەم! دواتر دەست بە قسەکردن دەکا بۆم! دەتوانم ژیان لە چاوەکانیدا ببینم! داهاتوو! ڕابردوو! وردەوردە گەورە دەبێ! دەبێتە خاتوون! جوان دەبێ! منیش ئاگام لێی دەبێ! هەموو ئیشێکی بۆ دەکەم! بەلاّم نا! ئەی دواتر چی؟! ئەگەر تووشی خوێڕییەکی وەك بابی بێ؟! نا! نایەڵم! بەخوای ئەوە ویژان نییە! نابێ بەو شێوەیە بێ! ئەسڵەن ناهێڵم مێرد بکات! پێی دەڵێم کە پیاوان چەندە بێ نرخن! دەبێ باش پەروەردەی بکەم! دەبێ زیرەك بێ! نابێ فریو بخوات! ئیدی ناشمهەوێ بیر بکەمەوە! هەرچی چۆن بێ شتێك هەر دەبێ ئیدی! جا هەرچییەك بێ!

خێرا چووم تەلەفزیۆنم پێ کرد و دەنگیم زیاد کرد. دەمویست ئاوا پێش بە بیرکردنەوەم بگرم. بە تایبەت خەریك بووم گوێم لە دەنگی تەلەفزیۆن دەگرت و هەوڵم دەدا کە هۆشم هەر لەو بێ.

کەمێك دواتر سوگێلیش لە قوتابخانە گەڕایەوە و نانی نیوەڕۆیەم دایە و وەك جاران دەستی کرد بە قسەکردن. ئیدی سەرقاڵ بووم. دانیشتم و گوێم بۆ قسەکانی گرت و سەد جار لە دڵمدا خۆم بە قوربان دەکرد. ئیدی هەموو هیوایەکی من لە ژیاندا, ئەو منداڵە بوو!

شەوێ نزیکەی سەعات نۆ بوو کە ئەویش هاتەوە ماڵێ. هەوڵم دا کە ئاسایی هەڵسوکەوت بکەم. ئەویش هەر وەك هەموو جارێك جلەکانی داکەند و لە پێش حەمام فڕێی دان و بۆخۆشی چوو خۆی بشوا کە لە ناکاو تەلەفونی بۆ هات! بە خێرایی و بە حاڵەتێکی نامۆ لە حەمام هاتە دەرێ! بە تایبەت من وەڕێ کەوتم بۆ چێشتخانە و ئەویش خێرا خاولیەکەی لە خۆی وەرپێچا و هاتە دەرێ و موبایلەکەی هەڵگرت و چۆوە حەمام! منیش خێرا ڕام کرد و لە پشت دەرگای

حەمام خۆم گرت! ئەو نمەك بە حەرامە بوو! زۆر بە ڕوونی تێنەدەگەیشتم, بەڵام دەتگوت باسی سەیارە دەکەن! خەریك بوو دەگەڕامەوە چێشتخانە کە لەناکاو بێهروز گوتی:" هۆشت لە کوێیە؟!" دواتر یەك دوو ڕستەی دیکەی گوتن کە تێنەگەیشتم, بەڵام ئاخیرەکەی با! گوتی: ئاوێك بە خۆمدا دەکەم و دەچمە خواریّ! ئیدی تێگەیشتم هەرچی هەیە پەیوەندیی بە سەیارەکەوە هەیە! گەڕامەوە چێشتخانە و لەوێڕا هاوارم کرد و گوتم))

- مەگەر چەندەت پارە دەدەنیّ کە دەبیّ بیست و چوار سەعات لە خزمەتیاندا بی؟!

(( لەو کاتەدا لە حەمام هاتە دەر و موبایلەکەی کوژاندەوە و لەسەر مێزی دانا و گوتی))

ـ وەڵڵا بڵێم چی؟! دەڵێی خەڵکیان کڕیوە! بۆ ئێواریّ چمان هەیە؟

- مریشك.

ـ بەتەنیّ؟!

- نا. بە برنجەوە.

ـ کەواتا هاتم!

(( هەر کە گوێم لە کردنەوەی ئاوی حەمام بوو, خێرا سویچی سەیارەکەم هەڵگرت و بە هێواشی بە سوگێلم گوت کە دەچمە عەمبار برنج دێنم. خێرا چوومە خواریّ و چووم بۆ لای سەیارەکە و دەرگاکەم کردەوە. پێویست بە گەڕان نەبوو! کیسە زەرفێك کەوتبۆ پشت کورسییەکەوە, هەر لەسەر ویّ کەوتبوو! خێرا هەڵمگرت! بلوزێکی ژنانەی تێدا بوو! ژنانەی چی؟! چ باس بکەم؟! کچانە بوو! لەو بلوزە تازانە بوو کە تازە مۆدێرن بوو و کچ لەسەر سەحن دەبەریان دەکردن. زۆر بچووك بوو! دیار بوو کە بۆ کچێکی کز کڕدراوە! لەو بلوزانەی کە تەواوی لاشەی

سەرەوەی دیارە! بلوزێکی گونجاو بۆ کچێکی بیست و چوار ساڵە! ئەو شتەی کە دەمێك بوو لەو پێشاناگایانە هەڵدەواسرا و دەمیت, وەلیٚ شەرمم دەکرد بیکڕم. لەوانەیە لەبەر تەمەنەکەم! لەوانەشە لەبەر ئەوە بووبیٚ کە دەمزانی تەسك و تەنکە بۆم! بەڵام هەرچی چۆن بیٚ زۆرم حەز لێیان بوو بەڵام قیاسی خۆم نەبوو! قەڵەو ببووم! لە تەواوی ژیان خۆم وێل کردبوو! ماوەیەك بوو کە بیرم لەو شتانە نەکردبۆوە! تەنها ئیش! ئیش و پارە پەیداکردن! بیٚ ئاگا لەوەی کە هەموو کات یەکێك لە پشتی مرۆڤەوە هەیە و ئەو پارانە خەرج دەکات!

لە کیسەکەم هاویشتەوە! چی دیکەم لە دەست دەهات؟! ئەگەر قسەیەکی دیکەم کردبا لەگەڵ ئەو نمەك بە حەرامە, ڕێك دەیگوت: ئەوە بۆ تۆم کڕیوە گیانەکەم! ئەی دواتر دەمتوانی بڵێم چی؟! هەر بۆیە لە جێی خۆیم دانایەوە و دەرگای سەیارەکەم داخستەوە و لە عەمبار کیسەیەك برنجم دەرهێنا و چوومەوە سەریٚ. بێقیمەتە هێشتا لە حەمام بوو!

بە هێواشی چوومە چێشتخانە و برنجەکەم لە کەوەنتەر هاویشت و چووم زبڵ و خاشاکەکە لە تەنەکەی خۆڵ بکەم! کارتی فەرنووش هێشتا لەوێدا بوو. خوایە گیان! لێم ببوورە! بمبوورە کچەکەم! کاتێك مرۆڤ پشتگویٚ دەخریٚ, کاتێك لەناکاو دوای چەند ساڵێك چاو دەکاتەوە و دەبینیٚ هەر گوێی لە درۆ بووە, کاتێك وڵامی ڕاست و ڕەوانی و گەرم و گوڕیی بە ناپاکیی دەدەنەوە, ئیدی چی لە ژیاندا بۆ دەمێنێتەوە؟!

مێزەکەم ئامادەکرد و چاوەڕیٚ بووم تا لە حەمام بێتە دەریٚ! لەناکاو بە مێشکمدا هات کە نەکا ئەو بلوزەی بۆ من کڕیبیٚ و لە بیری چووبیٚ بیهێنێتە سەریٚ؟! هەرچەندە بە دوور دەیبینم, بەڵام لەوانەیە وا بیٚ! کەواتا هێشتا فرسەتێکی دی

ماوە! پاش دوو سێ دەقیقەی دیکە لە حەمام هاتە دەرێ و جلەکانی دەبەر کردنەوە و هاتە چێشتخانە و گوتی))

- ئێ ! بەندە لە خزمەتی خانەوادەی ئازیزم دام! ئەگەر نانێکی باشم بدەنێ, منیش سوپرایزێکی باشتان پێشکەش دەکەم!

 (( لە سەر مێزەکە دانیشت! دەتگوت لەگەڵ بلوزەکەیەتی! یانی کە بۆ منی کڕیوە؟! خێرا نانم بۆ تێکرد و بانگی سوگێلم کرد و بۆخۆشم دانیشتم و دەستم کرد بە خواردن کە گوتی))

- هاوسەرە ئازیزەکەم, کچە جوانەکەم ئەمڕۆ چی بووە؟! بزانم دەزانن؟

(( من و سوگێل تەنها سەیرمان دەکرد! ئای کە لە دڵمدا چەندە داوام لە خودا دەکرد بڵێت بە شەقامێکدا تێدەپەڕیم و لەناکاو چاوم بە پێشانگای دووکانێك کەوت و ئەو بلوزەم دیت و منیش چووم کڕیم! بەڕاستی لەو کاتەدا ئەوە بۆ من لە هەر شتێك کە لە دونیادا هەبوو بەنرختر بوو! ئەگەر چی نە بۆم دەبوو و نە گونجاویش بوو بۆم. وەلێ دەیتوانی زۆر شت لە ناخمدا بگۆڕێ!

هەر چاوم لە زاری بوو و خودا خودام بوو, کە کەچکێکی دیکەی خوارد و گوتی))

- ئەمڕۆ بوومە بەڕێوەبەری بەشەکەمان!

(( لەناکاو هاتمەوە سەر سفر! کەچکەکەم لە قاپ هاویشتەوە و پاڵمدایەوە و سەیرم کرد کە پێکەنی و گوتی))

- سەرت سوڕ ما؟! دەمزانی! لەمڕۆ بە دواوە بە تەواوی حاڵمان باش دەبێ! هەقەکەشم زۆر بەرز دەبێتەوە ! زۆر چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بووم! زۆر!

(( سوگێل هاواری کرد و دەستی کرد بە چەپڵەلێدان! هەردووکیان خۆشحاڵ بوون, بەڵام زۆر شت لە مندا شکان! هەر وا کە سەیرم دەکرد ڕووی لە من کرد و گوتی))

- خۆشحاڵ نەبووی؟!
ـ با! با! بەڵام بۆ وا بێخەبەر؟!
- کوا بێخەبەر! خەبەر هەبوو! یانی دەمزانی! ماوەیەك بوو حوکمی خانەنشینیی مەحەمەدیان ڕاگەیاندبوو, هەواڵێکیش بە من گەیشتبوو! تەنها مابۆوە کە سەدا سەد دڵنیا بم و ئەوجار پێت بڵێم. دەزانی چەند ساڵە کە چاوەڕێی ئەو پۆستەم وەریگرم؟!
ـ بۆ پارەکەی؟!
- هەم پارە و هەم پلەکەش!
ـ مەگەر لە ڕووی ماددییەوە کێشەمان هەبووە لە ماڵدا؟
- نا! بۆ مەگەر خراپە مرۆڤ زیاتر پارە پەیدا بکات؟! کوا ڕاوەستێ, دەڵێی نەك هەر خۆشحاڵ نی, پێشت ناخۆشە؟!
ـ نا!
- ڕاستییەکەی بڵێ! چۆنە لەناکاو واقت وڕ ما؟!
ـ هەر وا!
- نەکا وا بیر بکەیەوە کە ئێستا بوومەتە بەڕێوەبەر, خۆم لێ دەگۆڕێ و ئەو شتانە؟!
ـ نازانم!
- ئەی شەیتان! هەر بۆیە زۆر خۆشحاڵ نەبووی! ئۆف لە دەستی ئێوە ژنینە!
(( کەچکێکی دیکەی خوارد و گوتی))
- نا گیانەکەم! سوپاس بۆ خودا بەو پارەیەی کە تۆ وەرتگرتووە و وەریدەگری, ئێمە کێشەی ماددیمان نەبووە! ئەوجا هەر ئێستاش کە بەرز بوومەتەوە و بە دوو شوێن ئیشێ دەکەم, هەقەکەم نیوەی هی تۆش ناکا! بەڵان کاتێك پارەشت بۆ

زۆر دەبێ, ئێ مرۆڤ خۆشحالّ دەبێ ئیدی! ئێستاش کە هەم هەقەکەم چۆتە سەرێ و هەم پلەکەشم!

ـ سوپاس بۆ خوا! خوا بکا ڕووحیشت پاك بێ!

– پاك بێ یان پاك بمێنێتەوە!

(( خەریك بوو تێکی بدەم! هەر بۆیە زوو گوتم))

ـ پاك بمێنێتەوە و ئەو پلە و پارەیە هەڵت نەخەڵەتێنێ!

– تۆ کە دەزانی من هیچ کات هەڵسوکەوتی ناخۆشم لەگەڵ کارمەند و ژێر دەستەکانم نەکردووە! ئیشەڵڵا هەر واش دەمێنمەوە! دەبێ کاتم هەبێ بچم یەك دوو دەست چاکەت و پانتۆڵ بکڕم! جوان نییە لە پێش کارمەندەکان! هەرچی چۆن بێ بوومەتە بەڕێوەبەر ئیدی! وا نییە؟!

(( سەرم بۆ لەقاند و گوتم))

ـ حەتمەن! حەتمەن!

– ئەرێ بابە کەوگیرێکی دی برنج بۆ ئەو بەڕێوەبەرە فەقیرە تێکە!

(( بۆم تێکرد و دەستی بە قسان کرد! بەڵام نەك ئەو قسانەی کە لەو کاتەدا حەزم لە بیستنیان بێ! خۆزگە ئەو بلوزەی لە سەیارە دایە بۆ من دەبوو! خوایە گیان! هەر ئێستا لە زاری بێتە دەرێ و بڵێ:" ڕاستی تەرانە دیارییەکم بۆ کڕیوی!" ئەوکات ئەو کارتەم لەت لەت دەکرد و دەمخستە ناو تەنەکەی خۆڵێ!

دووبارە دڵم شکا! لەوانە بوون بە بەڕێوەبەریەتیی یەکەم دیاریی بێ بۆ ئەوەی بە دوای خوێڕیاتی و گەنجایەتیی بکەوێ! خۆزگە هەر ئەو کارمەندە سادە و پاکە دەمایەوە! خۆزگە هەقەکەت هەر پارە کەمەکە دەبوو, بەڵام ڕێزی ماڵ و منداڵەکەت ڕاگرتبا! ئەوە ڕیاییە, بێجگە لە نەگبەتیی هیچی دیکە نییە هەی هەرزەی بێ بەخت!

***

سبەی بەیانییەکە چەند جارێك تەلەفونم بۆ فەرمانگەکەی کرد, تا سەعات نۆ و نیو هێشتا نەگەیشتبۆ ویّ! دەمزانی چۆتە کویّ! ڕۆیشتبوو ئەو بلوزە بە یەکێکی لە خۆی بێقیمەتر بدات! بەڵام کێشە نییە! یانی ئیدی زۆر فەرقی نییە بۆم! قبولّم کردبوو! نا! ڕازیی نەببووم! ئەوە ڕاستییەك بوو و من بە ناچاری دەبوو قبولّی بکەم!

ئەو ڕۆژە دەبوو سەرم لە دوو کۆمپانیا دابا. دوا تەلەفونیش هەر ئەو سەعات نۆ و نیوە بوو کە لەسەر جادە بۆم کرد! منیش ژمارەیەکی دیکەم لیّ دا! ژمارەی فەڕنووش! هەر دوو جار لێی دا و گوێم لە دەنگی بوو!))

– فەرموون!

(( بۆ ساتێك زمانم گیرا و نەمتوانی قسە بکەم!))

– فەرموون!

(( زۆر سست و بیّ واز گوتم))

ـ ئەلو!

– بەڵیّ؟ فەرموون!

ـ سلاّو.

– سلاّو.

ـ من تەرانەم!

– بەه بەه! حالّتان چۆنە؟! گەورەییتان نواند تەلەفونتان کرد!

ـ سوپاس!

– لە کوێن؟!

ـ یەك دوو سەعاتێك کاتم هەیە دەتوانین لە بارەی دۆسیەکەتەوە قسە بکەین!

- لەسەر تەلەفون؟!
- بەڵێ ئەگەر بکرێ...
- ئەسڵەن نابێ! ئێستا دەقیق ئێوە لە کوێن؟
(( پێم گوت کە هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی))
- دەتوانن بێن بۆ ئەو ناونیشانە؟! کافتریایەکەی پاك و خاوێنە! هەم قاوەیەك پێکەوە دەخۆینەوە و هەم باسی دۆسیەکەشت بۆ دەکەم!

(( ناونیشانەکەی دا و خواحافیزی کرد. بڕیار بوو تا نیو سەعاتی دیکە لەوێ بم. تاکسییەکم گرت و وەڕێ کەوتم و نزیکەی بیست دەقەیەکم پێ چوو و گەیشتمە بەردەم کافتریاکە.

کاتێك لە تاکسیی دابەزیم، هەستێکی پەشیمانی ڕووی تێکردم! حەزم دەکرد بگەڕێمەوە بەڵام شتێك ڕێی لێ گرتم! درۆ! درۆ و دووڕوویی! کاتێك پیاوێك دەست بۆ کارێکی لەو شێوەیە دەبا، مانای وایە ژنەکەی وێڵ کردووە!

دەرگای کافتریاکەم کردەوە و چوومە ژوورێ. ڕێك بەرانبەر دەرگا، لەسەر مێزێك دانیشتبوو. هەر کە منی دیت، لە جێی خۆی هەستا. منیش بۆلای چووم و دوای سڵاوێکی سارد، دانیشتم. شاگرت هات و داواکەی وەرگت و ڕۆیشت. ئەویش پاکەتە جگەرەکەی دەرهێنا و فەرمووی کردم، منیش پێم گوت کە جگەرە ناکێشم. دانەیەکی بۆخۆی پێ کرد و گوتی))

- زۆر جوان بوویی!
- بابەتی دۆسییەکەتان چییە؟!
(( هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی))
- دژیەك! جیاوازیی لەگەڵ شەریکەکەم.
- ئێ!

– هەر ئەوە ئیدی!

ـ لەسەر چی ناکۆکن؟!

– سەرمایەداری.

ـ دەبێ پەیڕەوی شەریکەکە ببینم.

(( لە جانتاکەی پەیڕەوەکەی دەرهێنا و منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی. دەسەڵاتەکە هی فەرنوش بوو. کاتێك تەواو بوو گوتم))

ـ دەتەوێ لێك جیا ببنەوە و شەریکەکە هەڵگرنەوە؟

– نا! دەمەوێ بەشەکەی خۆمی لێ بکڕمەوە.

ـ دەتوانی.

– ئاخر ڕازیی نابێ.

ـ مەجبوورە دەبێ ڕازیی بێ.

– بۆخۆم بۆم ناکرێ بەدوای کەوم بۆ دادگا و ئەو شتانە.

ـ دەبێ پارێزەر بگری!

– کێ لە تۆ باشتر؟

ـ لەوانەیە من نەتوانم دۆسییەکەت قبوڵ بکەم.

– چاوەڕێ دەکەم تا کاتت دەبێ.

(( کەمێك لە نیسکافەکەم خواردەوە و گوتم))

ـ دەبێ بیری لێ بکەمەوە.

– باشە, کێشە نییە.

ـ دەتوانم بەڵگەی داکۆکیی شەریکەکە ببەم لەگەڵ خۆم؟

– بەڵێ, ((کۆپیی))ە.

(( بەڵگەکەم لە جانتاکەم هاویشت و گوتی))

- بۆچی ئەوەندە دڵتەنگی؟

ـ من تەنها بۆ ئیش هاتوومە ئێرە!

- ئێ باشە! بەڵام ئەمن ناڕەحەت دەبم ئەگەر ببینم پارێزەرەکەم غەمگینە!

ـ من هێشتا وەکیلی ئێوە نیم.

- ئێ هاوڕێکەم! ئێستا هەرچی چۆن بێ دەتوانم بە ناونیشانی هاوڕێ بانگتان بکەم یان نا؟

(( کەمێکی دیکەم لە فنجانەکەم خواردەوە و هیچم نەگوت کە جگەرەیەکی دیکەی پێ کرد و گوتی))

- ئەگەر بۆ ئێوارە بانگهێشتتان بکەم ڕازیی دەبن؟

ـ نا!

- بۆ؟

ـ هەر بەو دانیشتنە بابەتی دۆسیەکەتم بۆ ڕوون بۆوە! پێویست بە دانیشتنی دیکە نییە!

- زۆر ڕەقی!

ـ هەر وایە!

- وەلێ من زۆر ئارامگرم! بۆ ئەو شتەی کە دەمەوێ بە دەستی بێنم!

(( سەیرێکم کرد و گوتم))

ـ من دەبێ بڕۆم!

(( لە جێگەی خۆم هەستام, ئەویش هەستا و گوتی))

- ئەی دۆسییەکە چی؟

ـ دەیخوێنمەوە. ئەگەر ڕازیی بووم پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە.

- کەواتا چاوەڕێم.

((خێرا لەسەر مێزەکە واوە هاتم و لە کافتریا هاتمە دەرێ و چوومە سەر جادە و تاکسییەکم ڕاگرت و سوار بووم. دڵم زۆر بە خێرایی لێی دەدا! کەمێك دواتر ئاوڕم دایەوە و سەیری دواوەم کرد. دەترسام چاودێریم بکات, بەڵام نا! لە دوامەوە نەبوو.

کەمێك هاتمەوە سەر خۆم. دەبوو بیر بکەمەوە. دۆسییەکەی تەواو بوو. دەمتوانی فایلەکەی قبوڵ بکەم, بەڵام لەوانەیە لە خۆیەوە ئەو دۆسیەیەی کردبێتە بەهانە!

(( شریتی حەوتەمم خستە ناوێ.))

**شریتی حەوتەم**

**دووشەممە سەعات 10ی بەیانی, ڕێکەوتی ... گرتووخانەی ژنان..., دۆسییەی ژمارە... ناو ئەفسانە...**

- سیلسیلەکە تەواو بوو؟

- بەڵێ.

- ئێستا قسە بکەم؟

- بڵێ!

- سەرەتا سوپاس بۆ ئەو شتانەی کە بۆت هێناوم!

- تکا دەکەم.

- ئێ, بڵێم؟

ـ بڵێ, چاوەڕێم! بەڵام بزانە کە کاتێکی زۆرت نەماوە بۆ دادگا!

– گوێی مەدەیە! جا گوێبگرە. ئەو پێنجشەممەیە بۆ من زۆر شت بوو! ئەسڵەن لەوانەیە ژیانی گۆڕیبم!

دەعوەتەکە لەماڵێکی سەرووی شارەوە بوو. ماڵی یەکێك لە هاوڕێیانی سوهەیل بوو. تا ئەوکاتە بۆ شوێنی ئاوا نەڕۆیشتبووم. یانی یەك دوو جار چووبووم بۆ ماڵی برادەرەکانم, بەڵام لەوێ تەنها جەژن بوو. بۆ وێنە جەژنی لەدایکبوون! ئەوجار لەوێ دایك و بابی برادەرەکانیشم بەشدار بوون, بەڵام لێرە جیاواز بوو!

من و سوهەیل تەنها ئەو کەسەمان دیت کە دەعوەتی کردبووین و دواتر ئەویش ڕۆیشت کە بە ئیشەکانی ڕابگات! دووقۆڵیی ماینەوە کە چوینە شوێنێك دانیشتین و سوهەیل چوو دوو خواردنەوەی هێنان و یەکی بە من دا. پەرداخێك شەربەت بوو, بەڵام کە خواردمەوە دیتم زۆر خەستە!))

ـ ئەوە چییە سوهەیل؟!

– شتێکی خراپ نییە!

ـ زۆر خەستە!

– بیخۆوە! دواتر باش دەبێ!

ـ لەناکاو حاڵم خراپ نەبێ! هەتا ئێستا لەو شتانەم نەخواردۆتەوە هاا!

– یەکەم کە حاڵت خراپ نابێ! ئەوجار خۆ من لێرەم! متمانەت بە من نییە؟!

(( سەیرێکم کرد و کەمێکم لە پەرداخەکە خواردەوە کە ئەویش لێی خواردەوە!))

ـ تۆ کە دەتگوت ئیدی لێو لەو شتانە نادەمەوە؟

– شتێکی وا نییە! ساردییە!

(( دواتر دوو جگەرەی دەرهێنان و پێی کردن. دانەیەکیانی بۆ لای من ڕاگرت!))

ـ ناکێشم!

- بێ تامی مەکە !
ـ ئاخر تا ئێستا نەمکێشاوە ! تێکدەچم هاا !
- ئەگەر منداڵی ئەدی چ دەکەی لێرە ؟ ! ئەگەریش گەورە بوویی ها بگرە بیکێشە !
ـ ئاخر... !
- دەستم مەگێڕەوە ! دڵم لێت دێشێ هاا !
ـ جگەرەیە ؟ !
- ئەی وا دەزانی چییە ؟ ! بگرە !

(( لێم وەرگرت و مژێکی هێواشم لێدا کە گوتی))

- خۆ ئاوا ناکێشرێ ! دووکەڵەکەی بە هەناسەتەوە هەڵمژە !

(( مژێکی دیکەم لێدا و کەمێك دووکەڵەکەیم هەڵمژی کە دەستم بە کۆخە کرد . لەناکاو سوهەیل دەستی بە پێکەین کرد. من دەکۆخیم و ئەویش پێدەکەنی, ئاوم لە چاوان هات, کە لەناکاو دەستی بە مووی سەرمدا هێنا و نازی پێدام و گوتی))

- کاتێك دەکەویە حاڵەتی گریان و فرمێسك لە چاوانت دێ, چەندە جوانتر دەبی! خەریکە عاشقم دەکەی!

(( نازانم چۆن بوو هەستێکی تایبەتم بۆ دروست بوو و مژێکی دیکەم لە جگەرەکە دا ! ئەوجار قایمتر دووکەڵەکەم هەڵمژی! لەوانەیە بۆ ئەوە بووبێ کە زیاتر بکۆخم و فرمێسك لە چاوانم بێ, تا سوهەیلیش پێی خۆش بێ, کە هەر واش بوو! دەستی توند و باڵی بەرز کە وەك قەڵغانێك پارێزگاریی لێ دەکردم, هەستێکی وەك ڕەهاییم لا دروست ببوو! گۆڕان! پڕبوون! بەتاڵ بوونەوە و ئاخیرەکەشی هەستێکی پەشیمانی! بوون بە هی یەك! هی یەك بوون! ئەو هەستەی کە بۆیەکەم جار خەریك بوو تەجرەبەم دەکرد !

سەرم گەرم گەرم ببوو و منیش وردە وردە لە پەرداخەکەم دەخواردەوە کە زیاتر گەرم ببێ! مۆسیقا بەردەوام بوو لە لێدان! لە سەرمدا! لە دڵمدا! لە تەواوی جەستەمدا!))

- هەستە بڕۆین سەما بکەین!

- ها؟!

- وەرە دەی!

(( دەستی گرتم و بردمی بۆ ناوەڕاستی هۆڵەکە! ئەو شوێنەی کە هەمووان خەریکی سەما بوون! مۆسیقایەکی خێرا و سەمایەکی خێرا! ئارەقەم کردبوو! سەر و خواری مۆسیقا وەك یەکی لێ هاتبوو و تەنها سەمام دەکرد! بە تەواوی بوونمەوە سەمام دەکرد کە خەریك بوو هەناسەم تەنگ ببێ، کە لەناکاو ئاوازەکەی قەتع بوو و لە جێی ئەو، مۆسیقایەکی نەرم و خاو دەستی پێکرد و سوهەیل هاتە پێشێ و گوتی))

- ئێستا بەوەیان ماندوێتیت نامێنێ!

(( نەمدەزانی خەریکە چی ڕوو دەدا! وەك باڵندەیەك وا بووم کە چڕنووکی بەهێزی لێ حاسێ بووە و هیچیشی پێ ناکرێ! ئەو هەست و ترسناکییەی کە هەموو مرۆڤێك لە دەروونی خۆیدا هەیەتی، ئیدی کەم ببۆوە و لەوانەیە هەر خەبەریشی نەبوو! هیچ شتێکی ترسناك بوونی نەمابوو بۆم و هەر بۆیە ئارام بوومەوە و بە ئاسانی خۆم دایە دەستی سوهەیل! ئەو هەڵسوکەوت و کارانەی کە منی بۆشوێنێکی دی بردبوو، بۆدونیایەکی دیکە کە بۆم نەناسیاو بوو! هەموو شتێك! ڕەنگی، بۆنی، دەنگی!

گەردنم تەحەممولی قورسایی سەرمی نەبوو و بەدوای شوێنێکدا دەگەڕا کە بیبینێتەوە و لێی وەحەسێ! شوێنێکی گەرم و نەرم!))

ـ نا سوهەیل! نا!

– منم سوهەیل!

ـ نامەویّ! دەترسێم!

– لە چی؟ تا کاتێك من هەم, مەترسە!

ـ نا! مەکە! تکا دەکەم! نامەویّ!

– سەیرکە! چاو لە دەوروبەرت بکە! ئەوانە ژیانی ڕاستەقینەیان دیوەتەوە!

(( دەوروبەرم پڕ بوو لەو باڵندانەی کە ئیدی خۆیان دابوو بە دەستەوە! منیش خۆمدا بە دەستەوە! وەك کەوتنە ناو بیرێکی قوڵەوە وا بوو!

( بێدەنگی)

– نازانم چەند تێپەڕی! سەعاتێك, دوو سەعات, سیّ سەعات! حاڵەتێکی سەیر بوو! وەك مەستبوون! وەك سەرخۆشی! چاوم نەیاندەبینی! لە هەموو شوێنێکی جەستەم دەنگی داواکردن دەهات! ئەوەندە گەرم ببووم کە ئەگەر شقارتەم بە دەستم گرتبا, پیّ دەبوو!

(بێدەنگی)

(( کاتێك گڵۆپەکانیان پێکردن وەخۆ هاتمەوە! دەتگوت تەواوی ئەو باڵندانەی کە لەویّ بوون, وەخۆ هاتوونەوە! سەیر ئەوە بوو کە هەموومان یەك کارمان دەکرد: قۆپچە داخستن, ڕێککردنەوەی جلەکان, دەست لە پرچدان!))

(دەنگی پێکەنین)

(( ئاهەنگەکە تەواو ببوو! مێزی نان خواردن ئامادە و دەستلێنەدراو! مرۆڤەکان هەموو تێرکراو! لەوانەشە نیوەتێر!))

ـ سەعات چەندە سوهەیل؟

– دوازدە!

ـ ئۆوو! دەبێ بگەڕێمەوە ماڵێ!

– ئێستا کە شەوە!

ـ نا! نا! دەبێ بگەڕێمەوە!

– ئەو کارەت ناڕەحەتم دەکات!

ـ ناچارم سوهەیل گیان! ناچارم!

– چاو لێکە! ئەوانە ئیدی هەر یەکەو دەچنە شوێنێکی دی!

ـ ناتوانم سوهەیل! ناتوان! تێبگە!

(( سواری سەیارە بووین بەڵا لێم توڕە بوو و تا گەیشتینە پێش دەرکێ قسەی دەگەڵ نەکردم! هەرچەندە قسەم دەگەڵ دەکرد جوابی نەدامەوە! بۆخۆم زۆر ناڕەحەت بووم! حەزم دەکرد لەگەڵی بمێنمەوە! تا بەیانی! تا هەتایە! تا تێربوون!

ـ خواحافیزیم لێ ناکەی؟

– خواحافیز!

ـ سوهەیل!

– خواحافیز!

(( سوودی نەبوو! زۆر لێم توڕە بوو! بە هێواشیی دابەزیم و هێشتا دەرگای سەیارەم پێوە نەدابۆوە, کە بە خێرایی پێی لە گازی[1] نا و بە تەناش تایەکانی وەڕێ کەوتن و من مامەوە و دونیایەك لە حەسرەت! حەسرەتی تەنهایی و ڕازیی نەبوون!

[1] زۆرینەی سەیارەکانی ئێران گازن نەك بەنزین, هەیە هەندێکیشیان بەنزین و گازن, بەڵام زیاتر سەیارەکانی ئێران بە گاز کار دەکەن.

کاتێك بە کلیل دەرگای ماڵێم کردەوە و بە هێواشی چوومە ژوورێ, شوکا وەك پشیلە, هێواش و بێ هەست و خوست هاتە پێش! بێدار بوو و چاوەڕوان! هەتا سلاّوم کرد لە زۆر شت تێگەیشت!))

- چت خواردۆتەوە؟!

- هیچ!

- بۆنت لە زاری دێ! چت خواردۆتەوە؟!

- هێواش هێواش! ئەوە چتە؟! بابم لە کوێیە؟

- نووستووە!

- خۆ هیچ نەبووە؟!

- نا, خەیاڵت ئاسوودە بێ! چی داویەی خواردووتەوە؟

- شتێکی نەرم! مەترسە!

- ئەفسانە!

- گوتم مەترسە! ئاگام لە هەموو شت هەیە!

- جارێ بڕۆ بنوو تا بابت وەخەبەر نەهاتووە! لە مەترێکڕا دیارە کە چت خواردۆتەوە!

(( جلەکانم گۆڕین و چوومە سەر جێخەوەکەم, وەلێ دەتگوت هێشتا هەموو شتێك بەردەوامە لەگەڵم! سەعات لە دوازدە لایدابوو و جادوو بەتاڵ ببۆوە, بەڵام سەندرێلا نەیدەویست باوەڕ بەوە بکات! هێشتا لە ئاهەنگەکە بووم و دەگەڕام! تەواوی ڕووداوەکان لە پێش چاوم بوون و دووبارە دەبوونەوە و هەر جار کە دووبارە دەبوونەوە دەمویست سات بە ساتیان دووبارە هەست پێ بکەم! وەکو چیرۆکێك کە هەر جارێك لە گێڕانەوەی چێژ وەردەگری! لەو چیرۆکەشدا سوهەیل براوە بوو! شازادەیەك کە تەواوی چیرۆکەکە ئەو بوو! ئەسڵەن تەواوی ئاواتەکانم

سوهەیل بوو و جگە لەو سنوور بوو! چاوم لە هەر کوێیەك کردبا سوهەیل بوو! بە چاوەکانی! بە خەندەکانی! بە وتەکانی! بە دەنگی!

تا بەیانی خەوم پێوە دیت و داوام دەکرد!

(بێدەنگی)

– تەرانە؟! تۆ دەزانی یەکەم عەشق بۆ کچ چ مانایەکی هەیە؟! حەتمەن دەزانی! یەکەم عەشق چەندە بەهێز و پتەوە!

لە بەیانییەوە ئیدی هیچ قسەیەك بێجگە لە قسەی سوهەیل مانایان نەبوو! هیچ کەسێك جگە لە سوهەیل بوونی نەبوو بۆم و هەر شتێك جگە لە سوهەیل بێ مانا بوو بۆم!

تا پێش ئەو شەوە حەزم دەکرد قسە لەگەڵ شوکا بکەم. لە هەموو بوارێکەوە! دەربارەی سوهەیل, کارەکانی, وتەکانی, ئەو شوێنانەی کە چووبووین و ئەو شتانەی کە دیتبوومانن, وەلێ دوای ئەو شەوە ئیدی شوکام بە بێگانە دەزانی! هەتا حەزم لێ نەبوو هەر ناوی سوهەیلیش ببیستێ! تەعەسسوبێکی تایبەتم هەتا بە ناوەکەشیەوە بۆ دروست ببوو! وەك ناوێکی پیرۆزی لێ هاتبوو بۆم! دەترسام قسە لەگەڵ شوکا بکەم و لەناکاو شتێکی خراپ دەربارەی بڵێ و نەتوانم خۆم کۆنترۆڵ بکەم و لەگەڵی بکەمە شەڕ!

عەشقی یەکەم!

پاك, ڕووخۆش, بێ گوناه, جوان و خەیاڵی!

ئەو عەشقەی کە جیاواز بوو لە تەواوی عەشقەکانی دی و لەوانەیە من یەکەم کەس بوویم کە درکم بەو هەستە کردبێ! وامدەزانی کە کەس ناتوانێ لێم تێ بگات و درکم پێ بکا! یانی بە هیچ شێوەیەك ئاگام لەوە نەبوو کە کێ چ دەڵێ! ئەگەریش گوترابا, من گوێم لێ نەبوو!

بەيانييەكە تەلەفونم بۆ كرد, بەڵام لەسەر نامەی دەنگی بوو! دووبارە بۆم كردەوە! ديسان هەر وا بوو! دڵی خۆم دەدايەوە و دەمگوت حەتمەن دوای نيو سەعاتی ديكە دێ و نامەكەم وەردەگرێ و تەلەفونم بۆ دەكات, بەڵام وا نەبوو! هەينيی بوو و بابم لە ماڵێ بوو! بە هەر دەردەسەرييەك بێ سێ چوار جاری دی تەلەفونم بۆ كردەوە بەڵام هەر جواب نەبوو! پێم وا بوو چۆتە ماڵێ دايكی. دڵی خۆم خۆش كرد كە دوای دوو سێ سەعاتی ديكە دێتەوە, وەلێ ديسان وا نەبوو!

شەو داهاتبوو و من هەر خەريك بووم تەلەفونم بۆ دەكرد! دوا تەلەفون كە بۆم كرد ئيدی لەسەر نامەی دەنگيی نەبوو! تەلەفونەكەی هەڵگرت و دايخستەوە! بەو شێوەيە تێيگەياندم كە لێم تورە بووە و نايەوێ جوابم داتەوە! لە خوايەكم دەويست كە تەلەفونەكە هەڵگرێ بۆ ئەوەی داوای لێبوردنی لێ بكەم! لە خوايەكم دەيويست كە جوابی تەلەفونەكە بداتەوە تا بە هەر شێوەيەك بێ لە دڵی نەگرێ! لە خوايەكم دەويست كە قسەم دەگەڵ بكات و هەرچی چۆن بێ متمانەم پێ بكات و لێم ببورێ, بەڵام هيچ لەوانە نەبوو! دڵی زۆر ڕەقتر بوو لەو قسانە! حەتمەن دەويست تەمبێم بكات! داركارييەكی قورس كە شايستەی نەبووم!

دەزانی تەرانە كاتێك لەو تەمەنەدا مەعشوقەكەت لێت تورە دەبێ دەڵێی قيامەت هەستاوە! تەواوی غەم و خەفەتەكانم دەكەونە دڵتەوە! دەڵێی خەريكە گيان دەسپێری, بەڵام مردنێكی شيرين! هەر جارێك كە خەريكە گيانت دەربچێ, عەشق بانگت دەكات و دەتگەڕێنێتەوە بۆ دونيا و ديسان هەموو شت لە سەرەتاوە!

لە بيرمە ئەو ڕۆژە ئەسڵەن نانم نەخوارد! ڕەنگم پێوە نەمابوو و وەك نەخۆشانم لێ هاتبوو, كە چەند ڕۆژان نەخۆشن و لاوازيی تەواوی گيانی داگرتوون! خۆم لە چاوی بابم دەدزييەوە! پێم وا بوو كە ئەگەر بۆ جارێك سەيری چاوەكانم بكات, لە

هەموو شت تێ دەگات! لەو نێوەدا شوکا بوو کە یارمەتیی دەدام و بە هەر شێوەیەك بێ, بابمی سەرقاڵ دەکرد تا لە وەزعی ڕوحیی من تێنەگات! ئاخیرەکەش بە زۆر بابمی هەڵگرت و لەگەڵ خۆی بردییە دەرێ کە پیاسە بکەن و من بتوانم بە دڵێکی ئاسودەوە تەلەفون بۆ سوهەیل بکەم!

کاتێك ئەوان ڕۆیشتن, دەتگوت خودا دونیای پێ داوم! خێرا تەلەفونەکەم هەڵگرت و پەیوەندیم پێوە کرد و دوای دەنگ تەسجیل کردن گوتم))

ـ ئەلوو, سوهەیل!

ـ دەزانم لەوێی و گوێت لێیە!

ـ تەلەفونەکە هەڵگرە!

ـ ئەوە زیاتر لە دە جارە پەیوەندیت پێوە دەکەم!

ـ ئەگەر هەڵی نەگری ئیدی تەلەفون ناکەمەوە ها!

ـ زۆر باشە! دەتەوێ هەموو شت تەواو بێ؟!

ـ باشە! بەڵام خۆت وات دەوێ ها!

ـ تا سێ دەژمێرم, ئەگەر هەڵت گرت هەڵت گرت دەنا تەلەفونت بۆ ناکەمەوە! یەك, دوو, سێ!

ـ تەواو بوو ها!

ـ ئیدی خەریکە بێتامی دەکەی! هەڵیگرە ئیدی!

ـ زۆر کەللەڕەقی! بۆ مەگەر چی بووە؟!

ـ هەڵیگرە بۆت باس دەکەم!

ـ باشە ئیدی ئیلاقەم نی! خوا حافیز!

(( تەلەفونەکەم داخستەوە! گریان قورگی گرتم! دانیشتم و دەستم کرد بە گریان! لێل و شێرن! سزایەکی دلگیر و قورس و شێرن!

ئەو شەوە دوای ئەوەی کە بابم و ئەوان گەڕانەوە و نانی ئێوارەمان خوارد, زووتر چووم بنوم! دەمزانی ئیدی تەلەفون ناکات! تەواوی هیواکانم بۆ سبەی هەڵگرتن! ئەو بەیانییەی کە توڕەییەکەم تەواو دەبوو و قسەی دەگەڵ دەکردم و منیش هەرچی چۆن بێ بۆم ڕوون دەکردەوە کە لە دڵی نەگرێ, چونکە ئیدی تاقەتی بەسەر بردنی ڕۆژێکی دیکەم نەبوو!

بەیانی کە لە خەو هەستام, بابم ڕۆیشتبوو. بۆخۆشم دەرسم هەبوو و دەبوو بچم, بەڵام تاقەتم نەبوو! هەر دەبوو قسەم دەگەڵ سوهەیل کردبا دەنا ئەسڵەن نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێك بکەمەوە!

دووبارە تەلەفونەکان دەستیان پێ کردەوە! هەر سەعاتە و تەلەفونێك و نامەیەك, بەڵام بێ وڵام بوون!

خەریك بوو عەشقەکەم ڕەنگی دەگۆڕا! ڕەنگی ڕق, تۆڵە, کینە!

لە تەلەفونەکانی ئاخیریدا ئیدی هەموو قسەکانم تەهدید و تۆمەت بوون و دواتریش دونیایەك پەشیمانی لە وتەکانم! هەر جارێکیش, لە نێوان هەر تەلەفونێکدا شوکا دەهات و قسەی دەگەڵ دەکردم!

قسە نا, ئامۆژگاری! هەر جارێکیش ئەوەندە لێی توڕە دەبووم کە حەزم دەکرد شەڕی لەگەڵ بکەم! بە ناچاریی جوابێکم دەدایەوە! ئەویش لەبەر ئەوەی ناچار بووم! یانی ئیشم پێی بوو!

– ئەوەندە تەلەفونی بۆ مەکە! سوك دەبی هاا!

ـ حەتمەن لە ماڵێ نییە!

– بەو نامانەی کە بۆت ناردوون خۆت شەرمەزار کردووە! ئێستا با لە ماڵێش نەبێ, بگەڕێتەوە و ئەوانە ببیستێ کە گوتوتن! خۆت بە قوربان دەکا!

ـ شوکا تاقەتم نییە!

- ئێستا لەسەر چی شەڕتان بووە؟
- دوای ئاهەنگەکە دەویست زیاتر لەگەڵی بمێنمەوە!
- ئێ پێت گوتبا کە ناتوانی!
- پێم گوت! بەڵام گوێی نەدەگرت! زۆری خۆش دەویێم!
- ئەی بۆ جوابت ناداتەوە؟!
- تورە بووە! سروشتی وایە!
- هیچیکە تەلەفونی بۆ مەکە! هەر ئەو بیست سی جارەش کە بۆت کردووە زۆر لە کنی سوك بووی!
- دەبێ چاك بێتەوە لەگەڵم!
- کەواتە ئەگەر بەیانیی سوارت بوو تێدەگەی!
- تۆ نازانی چ هەستێکی هەیە! زۆر دڵناسکە!
- جارێ ئەوە تۆی شکاندووە! خەریکە یاریت پێ دەکا ئەفسانە!
- من بۆخۆم دەزانم چ دەکەم!
- لە سەرەتاوە پێم گوتی کە ئەوە وەکو ئەو گەنجە حەڤدە هەژدە ساڵانە نییە!
- لەوان سادەترە! بە خوای! باوەڕ ناکەی؟!
- نا, ئەو ئەوەندە ماری خواردووە! ژەهراویی بووە! ئاگات لە خۆ بێ ئەفسانە!

(( ئەوەندە لێی تورە ببووم کە حەزم دەکرد هەرچی لە زارمەوە دێتە دەرێ پێی بڵێم. وە لە دەستی سوهەیلیش هەر وا! بۆچی دەبێ کارێك بکات, کە من شەرم لە شوکا بکەم و شەرمەزار بم و قسەیەکم بۆ گوتن نەبێت!

دووبارە تەلەفوونم کردەوە! دووبارە نامەی دەنگی! دووبارە نامە! ئەوجار زۆر تونتر لە جاری پێشتر!))

- ئەلوو!

- مردی؟!

- بەڕاستی زۆر خوێڕیی سوهەیل! ئەسڵەن پێم وا نەبوو ئاوا بی! زۆر خوێڕی! ئەلوو!

- پیسی پۆخڵ, ئیدی تەواو بوو! زۆر ڕووم دایەی! ونبە! ئیدی نامەوێ هەتا گوێم لە دەنگت بێت!

(( ئەوە کۆتا نامەم بوو کە ئەو شەوە بۆم نارد. چەندە زوو ئەو ئەشقە بۆ نەفرین گۆڕا بوو! حەزم دەکرد لەو کاتەدا لە تەنیشتم بێ, تا مێشکی بپڕژێنم! دەبوو پیشانی بدەم کە منیش دەتوانم وەك ئەو بم! کاتێك وە پاڕانەوەم هێنا تێدەگات کە نابێ ئەو جۆرە ڕەفتارانە لەگەڵ کچێك بکات!

بە تایبەت خۆم سەرقاڵ کرد تا بیری لێ نەکەمەوە! بە تەلەڤزیۆن, تەسجیل, کتێب, بەڵام نەدەکرا! سات بە سات دەهاتە ناو مێشکەوە! هەرچۆچۆنێك بێ لە کۆتایدا خەوم لێکەوت و نووستم! جا چ خەوێکم دیتن؟ ناتوانم بڵێم, بەڵام نیوەی خەونەکانم شیرین و نایاب بوون و نیوەکەی دیکەشیان خراپ و تاڵخ بوون! هەر جارێکیش دەتگوت یەکێك هەڵمدەستێنێ و خەوەکەم نیوەچڵ دەمایەوە! بەیانی کە لە خەو هەستام, زۆر بەپەلە نانی بەیانیم خوارد و جلەکانم دەبەر کرد و بە شوکام گوت: دەچمە دەرس و زوو لە ماڵ هاتمە دەرێ و لەسەر جادە تاکسییەکم گرت و ناونیشانی باڵەخانەی سوهەیلم پێ گوت.

نیو سەعات دواتر گەیشتین. خێرا پارەی تاکسییەکەم دا و چوومە پێش دەرگا و لە جەڕەسم دا. بەڵام کەس وڵامی نەدایەوە. حەوت هەشت جار جەڕەسم لێ دا, وەلێ هیچ هەواڵێك نەبوو. ئیدی بۆ کۆتا جار دەستم لەسەر جەڕەسەکە دانا و هەر وا لێی گەڕام! حەزم دەکرد بە بەرد لێی ڕاکێشم و شووشەی باڵەخانەکە بشکێنم! کە لەوانەیە ئاوا ناچار بێ بێتە دەرێ!

دڵم شکا! هەستم بە پەشیمانیی کرد! ئەوە بۆ یەکەم جار بوو کە ئەزموونی ئەو هەستەم دەکرد! هەموو کات وا بیرم دەکردەوە کە بەرانبەر ڕەگەزی جیاواز, براوەم, بەڵام تێگەیشتم کە بەو شێوەیە نییە! شوکا ڕاستی دەکرد! سوهەیل ئیدی منداڵێکی هەڤدە هەژدە ساڵ نەبوو! بە دەستی بەتاڵ و بێ هیوا بەڕێ کەوتم بە جادەکاندا! هەر وا بەبێ ئامانج ڕێم دەبڕی و بیرم دەکردەوە! هەر بەڕاستی عاشقی ببووم, بەڵام ئەو ڕۆژە نەمدەزانی کە ئەو جۆرە ئەشقانە, ئەشقانێکی گەورە نین! بە شێوەیەك کە هەم بۆ ئەو و هەم بۆ منیش زۆر زوو دەگۆڕا بۆ ڕق و نەفرەت!

دوای دوو سێ سەعات گەڕامەوە ماڵێ و تا شوکا دەرگای کردەوە, دەستم بە گریان کرد! شوکام لە باوەش گرتبوو و دەگریام! ئەویش لەگەڵم دەگریا! هەرچۆنێك بێ دوای دوو سێ دەقە منی بردە دەستشۆر و دەموچاوی شردم و پێکەوە چووینە چێشتخانە. قاوەی دروست کرد و فنجانێکی لە پێشم دانا و گوتی))

- ئێستا ئەوەندە خۆت ئەزیەت مەدە! لە بەرانبەردا دەرسێکی باشت لە ژیان وەرگرتووە!

ـ پێم وا نەبوو بەم شێوەیەی لێ بێ!

- یارییەکانی ژیان!

ـ ئێستا چ بکەم؟!

- چاوڕێ کردن! هەڵبژاردن! خۆ لە دونیادا هەر ئەو سوهەیلە نییە! ئێستا وا بیر دەکەیەوە! چوار ڕۆژ تێپەڕێ, ئەویش وەك ئەوانی دی لێ دێ!

ـ من نامەوێ سوهەیل وەك ئەوان بێ!

- بۆچی؟!

ـ لەبەر ئەوەی ئەو لە هەموان جیاوازترە !

– بەڵێ! لەبەر ئەوەی کە ئەو کەسی یەکەمە کە تۆ ئەزموونت لێ وەرگرتووە !

ـ نا ! کەسی دیکەش بۆ من هەبوون!

– نەخێر تۆ بۆ ئەو کوڕانە یەکەم بووی کە ئەزموونیان وەردەگرت!

ـ یانی سوهەیلیش دەیەوێ هەمان کار بکات, کە من لەگەڵ ئەوانی دیکەدا کردوومە؟!

– بەڵێ! بەڵێ! بەڵێ!

ـ ئەو خۆشیدەوێم!

– هەتا ئەگەر واش بێ, حەتمەن ئازارت دەدا و دەتشکێنێ!

ـ ئێ, ئێستا چی بکەم؟!

– لە سەرەتاوە نەدەبوو ئەوەندە ڕەهای بکەی! سەد جاریش پێم گوتی و گوێت نەگرت! ئێستا ئەو تێگەیشتووە کە لە بەرانبەر ئەودا چەندە لاوازی! ئێستاش تەنیا دەبێ چاوەڕێ بکەی! هەتا ئەگەر جەڕەسیشت بۆ بکا, نابێ جوابی بدەیەوە !

ـ ناتوانم! ناتوانم!

– دە بخۆ مادام! هەقتە!

(( دووبارە دەستم کردەوە بە گریان و دیسان شووکا هات و دڵی دامەوە کردم و فرمێسکەکانمی سڕییەوە و دیسان قسەی دەگەڵ کردم, تا هێور بوومەوە! بینیم باشترە کە گوێی لێ بگرم. ئیدی بەلای تەلەفوندا نەچوومەوە! شوکا ڕاستی دەکرد. سەعات چوار بوو کە جەڕەسی تەلەفون لێیدا. بەڵام وڵامم نەدایەوە تا چوار جەڕەس ڕۆیشت و بوو بە نامەی دەنگی! دەنگی خۆی بوو. جوان و

پیاوانه! له‌ناکاو ڕام کرد بۆ لای ته‌له‌فوونه‌که, که له‌ناکاو شوکا ده‌ستی گرتم و گوتی))

- ولّامی نه‌ده‌یه‌وه!

ـ ئاخر!

- ئاخر و ماخری ناویّ! ولّامی مه‌ده‌وه ئه‌فسانه!

(( شل بووم و له ته‌نیشت ته‌له‌فوونه‌که ڕاوه‌ستام و گوێم گرت))

- ئه‌فسانه؟ له مالّیّ نی؟!

- من له مالّێم! ئه‌گه‌ر ویستت ته‌له‌فون بکه! خوا حافیز!

(( له‌ناکاو ده‌ستم چووه ئه‌وه‌ی که ته‌له‌فوونه‌که هه‌لّگرم, به‌لّام شوکا ده‌ستی له‌سه‌ر دانا و نه‌یهێشت و سوهه‌یل ته‌له‌فونه‌که‌ی داخسته‌وه! زۆر په‌ژیوان بوومه‌وه و خه‌ریك بوو شتێك به شوکا بلّێم که ئه‌و زوو گوتی))

- مه‌ترسه! دووباره ته‌له‌فون ده‌کاته‌وه! ئارامبگره! ئه‌و ده‌بیّ به‌دوای تۆدا بیّ نه‌ك تۆ به‌دوای ئه‌و! ئێستا بڕۆ له شوێنێك دانیشه تا دووباره خۆی ته‌له‌فون بکاته‌وه! ده‌بیّ چاوه‌ڕیّ بکه‌ی تا هیچ نه‌بیّ دوو سیّ جار ته‌له‌فون بکات دواتر ولّامی بده‌وه!

(( ئیدی له‌و کاته به‌دوا, هه‌ر ده‌قیقه‌یه‌ك وه‌ك سالّێك بۆم تێده‌په‌ڕی! ئێستا ئیدی ده‌مزانی سوهه‌یل له مالّێیه و چاوه‌ڕێی ته‌له‌فونی منه! ئیدی سه‌بر و ئارامم لیّ هه‌لّگرابوو! خه‌ریك بووم له هزرمدا بێتاوانم ده‌کرد! حه‌تمه‌ن له مالّیّ بوو! له‌وانه‌یه ڕۆشتبیّ به‌دوای کارێکدا! نه‌کا نه‌خۆش بووبیّ؟! له‌وانه‌شه سه‌ردانی دایکی کردبیّ!

کاتێك گوێم لە دەنگی بوو, تەواوی ئەو نەفرەت و ڕق و کینانە گۆڕان بۆ عەشق! چەند سادە و گێلانە! وەکو یاریی منداڵان, دەمێك لێك تورە دەبن و دەمێکی دی لەگەڵ یەکدی ئاشتدەبنەوە!

چاوم تەنیا لەسەر سەعات بوو و گوێم لە تەلەفون! سەعاتێك تێپەڕی و هیچ هەواڵێك نەبوو! دڵم ئۆقرەی نەبوو! نەکا ئیدی تەلەفون نەکاتەوە؟! نەکا دیسان کەللەڕەقی بکات؟! نەکا شتێکی لێ هاتبێ؟! حەتمەن هەر وایە! شتێك هەر بووە!

ئیدی نەمتوانی خۆم ڕابگرم! چاوەڕێم کرد تا شوکا چۆ سەرئاو و خێرا دەرپەڕیم و ژمارەکەم لێدا! سێ جار ڕۆیشت و بۆخۆی هەڵیگرت!))

- فەرموون!

- ئەلوو! سوهەیل!

- سەلام!

- هیچت پێ نەڵێم؟!

- دەتەوێ بڵێی چی ؟

- بۆچی جوابی تەلەفونەکانت نەدەدامەوە؟!

- نەمدەویست قسەت دەگەڵ بکەم! زۆر لێت تورە بووم!

- ئاخر بۆچی؟!

- چونکە هەموو شتێکت تێکدا!

- چیم تێکدا؟!

- من بۆ ئەو شەوە پلانی زۆرم هەبوو! دەمویست قسەت لەگەڵ بکەم! زۆر پێویستم بەوە بوو کە تۆ لەکنم بی! شەوەکە تا بەیانیی نەخەوتم!

- ڕەببی بمرم بۆت سوهەیل! منیش نەنووستم! هەزار فکرم لە مێشکدا بوو! دەمم لە هیچ نەداوە! خەریك بوو شێت بم! هەزار فکرم کردۆتەوە!

ـ سوودی چییە؟! ئەو شەوە تێپەڕی و هەرگیز ناگەڕێتەوە! وەکو تەواوی ئەو ساتانەی کە زۆر گێلانە, تەواوی خەڵکی لە دەستی دەدەن و بۆیان دووبارە نابێتەوە!

ـ ئاخر تۆش دەبێ حاڵەتی من لەبەر چاو بگری!

- من وا بیرم دەکردەوە کە تۆ کچێکی ئازادی!

ـ ئازادم بەڵام چەند مەسەلەیەکیش هەیە!

- من ناچاری کارێکت ناکەم! تۆ دەتوانی ژیانی خۆت هەبێ و منیش ماڵی خۆم!

ـ سوهەیل! توخوا وا قسە مەکە!

(( لەو کاتەدا وەرگەڕام و شوکام دیت کە لە پشتەوەم ڕاوەستابوو و خەریك بوو سەیری دەکردم! ئیدی گرنگ نەبوو بۆم! ئەویش سەرێکی ڕاوەشاند و ڕۆیشت!))

- ئێ باشە! ئێستا بڕۆ دواتر تەلەفونت بۆ دەکەمەوە! جارێ بڕۆ!

ـ نا سوهەیل! چاوەڕێکە! دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم!

- بە تەلەفون قسە ناکرێ!

ـ ئەدی چ بکەم؟!

- ئەگەر دەتەوێ قسە بکەی, وەرە ئێرە!

ـ باشە دێم, سبەی دێم!

- چاوەڕێتم!

ـ ئیدی لێم توڕە نی؟!

- زۆر نا!

ـ خۆشمدەوێی سوهەیل!

- چی؟!

ـ گوێت لێ بوو چیم گوت؟!

- نا, گوێم لێ نەبوو!

ـ خۆشمدەوێی! زۆر زۆر!

- دڵنیای؟!

ـ بەڵێ! بەڵێ! بەڵێ!

- چاوەڕێتم!

ـ باشە سبەی لەوێم!

- خوا حافیز منداڵ!

ـ من ناڕەحەت نابم! تۆ بڵێ! وەلێ من منداڵ نیم! دواتر بۆخۆت تێدەگەی!

- جارێ خوا حافیز!

(( تەلەفونەکەی داخستەوە. چەند چرکەیەك ڕۆیشت موبایلەکە هەر لە دەستمدا بوو, دواتر منیش دامخستەوە و هەر وا ڕاوەستام. شەرمم دەکرد بەرانبەر شوکا ببمەوە, وەلێ چارە نەبوو. چووم بۆ لای چێشتخانە. لەسەر مێزەکە دانیشتبوو. جگەرەیەکیشی پێ کردبوو و هەر سەیری منی دەکرد! چوومە ژوورێ! دەنگی نەکرد کە بۆخۆم دەستم پێکرد!))

ـ شوکا! بەدەست خۆم نییە! زۆرم خۆشدەوێ!

- دەزانم! هەر بۆیە بەدبەختت دەکات! پیاوان کاتێك تێدەگەن کە ژنێك یان کچێك عاشقیان بوونە! وەك دڕندەیان لێ دێ!

ـ سوهەیل وا نییە!

- بۆ نا, وایە! دواتر بۆخۆت تێدەگەی! ئیدی ئامۆژگاری و ئەو شتانە هیچ سوودێکی نییە! ڕێیەکە دەبێ بۆخۆت پێیدا بڕۆی تا تێبگەی! کاتێك دڵی شکاندی, ئەقڵ دێتە ناو کەللەتەوە!

(( ئیدی شوکا قسەی لەگەڵ نەکردم ئەو شەو و ڕۆژە. منیش زۆر نەچوومە کنی, چونکە زۆر دڵتەنگ بوو! دەمزانی خەمی منیەتی, بەڵام منیش بە دەستی خۆم نەبوو!

بەیانییەکە جلێکی جوان و سپۆرتم دەبەر کردن و ئاڕایشم کرد و لە ماڵ هاتمە دەرێ و تاکسییەکم گرت و چوومە پێش دەرگای ماڵێیان. نزیکەی سەعات دە و نیو بوو کە لە جەرەسی باڵەخانەکەیم دا. بەبێ ئەوەی جوابی ئایفۆنەکە بداتەوە, دەرگای کردەوە و چوومە سەرێ!

دەرگای ژوورەکەشی کراوە بوو, هەر لە پێش دەرگاکە ڕاوەستام و بانگم کرد))

- سوهەیل! سوهەیل!

- وەرە ژوورێ! لێرەم.

- بۆچی دەرگا کراوەیە؟

- بۆ تۆم کردۆتەوە, وەرە ژوور.

(( چوومە ژوورێ و دەرگام پێوەدا. لە هۆڵەکە لەسەر قەنەفێك دانیشتبوو و سەیری دەکردم. دوو هەنگاو چوومە پێشێ و گووتم))

- کاتێك خاتوونێك دێتە ماڵێت, جوان نییە کە هەر وا دانیشی و سەیری بکەی!

(( هەستا و هاتە پێشێ و سەیری کردم و گوتی))

- ڕاستییەکەی سەرەتا نەمویست بێمە پێشێ, بەڵام کاتێك بینیمی, ئیدی لەخۆڕا نەمتوانی لە جێگەی خۆم هەستم!

- بۆچی؟!

– چونکە زۆر جوان و قەشەنگ بوویی!

(( سەیرم کرد! ناتوانم بڵێم لەو کاتەدا چ هەستێکم هەبوو! حەزم دەکرد لە خۆشیان هاوار بکەم!))

ـ نا سوهەیل؟!

– بۆچی نا؟!

ـ ئەو کارە دروست نییە!

– مەگەر نەتگوت خۆشمدەوێی؟!

ـ بۆنا؟! بەڵام من ئاوام ناوێ!

– یانی حەتمەن دەبێ هاوسەرگیریت لەگەڵ بکەم؟!

ـ بۆ چما عەیبی هەیە؟!

– پێم وا بوو کە تۆ لەگەڵ ئەوانیتر جیاوازی, وەلێ بەو شێوەیە نییە, هەموو کچان وەك یەکن!

ـ هاوسەرگیریی شتێکی خراپ نییە!

– نا نییە! بەڵام نەك ئەوەی کە هەر دوو کەس پێك ڕازیی بوون, خێرا بچن و پەیمان ببەستن!

ـ هاوسەرگیریی شتێکی پیرۆزە!

– ئێستا دەکرێ یەکتر بناسین یان نا؟!

ـ بەڵێ! بەڵام نەك بەو شیوەیە!

– ئەوەش جۆرێکە لە ناسین و وریایی شتە تایبەتییەکانی یەکتر! تۆ پێی ڕازیی نی؟!

ـ تۆ شێتی!

– تۆ هێشتا نازانی ئیشی خۆت چییە! تۆ منداڵی!

ـ نا, من منداڵ نیم!

– یەك دوو ساڵی دیكە گەورە دەبی!

ـ دەڵێم منداڵ نیم!

– دوو سێ ساڵی دیكە گەورە دەبی!

(( تورە ببووم! حەزم نەدەكرد كەس پێم بڵێ منداڵ! دەبوو بیسەلمێنم كە كچۆڵە نیم! زۆر بۆم گرنگ بوو! لەوانەیە ئەوە بەهانەیەك بووبێ كە پشت لە بەڵێنەكان بكەم! بەڵێ! ئەوە بەهانە بوو. هەموو شتێك لە دەست خۆمدا بوو كەس نەیدەتوانی ناچاری كارێكم بكات! ئەوە خۆمم كە بڕیار دەدەم! ئەوە خۆمم كە بڕیارم داوە!

دونیا خەریكە دەسوڕێتەوە! وەكو چەرخوفەلەك! منیش لەگەڵی دەسوڕێمەوە! بەبێ پشتگیری!

سەرم لە گێژەوە دەهات!

وەكو ئەو كاتەی كە لە شاری یاریی سواری چەرخوفەلەك دەبووم! لەسەر دونیاش وا دەسوڕێتەوە؟!

نازانم ماوەی چەندی خایاند! بەڵام بۆ من وەك ساڵێك وا بوو. لەوانەشە زیاتر!))

– كەواتا گەورە بووی و من هەڵە بووم!

ـ تۆش چاك شارەزای مرۆڤ هەڵخەڵەتێنی هاا!

– خراپ بوو؟

ـ نا!

– هیچت لێ هات؟

ـ نا!

– كەواتا ترسەكەت لەخۆڕا بوو ها؟

- لەوانەیە !

– وەرە دانیشە !

(( چووم لەسەر قەنەفێك لە تەنیشتی دانیشتم! ))

- لە ماوەی ئەو چەند ڕۆژە چت کردووە ؟ !

– هیچ!

- ئیشت لەسەر شریتەکەت نەکردووە ؟ !

– نا !

- تابلۆ چی؟ !

– نا! نا !

- بۆچی؟ !

– لەو چەند ڕۆژەدا لە دەستی تۆ هەر خەفەتم خواردوون!

- ئاخر بۆچی؟ !

– لەبەر هەمان شەو کە هەستای و ڕۆیشتی!

- یانی ئەوەندە خۆشت دەوێم؟ !

– پێویستم پێـت بوو!

- کە وایە خۆشت دەوێم!

– نازانم!

- ئێستا تۆ بوویە منداڵ!

– هەر بەڕاستمە ! نازانم!

- یانی نازانی لە بەرانبەر مندا چ هەستێکت هەیە ؟ !

– با دەزانم, بەڵام نازانم ئەوە خۆشویستنە یان نا !

- چ هەستێکت هەیە ؟ !

– دەمەویٚ هەمیشە لێرە بی! لە تەك من!

ـ ئیٚ ئەوە یانی چی؟!

– نازانم!

ـ دەبیٚ بزانی! ئەو هەستەی کە هەتە خۆ ناوێکی هەیە!

– دەترسێم ئەفسانە!

ـ لە چی؟!

– دەترسێم ئەگەر بیڵێم هەموو شت تێکچیٚ!

ـ تێکناچیٚ! بڵیٚ!

(( سەری دەبەر خۆی نا!))

ـ بڵیٚ سوهەیل!

(( بە هێواشی سەری بەرز کردەوە و گوتی))

– لەو یەك دوو ڕۆژەدا تێگەیشتم کە خۆشمدەوێی! هەر بۆیە تورە بووم و جوابی تەلەفونەکانم نەدەدایەوە! هەم لە تۆ تورە بووم و هەم لە خۆشم! حەزم نەدەکرد عاشق بم، وەلیٚ بووم! حەزم نەدەکرد بەند بم بەڵام بووم!

(( دواتر سەری نەوی کرد! دووبارە بۆخۆم ویستم و خۆم بڕیارم دا! ئەو جارە جیاواز بوو لە جاری پێشوو. وەك خلیسکە وا بوو لە جیهانێکی خەست دا! نەرم و میهرەبان! وەك ئەوەی کە لە تەیارەدا دانیشتووی و خەریکە لە زەوی بەرز دەبییەوە! ڕێك وەك ئەو کاتەی کە زۆرت برسییە و خەریکی نان دەخۆی! نازانم ئەوەشیان چەندی خایاند! لەوانەیە ساڵێکی دیکە! ئەسڵەن ئاگام لە کات نەمابوو! ئاگام لە هیچ نەمابوو و نەمدەویست ئاگادار بم! وەك ڕێکردن لە خەودا و قسەکردن! وەك خەو بینین! وەك خەوێك کە لەناکاو دەردەپەڕییە شوێنێکی

دیکه و ئەسڵەن نازانی چۆن لەو شوێنەڕا هاتوویه ئەم شوێنه! منیش کاتێك دیتم که له چێشتخانه دام و خەریکم چا دێم دەکەم!))

ـ ئەی تەمبەڵ, هێشتا ئێرەت خاوێن نەکردۆتەوە؟!

– لێی گەڕێ! وەره ئیشم پێته.

ـ بێڵه چایەکه دێم بکەم!

– دەڵێم وەره!

ـ چاوەڕێکه!

– دەڵێم هەر ئێستا وەره!

(( نازانم بۆچی له بەرانبەریدا ئەوەنده لاواز بووم! ئەسڵەن نەمدەتوانی له بەرانبەریدا بەرگریی بکەم, هەر بۆیه خێرا چادانەکەم لەسەر زەویی دانا و چوومه هۆڵ!))

– دانیشه!

(( لەسەر قەنەفه دانیشتم. دوو جگەرەی دەرهێنا و هەڵیکردن و یەکیانی دا به من و گوتی))

– کات بۆ چا دێم کردن و ماڵ خاوێنکردنەوە زۆره! لەوانەیه هەمووی بکەوێته ملی تۆ! تا کۆتایی تەمەنت!

(( ئاوڕم دایەوە تەماشای بکەم! قسەکەی زۆر مانای لەخۆ دەگرت!))

ـ بۆ تەواوی تەمەن؟!

– بەڵام وا بیر نەکەیەوە من یارمەتیت دەدەم هاا! ئەمن لەو پیاوانه نیم که له ماڵێدا یارمەتیی ژنەکانیان دەدەن!

(( خەنیی ببووم! خەریك بوو له خۆشیان جەڵته لێم بدا! وەلێ پێشم به خۆم گرت و به پێکەنینەوە گوتم))

ـ ئەسلّەن من هەر حەز ناکەم شووەکەم خۆ لە ئیشی مالّیّ هەلّقورتیّنیّ!

– باشتر!

(( مژیّکم لە سیگارەکە دا! بۆن و بەرامەیەکی سەیری هەبوو!))

ـ ئەوە چییە؟!

– ئەوروپاییە!

(( مژیّکی دیکەم لیّ دا و گوتم))

ـ دەزانی خەریکە چیم پیّ دەلّیّی؟!

(( سەیریّکی کردم و دواتر ڕۆیشتە یەکیّك لە ژوورەکان و کەمیّ دواتر هاتەوە و گوتی))

– چاوەکانت داخە!

ـ ئیدی دەتەویّ چیدیکەم لەگەلّ بکەی؟!

– چاوەکانت داخە!

(( چاوم داخستن. کەمیّکی ویست تا تیّگەیشتم چ خەبەرە! دەستی چەپی گرتم و کەمیّ دواتر, هەستم بە ساردیی ئالّقەیەك کرد لە دەستمدا! حەزم دەکرد چاوەکانم بکەمەوە, وەلیّ چاوەڕیّم کرد! دەمزانی ئەخلاقی چۆنە! توڕە و تۆسن! دەبوو چاوەڕیّ بکەم تا بۆخۆی بلّیّ چاوەکانت بکەوە, دەنا لەناکاو توڕە دەبوو!))

– ئیّستا چاوەکانت بکەوە!

(( بە ئارامی چاوەکانم کردنەوە. ئالّقەیەك ڕیّك لە پەنجەی چەپمدا بوو! ئالّقەیەکی پاك و جوان, بە ڕیزیّك لە ئەلّماسەوە! ))

ـ سوهەیل!

– هم؟!

- دەزانی ئەوە یانی چی؟!

(( سەری تەکان دا!))

- یانی منت مارە کرد؟!

- بەڵێ, وا بیر ناکەیەوە؟!

- نا! یانی بۆ نا! ئەوە یانی چی؟!

- تۆ تاکە کەسی کە لێم تێدەگەی!

- تەنها لەبەر ئەوەی کە لێت تێدەگەم؟!

- نا! تۆ تاکە کچێکی جوانی کە لێم تێبگەی!

- ئێستا پێم بڵێ!

- خۆشمدەوێی ئەفسانە! هەر بۆیە ئەم ئاڵقەیەم بۆ کڕیوی تا دڵنیا بی! من لەو کەسانە نیم کە بمەوێ یاریی بە چارەنووسی کچێك بکەم! جارێ قسەی هاوسەرگیریی ناکەم, بەڵام مانای ئەوە نییە کە دژیشیی بم! دەبێ باش بتناسم! دەبێ دڵنیا بم کە بەڕاستی منت خۆشدەوێ و ئامادەی گیانت فیدام بکەی! وەك دایکێك بۆ منداڵەکەی! یانی وەك دایك نا! مەبەستم ئەوەیە بەو ڕاددەیە خۆشتبوێم! ئەوەش بزانە ئەفسانە کە من تینووی خۆشەویستیم! ئەگەر کەسێك خۆشەویستیم پێ بدا, هیچ کات لە دەستی نادەم!

(( لەناکاو دەرپەریم و خۆم لە باوەشی هاویشت و گوتم))

- خۆشمدەوێی سوهەیل! دڵنیابە! ئەوەندە خۆشمدەوێی کە ئامادەم هەموو کارێکت بۆ بکەم!

- وریا بە! جگەرەکەت کەوت!

(( خێرا دوولا هاتمەوە و جگەرەکەم هەڵگرتەوە کە لەسەر قەنەفە دانیشت. منیش دانیشتم و مژێکی دیکەم لێ دا.))

– نیوەڕۆیە چی دەخۆی؟!

ـ هەر شتێك بێ!

– پیتزا باشە؟

ـ بەڵێ!

– جارێ بە پیتزا ئیدارە دەکەین تا ڕۆژێك بۆخۆت خواردنمان بۆ دروست دەکەی!

(( وەیش کە لەو کاتەدا چ هەستێکم هەبوو! خۆم لە جلی بووکێنی دا دەبینی و دستم لە دەستی سوهەیل دایە و بەخێراهاتنی میوانان دەکەین! دووقۆڵی لەگەڵ ئاهەنگی پیرۆز بێت سەمامان دەکرد! دووقۆڵی خەریکی بڕینی کێکی هاوسەرێتی بووین! دووقۆڵی... !

تەلەفونیانی کرد و داوای پیتزای کرد و هاتە تەنیشتم. هەستێکی سەیرم هەبوو! سەرم خەریك بوو لە گێژەوە دەهات! ))

ـ سوهەیل! سەرم لە گێژەوە دێ!

– جگەرەکەی کەمێك بەهێزە! سەرەتای ئاوایە. مژێکی دیکەی لێدەی سەرگێژەکەت دەڕوات.

(( دوو سێ مژی دیکەم لێ دا و جگەرەکەم کوژاندەوە))

– بۆچی کوژاندتەوە؟!

ـ ئێ نەمدەتوانی هیچی دیکە بیکێشم!

– ئێ دابات بە من! دەزانی چەند گرانە؟!

ـ مەگەر ئەوە چییە؟!

– ماری جوانا! ئەسڵ ئەسڵەکەیەتی!

ـ ئۆو! ئەوە بۆیە دەڵێم بۆ وام لێ هاتووە! بۆچی ئەو کارەت کرد سوهەیل؟!

– دیسان ئەوە دەترسی؟!

ـ نا ناترسم, بەڵام... !

– چاوەكانت لێكنێ و هیچ مەڵێ!

(( چاوم داخستن! ))

– چی دەبینی؟

ـ هیچ!

(( لەناكاو تێكچووم! حاڵەتێكی بێ هۆشیم بەسەر هات! ))

– ئێستا چی دەبینی؟

ـ تەنها ڕەشایی دەبیم!

– چ شێوەیەكە؟!

ـ شێوەیەكی خراپ!

– حاڵت زۆر خراپە!؟

ـ بەڵێ سەرم زۆر لە گێژەوە دێ! حەز دەكەم ڕاكشێم!

– ئێ باشە هەر لێرە لەسەر ئەو قەنەفە ڕاكشێ!

ـ دەبێ بگەڕێمەوە ماڵێ!

(( دیسان حاڵەتی بێهۆشی! دواتر بە هێمنی لەسەر قەنەفەكە ڕاكشام! تا سەرم وەسەر قەنەفەكە كرد, پێم وابێ سەعاتێكی پێچوو! بە جوانی وێنای خۆم دەبینی كە چۆن لەسەر قەنەفەكە درێژ دەبم و دیسان لە سەرەتاوە! لەوانەیە چەند جارێك خۆم دیتبێ كە لەسەر قەنەفە دەنووم! كاتێكیش كە دەمویست تەركیز بخەمە سەر هزرم, هەموو شتەكان تێكدەچوون! وێنەی هەر شتێكم بە چەند جار دەبینی ئەویش بە شێوەیەكی زۆر نایاب و پێكەنیناوی و دواتر ئەو شتە لە پێش چاوم دەڕۆیشت و لە جێی ئەو شتێكی دیكەی دەهاتە جێ! هەموو قەنەفەكان

دەتگوت ڕۆح لەبەرن و خەریك بوون دەجوڵان! دیوارەکان دەچوونە دواوە و دەهاتنەوە پێشێ! عەرد خوار ببوو!

چاوم داخست و بۆ ساتێك هەستم کرد لە شوێنێکی بەرز ڕا بە هێواشی دێمە خوارێ! لە ڕاستیی دا دەکەوتم, وەلێ دەتگوت چەتری ڕزگارییان لێ بەستبووم! بە هێواشی دەهاتمە خوارێ تا نزیك بوو پێم بەر زەویی بکەوێ و دیسان دەمدیت کە خەریکە لە شوێنێکی دیکەڕا دەکەومەوە خوار! هەر جارێکیش دڵم دەکەوتە خوارێ و حاڵم تێك دەچوو! وردە وردە کەوتنەکان زیادیان دەکرد و وەزعم خراپتر! ئەوەندەی کە وا هەستم دەکرد دایمە بەرەو خوارێ دێم! ئیدی لەمە بەدوا لە هیچ تێنەگەیشتم!

( بێدەنگی)

ـ خۆزگە ئێستا جگەرەیەکی لێبا و دەیانهێشت بیکێشم!

– ئێ! دواتر! ؟

ـ تۆ چەند ساویلکەی تەرانە!

– دەتوانم وێنای بکەم, وەلێ حەز دەکەم لە زاری خۆتەوە بیبیستم!

ـ بەڵێنت پێ دەدەم کە وێناکەت هەڵەیە!

– ئێ خێراتر بڵێ! ئێستا کات تەواو دەبێ!

ـ هیچی دیکە! پێم وا بێ سێ چوار سەعات لە خەودا بووم! خەو کە نا! بێهۆش! وەك مردن! لە هیچ تێنەدەگەیشتم! تەنها کەمێك ئەوەم لە بیرە کە وردەوردە دەهاتمەوە هۆش خۆم! سەرەتا هەستم بە سەرما کرد! پێڵووی چاوەکانم کردنەوە! هیشتا لەسەر قەنەفەکە بووم. ویستم هەستم, بەڵام سەرم لە گێژەوە هات! زۆر هەستم بە برسێتی و تینوێتی دەکرد! زارم وشك وشك ببوو! ویستم هەستم کە لەناکاو تێگەیشتم! ئۆوو خوایە گیان! خوایە گیان!

بۆ ساتێك دڵم ڕاوەستا ! هیچم دەبەر نەبوو! هەر وا بەبێ جلك لەسەر قەنەفەکە نووستبووم! لە شەرمان و لە ڕق و ترس و کینە, حەزم دەکرد بمرم! خێرا بەدوای شتێکدا گەڕام کە بە دەوری خۆمی دا هاڵێنم! دەستم بۆ ئەولا و لا برد کە لەناکاو پارچە پەڕۆیەك هاتە دەستمەوە ! خێرا بە خۆمدا دا و سەیری ئەولا و لام کرد ! کەسی لێ نەبوو. تازە تێگەیشتم کە چی بووە ! بە نەفرەتم کرد ! بە تایبەت ئەو کارەی دەگەڵ کردووم و منیش وەك نەفامێکی بێ شعوور هەڵخەڵەتاوم! لەناکاو هاوارم کرد ! ))

- سوهەیل ! سوهەیل !

(( بە هێواشی لە چێشتخانە هاتە دەرێ و پێکەنی و گوتی))

– وەخەبەر هاتی؟

- پێم وا نەبوو بەم شێوەیە بێ !

– چۆن چۆنی ؟ !

- ئاخیرەکەی ئیشی خۆت کرد ؟ !

– چ کارێك !

- بۆخۆت دەزانی دەڵێم چی !

– بەڵێ ! بەڵام ئەمن هیچ کارێکم نەکردووە !

(( کە وای گوت کەوتمە گومانەوە))

– تۆ تەنها خەوتبووی !

- ئاوا ؟ ! بە ڕووتوقووتی ؟ !

– بۆخۆت هەر وا هەڵدەستای و یەك بە یەك جلەکانت دادەنان !

- من ؟ !

– بەڵێ !

ـ ئاخر چۆن چۆنی؟! بۆچی بۆخۆم لە بیرم نییە!

(( هاتە پێشێ و گوتی))

– کاریگەریی لەسەر زۆران ئاوایە ئیدی! دواتر هیچیان نایەتەوە بیر!

ـ هەر ئەوەندە؟!

– بەڵێ, هەر ئەوەندە! پارچە پەڕۆیەکم پێدادای و لێت گەڕام تا بنووی!

ـ بەڕاستە سوهەیل؟! توخوا ڕاست دەکەی؟!

– ئەگەر درۆ بکەم خۆ بۆخۆت تێدەگەی! دەزانی چی دەڵێم!

(( بۆ ساتێك بیرم کردەوە! ڕاستی دەکرد! دەتگوت هیچ ڕووداوێکم بەسەر نەهاتووە! هێشتا دەستم لێ نەدرابوو!))

– ئاڵقە هێشتا لەو شوێنەدایە کە هەبوو! مەگەر وا نییە؟!

(( سەیری دەستم کرد! ئاڵقە لە دەستمدا بوو! لەناکاو دڵم ئیسراحەتی کرد و پێکەنیم کە گوتی))

– برسیت نییە؟!

ـ بۆ نا؟! زۆر!

ـ من لە چێشتخانەم, جلەکانت دەبەر بکە و وەرە!

(( خێرا هەستام و دیسان سەیری خۆمم کرد! نا هیچ ڕوویی نەدابوو! ساغ بووم! هەلەکەی نەقۆستبۆوە! هەر بۆیە زیاتر عاشقی بووم! جلەکانم دەبەر کرد و چوومە چێشتخانە و پێم گوت))

ـ کاتێك جلم دەبەر نەبوو, خۆ چاوت لێ نەکردووم؟!

– بۆ نا!

ـ کارێکی خراپت کردووە! خانەدانێك هیچ کات ئەو کارە ناکات!

- گێلێك چاو لە جوانێك ناكات! وەلیّ دەتوانیّ ئەو سەیركردنەی تەنها بۆ جارێك بێت! وەكو ئەوەی لەناكاو چاوت بكەوێتە سەر شتێك!

(( كەیفم بە وەسفەكەی هات و چوومە سەر مێزەكە دانیشتم كە پیتزاكانی هێنان و دووقۆڵی دەستمان كرد بە خواردن! ئەوەندە برسیی بووم, كە هەمووم خوارد! بەڕاستی چێژی هەبوو بۆم. نان خواردن لە تەنیشت پیاوێك كە بەڕاستی خۆشمدەویست! پێكەوە نانمان دەخوارد پێدەكەنین و ئەو بۆی باس دەكردم كە چ كارێكم لە خەودا دەكرد و چیم لە خەوەكەمدا دەگوت! خولاسە سەعات نزیكەی چوار بوو كە هەر لەوێڕا تەلەفونم بۆ شوكا كرد كە گوتی زووتر بگەڕێوە ماڵیّ و دواتر لەگەڵ سوهەیل سواری سەیارە بووین و تا نزیك ماڵێی بردمەوە و پڕیار بوو كە دواتر تەلەفونم بۆ بكات.

خواحافیزیم لیّ كرد و ڕۆیشت. منیش چوومەوە ماڵیّ و هێشتا نەگەیشتبوومەوە كە ئاڵقەكەم پێشانی شوكا دا! سەرەتا بە بیّ متمانەیی سەیری دەكرد و دواتر زۆر زۆر خۆشحاڵ بوو! هەموو شتەكەم بە تەواوی بۆ باس نەكرد! دەمزانی ئەگەر یەك وشەی بڵێم دەست دەكا بە قسەكردن بە سوهەیل و بە خراپە باسكردنی. منیش تەحەممولی ئەوەم نەبوو كە كەسێك بە خراپە باسی سوهەیل بكات! هەر بۆیە هەموو شتێكم باس نەكرد.

لە بیرمە سیّ ڕۆژ دواتر بەیانییەكە تەلەفونی كرد. جگە لەوەی كە هەموو ڕۆژ تەلەفونی دەكرد و قسەمان دەكرد, بەڵام ئەو ڕۆژە كە بەیانییەكە تەلەفونی كرد, دیتم بە جۆرێك قسە دەكات))

- ئەلوو! ئەفسانە!

ـ سلاّو! خۆمم! بە هەڵە لێت نەداوە.

- سلاّو, چۆنی!

ـ باشم, تۆ چۆنی؟

– من؟

ـ بەڵێ! مەگەر بێجگە لە خۆت کەسێکی دیکەی لێیە؟

– نا! کەسی لێ نییە!

ـ ئێستا باشی یان نا؟

(( ئەوەم گوت و پێکەنیم, بەڵام لەو بەر گوێبیستی هیچ نەبووم!))

ـ سوهەیل!

– ها؟

ـ ئاگات لە خۆیە؟!

– بەڵێ!

ـ هیچ بووە؟!

– دەتوانی بێی؟!

ـ چی بووە؟!

– دەتوانی؟!

ـ بەڵێ, بەڵام بڵێ بزانم چ بووە؟!

– هیچ نەبووە! پێویستم پێتە! ئێستا لەو کاتانەیە کە پێویستە لە کنم بی!

ـ زۆر باشە! زۆر باشە! تا سێ جارەگی دیکە لەوێم! تەنها بڵێ تۆ باشی؟!

– ئا! باشم!

ـ زوو دێم! خوا حافیز!

(( نازانم چۆن جلکم دەبەر کردن و ئاراپیشێکی پوختم کرد! شوکاش هەر دەیپرسی: چی بووە چی بووە؟! بۆخۆشم نەمدەزانی چ بووە تا بۆی باس بکەم, تەنها گوتم لەوانەیە سوهەیل تووشی کێشە بووبێ! ئەویش دەستی کرد بە

ئامۆژگاریی كردن و ئاگات لە خۆت بێ خۆت لە كێشە هەڵمەقورتێنە و ئەو شتانە, كە لەو كاتەدا ئەسڵەن تاقەتی ئەوم نەبوو! هەرچی چۆن بێ هەتا هاتمە دەرێ لە ماڵێ بەڵێنی لێ وەرگرتم كە گەیشتمە ئەوێ تەلەفونی بۆ بكەم و بۆی باس بكەم! منیش پێم گوت كە بابم هاتەوە یان تەلەفونی كرد, پێی بڵێ چوومەتە دەرس.

خێرا لە ماڵێ هاتمە دەرێ و تاكسییەكم گرت و نیو سەعات دواتر گەیشتمە پێش دەرگای ماڵیان! لە جەڕەسم دا و چوومە سەرێ. دیسان دەرگای بۆ واڵا كردبووم, كە چوومە ژوورێ! ))

- سوهەیل! چی بووە؟!

(( هەر وا وڕ و مات لە پێش دەرگا ڕاوەستا بوو و سەیری دەكردم! تەواوی ڕووخساری برین بوو! وای بۆ چووم كە شەڕی كردبێ و كار كەوتبێتە كوتەك كاری!))

- چی بووە سوهەیل؟! شەڕت كردووە؟!

(( ئارام چوو دەرگاكەی پێوەدا و چوو لەسەر قەنەفێك دانیشت. چوومە تەنیشتی كە بینیم هەردوو دەستی بریندار بوونە و خوێنیان لێ دێ!))

- ئاخر چی بووە؟! لەگەڵ كێ شەڕت كردووە! دە قسە بكە دەی!

(( سەری دە قالان نا و گوتی))

– شەڕم لەگەڵ كەس نەكردووە!

- ئەی چی بووە؟! بۆچی ڕووخسارت شین هەڵگەراوە؟! دەستت چییان بووە؟!

– هیچ!

- شێتت كردم سوهەیل! دە بڵێ دەی! شەرم مەكە! ئەگەر لەگەڵ كەسێك شەڕت بووە...!

– نا! خۆم وام لێ كردووە!

(( لەناکاو واقم وڕ ما و دواتر گوتم))

- بۆخۆت؟!

- بەڵێ.

- یانی بۆخۆت ڕووخسارت ئاوا شین و مۆر کردۆتەوە؟!

- بەڵێ.

- چۆن چۆنی؟!

- لە خۆمدا! بە مست لە ڕووخساری خۆم ڕاکێشا!

(( تەنها سەیرم کرد کە گوتی))

- دەستیشم هەر وا! ئەوەندە بە مست لە دیوارم ڕاکێشان کە ئاوایان لێ هات!

- ئاخر بۆچی؟! مەگەر تۆ شێتی؟

- نا!

- دەی کەوایە بڵێ بزانم بۆ وات لە خۆ کردووە؟!

- دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم! یانی دەبێ بیڵێم! دواتریش تۆ ئازادی کە هەر بڕیارێك بدەی! دەتوانی هەستی و بڕۆی! ئەسڵەن ڕێت لێ ناگرم!

- بۆچی دەبێ بڕۆم؟! بڵێ بزانم چ باسە؟!

- من نەخۆشم ئەفسانە! نەخۆشێکی شێت! یانی شێت بووم! شێتیان کردم!

- کێ؟!

- من درۆم لەگەڵ کردی! یانی هەندێ لە قسەکانم درۆ بوون!

- چ قسەیەکت درۆ بووە؟!

- ئەوەندە پرسیار مەکە دەی! بێڵە بۆخۆم بیڵێم!

(( بێدەنگ مامەوە کە جگەرەیەکی پێ کرد و گوتی))

- بابم لەو چەند ساڵەدا زۆر خۆشیویستووم! یانی بە ڕێگەی خۆیدا! بێجگە لە بابەتی شریتەکە کە گاڵتەم پێ دەکات, دەربارەی پارە و ئەو شتانە زۆر یارمەتیم دەدات. کرێ بارەگای ئەو باڵەخانەیە, پارەی گیرفانی کە لەوانەیە دوو هێندەی پارەی ئەندازیارێك بێ! جار جارەش هەندێ پارەی دیکەم وێ دەدا بۆ دایکم. چونکە دەزانێ کە زۆر خۆشمدەوێ!

(( بێدەنگ بوو و مژێکی دیکەی لە سیگارەکەی دا. وای بۆ چووم کە باسەکە هەرچییەك بێ, پەیوەندیی بە دایکییەوە هەبێ! حەتمەن شتێکی دیوە یان تێگەیشتووە! وەلێ چاوەڕێم کرد تا بۆخۆی وە قسە بێ! دوو سێ دەقیقە هیچی نەگوت و سیگاری کێشا و دواتر دووبارە دەستی پێکردەوە))

- ڕاستە کە بابم لە دایکم جیا بۆوە و زۆری ئازاری من دا, بەڵام بۆ من بابێکی باش بووە و هەر کارێکی لە دەست هاتبێ بۆی کردووم! بۆ وێنە ساڵی یەك دوو جار من دەنێرێتە ئەورووپا! دەزانی ئەوە یانی چی؟! هەر جارێك کە دەچم چەند ملوێنێك خەرج دەکەم!

(( دیسان بێدەنگ بوو. خەریك بوو شێت دەبوم, بەڵام هەر چۆنێك بێ پێشم بە خۆم گرت کە دیسان دەستی کردەوە بە قسەکردن))

- زۆریش منی خۆشدەوێ! عاشقی منە! شانازیم پێوە دەکات! هەموو کاتێکیش لە کن هەمووان پێم دەڵێ کە شانازیت پێوە دەکەم!

(( جگەرەیەکی دیکەی پێ کرد! منیش دانەیەکم هەڵگرت و پێم کرد. بۆ ئەوەی بەم شێوەیە بتوانم پێش بە خۆم بگرم و پرسیاری لێ نەکەم و بهێڵم بۆخۆی بابەتەکە باس بکات!))

- منیش خۆشمدەوێت! بە کەمێ دڵئێشەوە خۆشمدەوێت! هەر بۆیە خەریکە شێت دەبم! یانی شێت بووم! بە ڕادەی گیانکێشان! دوێشەو دەمویست خۆم لەناو

بەرم! وەلێ هەر چۆنێك بووە ئارامم گرت! بەیانیی هاتمە ئێرە, دیسان ویستم هەمان کار بکەم! ئەو مووسەشم هێنا!

(( لەناکاو چاوم کەوتە سەر مێز و مووسێکی لەسەر بوو! هەناسەم تەنگ بوو! نەمتوانی پێش بە خۆم بگرم))

- بۆچی سوهەیل؟! مەگەر چی بووە؟! نەکا دیسان شتێکت لە بارەی دایکتەوە بیستبێت؟!

– نا! نا!

- دە تخوا زووتر بڵێ خەریکە جەڵتە لێم دەدا!

(( سەیرێکی کردم و گوتی))

– زوهرە لێم ناگەڕێ!

(( خەریك بوو ئاگر بگرم, وەك ئەوەی ئاوێکی گەرم بە سەرمدا بکەن! تەواوی خانەکانی لەشم ترپە ترپیان دەکرد! بە شێوەیەك کە هەستی ئیرەیی و ڕق و کینەم بەرانبەر بە زوهرە بۆ دروست ببوو کە ئەگەر لەو کاتەدا زوهرە لەوێ با حەتمەن دەمکوشت! حەزم دەکرد بە دەستەکانم پارچە پارچەی بکەم!))

- یانی دیسان هاتەوە سەرت؟!

– دیسان نا!

- یانی چی؟!

– ئەوەم بە درۆ پێ گوتی! ئەو ئەسڵەن پشتگوێی نەخستووم! کەمتر بۆتەوە, بەڵام بەڕەڵاشم ناکا! ئیدی بڕستم لێ بڕاوە! هەر بۆیە دەمویست خۆم بکوژم, بەڵام کاتێك بیرم لە تۆ دەکردەوە, هێورتر دەبوومەوە! بەیانیش کە هاتمە ئێرە, هەر بیری تۆ بوو کە ڕێی لێ گرتم بۆ ئەوەی ئارامتر ببمەوە دەستم کرد بە

ئازاردانی خۆم! ئەوەندە بە مست لە ڕووخساری خۆم دا کە خەریك بوو لە ئێش و ئازار گیان بدەم! دواتریش ئەو بەڵایەم بەسەر دەستیشم هێنا!

- بۆچی درۆت دەگەڵ کردم؟

- ترسام لەوەی کە بڕۆی!

(( بۆ ساتێك بیرم کردەوە و گوتم))

- بۆخۆشت وات دەوێ؟!

- نا! نە بە خوای! نە بە گیانی تۆ! ڕقم لێی دەبێتەوە بەڵام نازانم چ بکەم!

- بۆچی؟!

- دەترسێم! ئیهانەم دەکات! ئەگەر بابم تێ بگات دەزانی چی ڕوو دەدات؟!

- دەتکوژێ؟! ئێ بۆخۆشت هەر دەتویست وا بکەی!

- خۆی دەکوژێ! زوهرەش دەکوژێ! ئەمن لە مردنێ ناترسێم! بەڵام نامەوێ هیچ بەڵایەك بەسەر بابم بێ! هیچ شتێك کاری لێ ناکا! وەك شێتان وایە! لە هیچ ناترسێ! تەنها منی دەوێ!

- ئێستا دەتەوێ چ بکەی؟

- نازانم! نازانم!

(( لەناکاو دەستی بە گریان کرد! وەك ژنان دەگریا! حەزم دەکرد دەستم بەو ژنە چەپەڵە بگات تا تێیبگەیەنم کە سوهەیل خاوەنی هەیە و ئەو نابێ حەقی هەبێ! جوان دە فکران ڕۆچووبووم بۆ ڕێگە چارەیەك! هەستێکی توندی خاوەنداریێتیی لە بوونمدا دروست بوو! وەك ئەوەی کە کەسێك بیەوێ هەموو ئەو شتانەی کە هەمە لێم بستێنێ و منیش ئامادەی هەر جۆرە بەرگرییەك بووم! جیاوازیی بۆم نەبوو کە ئاخیرەکەی چی بەسەر دێ, تەنها ئەوە لە لام گرنگ بوو کە بەرگریی لە مافی خۆم بکەم! لە سوهەیل! لە شووەکەم!

بە هێواشی دەستم بە سەری دا هێنا! ڕووم لە لا کرد و ڕووخساریم بە دەستی گرت! دلّم ئاوری گرت! حەزم دەکرد زار بکەمەوە و هەرچی لە زارم ڕا دێ بەو ژنە قەحبەیە و بێ حەیایەی بلّێم! بەلّام سوودی چ بوو؟! دەبوو ژیرانە بیر بکەمەوە! هەستام و چوومە چێشتخانە و کترییەکەم لەسەرئاوری دانا و هاتمە دەرێ و تەلەفونێکم بۆ شوکا کرد تا خەیالّی ئاسودە بێت و دواتریش چوومە کن سوهەیل, دانیشتم و گوتم))

ـ ئێ دە بەسسە دەی! خۆ پیاو ناگریەن! عەیبە بەسە!

(( دەستیم گرت و هەلّمستاند و بردمە سەرئاو و دەم و چاویم شرد و بە کلێنس وشکم کردەوە و گەڕامەوە چێشتخانە و —چا—م دێم کرد و هەر لەوێڕا بە دەنگێکی بەرز گوتم))

ـ ئێستا چایەکت بۆ دێنم کە بە تەواوی بێیەوە سەرە خۆت.

(( جوابی نەدایەوە. منیش هەر لەوێ مامەوە بیرم دەکردەوە. دە دەقەیەك بیرم کردەوە و دواتر دوو —چا—م تێ کردن و چوومە هۆلّەکە و لەسەر مێزەکەم دانان و خۆشم دانیشتم کە گوتی))

— تۆ هیچ هەستێکت نییە!

ـ چ هەستێك؟

— بۆ وێنە ئیرەیی! ژنان لەو کاتەدا زۆر حەسوود دەبن کە نیشانەی عەشقیانە!

ـ چاو لێکە سوهەیل! من ئێستا هەستێکی کینەی زۆرم بەرانبەر بە زوهرە هەیە, بەلّام نایەلّم ئەو ڕق و کینە ڕێی ئەقلّم ببەستێ و هزرم کەم کاتەوە! لە کاتێکی ئاوا دا دەبێ بیر بکەیەوە! ژیرانە!

— یانی ڕێگەچارەیەك هەیە؟

ـ بەلّێ, بۆ نییە؟!

- بۆ وێنە چی؟
- زۆر ئاسانە!
- بڵێ!
- ماوەیەك برۆ لەگەڵ دایكت بژی! ئاوا بە تیرێك چەند نیشانەیەكت پێكاوە! یەكەم گرنگترین شت ئەوەیە كە ڕزگارت دەبێ لە دەست ئەو چەپەڵە! دووەمیش ئەوەیە كە ئەو گومانە خراپەی بەرانبەر داكت هەتە دەگۆڕێ! سێیەمیش ئەوەیە كە دایكت خۆشحاڵ كردووە! چۆنە؟

((بە شێوەیەك واقی وڕ ما كە زوو گوتم))

- بە بابیشت بڵێ كە دایكت بەتەنێیە و كەمێكیش نەخۆشە, ماوەیەك دەچیە كنی كە كەمتر خەفەت بخوات و دواتریش دەگەڕێیەوە! دەبێ جارجارەش سەردانی بابت بكەی! زیاتر شوێنی كارەكەی. دوو هەفتە جارێكیش دەچییەوە ماڵێتان. تەنها ئەو كاتە دەچییەوە كە بابت لە ماڵ بێ!

(( لەناكاو دەرپەڕی و خۆی هاویشتە سەر دەستم و لە كاتێكدا كە دەستمی ماچ دەكرد گوتی))

- خۆشمدەوێی, خۆشمدەوێی, خۆشمدەوێی! هەر لەو كاتەوە دەمزانی كە تۆ دەتوانی یارمەتیم بدەی! هەر بۆیە كاتێك بیرم لێت دەكردەوە, ئارام دەبوومەوە! من چەندە گەمژەم ئەفسانە!؟ چۆنە ئەو ڕێگە ئاسانەم بە خەیاڵدا نەهاتووە؟!

(( بە ڕاددەیەك هەستم بە خۆشیی و شادیی دەكر كە ئامادە نەبووم بە تەواوی دونیای وەگۆڕم! هەستێكی باشتر! هەستی سوودمەندبوون! خەریك بوو شیرینی ئەو كاتەم بەش بەش دەكرد, بەڵام وە بیرم هاتەوە كە نابێ بە شێوەیەك بێ كە سوهەیل لە بەرانبەرمدا هەست بە بچووكی بكات هەر بۆیە گوتم))

ـ لەبەر ئەوەی دژی هزرت بووە! ئەوەندە لە ژێر فشار دا بووی کە هێزی بیرکردنەوەت لە دەست داوە!

– سوپاس ئەفسانە! سوپاس! هەر ئەمشەو قسە دەگەڵ بابم دەکەم! لەوانەیە سبەی بچمەماڵێ دایکم! وای خوایە گیان چەندە خۆشحاڵم! چەندە گێلم من! چەندە ئازاری خۆم داوە! ئەگەر دەزانی دەم و چاوم چەندە بە ئازارە! ناتوانم پەنجەکانم بجووڵێنم! چەندەم مست لە ڕووخساری خۆم داون!

ـ ئیدی تەواو بوو! لە ئێستا بەولاوە هەر کات کێشەیەکت بۆ هاتە پێشێ، پێش ئەوەی کارێك بکەی، تەلەفونێکم بۆ بکە با سەرەتا کەمێك قسەی لە بارەوە بکەین و دواتر بڕیاری لەسەر بدە!

– لەمەبەدوا ئاویش ناخۆمەوە هەتا بە تۆ نەڵێم! دڵنیابە!

(( دواتر دیسان دەستی گرتم و دەستمی خستە ناو دەستی و گوتی))

– زۆر دەمێك بوو کە بە دوای یەکێکی وەك تۆدا دەگەڕام!

(( هەر وا سەیری کردم و دواتر گوتی))

– چایەکان سارد بوونەوە!

ـ ئێستا دەیانگۆڕم!

– نا! تۆ بڕۆ دانیشە، من دەیانگۆڕم!

ـ ئەتۆ خۆ گوتت ئیشی ماڵ ناکەم!

– ئەم جارە هەدیەیە! هەدیەی ئەو ڕێگەچارەیەی کە بۆت دیومەوە!

(( پێی پێکەنیم و چووم دانیشتم. ئەویش سینیی چای هەڵگرت و بردی. وردە وردە خەریك بوو بە ڕەوشتی تایبەتیی ئاشنا دەبووم! ڕاستی دەکرد! حاڵەتێکی نەخۆشی لە دەروونیدا بوونی هەبوو! چەند ساڵێك بوو کە لە ژێر فشاری تووڕەیدا بووە و هەر ئەوەش وای کردووە کە هەندێ جار ڕەفتاری سەیری لێ ڕوو بدات!

ئەگەر زوهرە وازی لیّ هیّنابا, من دەبوومە فریشتەی نەجات بۆی و هەر لە ئێستاوە دەمتوانی خۆم لە جلی بووكێنیدا ببینمەوە! لا ئیرادی بەم فكرەی خۆم پێكەنیم! لەوانەشە زوهرە وەسیلەی سەركەوتنی من بوو‌بێت!

كەمێك دواتر دوو فنجان چا هاتن و یەكیانی دا بە من و بۆخۆشی دانیشت. ئیدی غەم و خەفەت لە ڕووخساریدا بەدی نەدەكرا! بە خەندە و پێكەنینەوە چایەكانمان خواردنەوە و هەستا و چوو هەمان پاكەتە جگەرەی هێنا و دوو دانەی لیّ دەرهێنا كە گوتم))

ـ من ناكێشم سوهەیل!

– بۆچی؟!!!

ـ هەمان ئەو یەكەم جارە بەسە بۆم!

– یەكەم, بۆ چما شتێك ڕووی داوە كە وا ترساوی؟!

ـ نا! بەڵام!

– دووەم, ئەوە جاری یەكەم بوو كە ئەوەندە كاریگەریی لەسەرت هەبوو! جاری دووەم ئیدی ئەو كاریگەرییەی نییە!

ـ ئاخر...!

– دە بگرە دەی! ئێستا لە حاڵەتێكدام كە حەز دەكەم هەردووكمان بكێشین! بەڵام تۆ تەنها نیوەی بكێشە!

(( نەمدەزانی بڵێم چی! ئەگەر نەمكێشابا تووڕە دەبوو و مادام بەم شێوەیەش هاتبۆ كنم, نەمدەویست لە خۆمی بڕەنجێنم. هەر بۆیە جگەرەیەكەم لیّ وەرگرت و پێم كرد. مژێكی هێواشم لیّ دا كە گوتی))

– نەمگوت ئەوجار ئاوا بیكێشە! ئاوا هیچ هەستێكت نابیّ! دووكەڵەكەی هەڵمژە!

(( مژێکی دیکەم لیَ دا و دووکەڵەکەم هەڵمژی, بەڵام زوو دەرمدایەوە و بۆ ساتێك چاوەڕیَ بووم کە بزانم تووشی سەرگێژە دەبم, بەڵام نا ! ))

– سەرت لە گێژەوە هات؟

ـ نا !

– دیتت ڕاستم پیَ گوتی ! تەنها جاری یەکەم وایە !

ـ ئەی ئێستا بە کەڵکی چی دیَ؟

– نا, کاریگەریی هەیە بەڵام کاریگەرییەکی باش ! مرۆڤ گەرم دەکا, تێکەڵ و پێکەڵی دەکا ! زۆر نەرم مرۆڤی دەگریَ !

ـ وەك مەشرووب؟

– بەڵیَ, بەڵام ئیدی مرۆڤ بۆنی لە زاری نایە !

(( بە ئاسایی مژێکی دیکەم لیَ دا. ئەویش خێرا و خێرا دەیکێشا. ))

– هەر کات نەتویست بیکێشی مەیکوژێنەوە. وە منی دە !

ـ نا ! جاریَ هیچم لیَ نەهاتووە !

– ئیَ هەر یەکەو هێزێکی هەیە ! هەمان ئەوەندە هێزە بەسسە !

(( مژێکی دیکەم لیَ دا. ))

– ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ چی بخۆین؟

ـ هەر شتێك کە هەبیَ !

– ناچارم تەلەفون بکەم دیسان پیتزا بێنن ! ڕاستی ئێرە کەبابیشیان هەیە, دەخۆی؟

ـ بۆ من فەرق ناکا !

– جگەرەکە ئاوا بگرە بۆ سەریَ و دواتر بیکێشە !

(( وەك چۆن پێی گوتبووم كێشام. ئیدی سەرم لە گێژەوە نەدەهات, بەڵام پێكەنینم هات!))

– بهێڵە شریتێك باوێمە سەر بۆ ئەو جەوە نایابە!

(( هەستا و چوو شریتێكی خستە ناو تەسجیلەكە. گۆرانییەكی خاریجیی سەریع! لا ئیرادی مرۆڤی وە جوڵە دێنا! كەمێك گوێم لێ گرت و كۆتایی جگەرەكەم كێشا و كوژاندمەوە كە گوتی))

– هەمووت كێشا؟!

(( لەناكاو لە جێی خۆم هەستام. دەتگوت تەواوی جەستەم وزەی وەرگرتووە! دەبوو بە جۆرێك بەتاڵی بكەمەوە هەر بۆیە دەستم كرد بە هەناسەدانی قوڵ! هەستم دەكرد هەوا كەم كەم بۆتەوە! هەستكردن بە سوكی! هەستكردن بە فڕین!

شڵەژان! گێژی! بەرز و نزم بوونەوە!

دووقۆڵی وا سەمامان دەكرد, كە دەتگوت ئەوە كۆتا سەمامانە! وەك شێتان بەرز و نزم دەبووینەوە! زۆر سەیر بوو كە مرۆڤ بتوانێ سەمای خۆی بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ ببینێ! دووقۆڵی لەسەر قەنەفە ڕاكشابووین و سەماكردنی خۆمانمان دەبینی! یانی سەیرمان نەدەكرد. جاری وا هەبوو نیگامان دەكەوتە سەر! ئەفسانە و سوهەیل لەو نێوەدا سەمایان دەكرد و ئێمەش لەسەر قەنەفە نووستبوین! ئەفسانە و سوهەیل دەستی یەكتریان گرتبوو و بەرز و نزم دەبوونەوە و ئێمەش جار جار سەیرمان دەكردن! ئەفسانە و سوهەیل توند پێیان بە زەویدا دەكوتا و ئێمەش لەسەر قەنەفە خەوتبووین و پێیان پێ دەكەنین! هەر سەیرمان دەكردن و هەر پێدەكەنین! پێكەنین, پێكەنین, پێكەنین! پێكەنین لە دڵەوە! بەڵام نا! تەنها پێكەنین نەبوو! سوهەیل خەریكی كارێك بوو! منیش

پێدەکەنیم و سەیرم دەکرد و هیچم نەدەگوت! دەنگی ئاوازەکە هێواش بۆوە! خێراییەکەی کەم بۆوە! ئیدی ئەو ئاوازە خێرایە لێنەدەدرا! ئاوازێکی نەرم و خۆش بوو! خەریك بوو سەیری ئەفسانە و سوهەیلم دەکرد و پێدەکەینم! ئیدی وەك سەرەتا سەمایان نەدەکرد! ماندوو ببوون! لەو کاتەدا بە نەرمی دەستی یەکدیان گرت و هاتن بۆ لای ئێمە! دەتگوت ئەوانیش دەیانەوێ لەسەر قەنەفە ڕاکشێن! بەڵام ئێمە لەسەر قەنەفە ڕاکشابووین! ئەگەر ئێمە لێرەین, ئەی ئەوانە کێن کە خەریکە دێن؟! خۆ جێ نییە لێرە! ئەوانیش خەریکن لەسەر قەنەفە دەخەون! وای خوایە گیان! خۆ ئەوانە خودی ئێمەن! من و سوهەیل! سوهەیل خەریکە چی دەکات؟! من خەریکم چی دەکەم؟! وای خوایە گیان! چی بوو؟! چیمان کرد؟! ئێمە خۆ تەنها لەسەر قەنەف درێژ ببوین و ئەفسانە و سوهەیل لەو نێوەدا سەمایان دەکرد! ئەی کەی ئەوە ڕووی دا؟! بۆچی سوهەیل چۆتە سەر ئەو قەنەفەی دیکە دانیشتووە و جگەرە دەکێشێ؟! ئەو دوو کەسە ئیدی بۆ کوێ چوون؟! خۆ ئێمە چوار بووین, ئەی بۆ ئێستا تەنها من و سوهەیلین؟! وای خوایە گیام چیم کرد؟! چ بەڵایەکم بەسەر خۆم هێنا؟! تەواوی قەنەفەکە پیس ببوو! یانی وا بە ئاسانیی هەموو شت تەواو بوو؟! بۆچی؟! خۆ ئێمە تەنها خەریکی سەماکردن بووین! ئەی چۆن ئەوە ڕوویدا؟! ئێستا چی بکەم؟!

(( لەناکاو دەستم بە هاوارکردن کرد و بانگی سوهەیلم کرد!))

ـ سوهەیل! سوهەیل! سوهەیل!

(( دەتگوت گوێی لە دەنگم نییە, یان من ئەوکم گیراوە! بە بێدەنگی دانیشتبوو و سەری دەبەرە خۆی نابوو جگەرەشی لە نێوان پەنجەکاندا بوو! ئەسڵەن نەمدەزانی کە بانگی دەکەم یاخوود نا! لەوانەشە هیچ ڕووی نەدابێ! وەك ئەو هەفتەیە! بەڵام نا! ئەی بۆ پیسم؟!

له جێی خۆم هەستام! دەتگوت ڕووداوی ئەو جاره بۆم دووباره دەبۆوه!بەڕووتی هەستام , وەلێ نا! ئەوه دووباره نییه! هەموو شتێکم بۆ تەواو بووه! ئۆف! چۆن چاو له چاوی بابم بکەم؟! چی پێ بڵێم؟! بڵێم له جێگەی دەرس خوێندن چم کردووه؟! چۆن پێی بڵێم که تەواوی ئاواتەکانیم به —با— داوه؟! ئاواتەکانی خۆم چی؟! چەند به ئاسانی هەموویانم به —با— دان! ))

ـ سوهەیل! سوهەیل!

(( دیسان لەوێ دانیشتبوو و جگەرەی دەکێشا! ئەسڵەن سەیری منی نەدەکرد! ئەویش تێگەیشتبوو چ هەڵەیەکی کردووه!

ئارام لەسەر قەنەفه دانیشتم و دەستم به گریان کرد! بەڵام ئیدی ئەو گریانه وەك ئەو پێکەنینه ڕووکەشانه نەبوو! گریانێکی ڕاستەقینه! دەمزانی چی بووه! ئیدی هاتبوومەوه سەرەخۆم و دەمزانی چ بەڵایەکم بەسەر هاتووه! هەر وا دانیشتم و دەستم به گریان کرد که هەستم کرد هاتۆته تەنیشتم دانیشتووه!))

– ئێ ده تازه مەگری جا!

ـ بۆچی سوهەیل؟ بۆچی؟! من متمانەم به تۆ کرد! بۆچی ئەو بەڵایەت بەسەر هێنام؟!

– تۆ بۆچی هێشتت؟!

ـ من نەمدەزانی! ئەو گووەت دا به من بیکێشم که نەزانم خەریکه چی دەکەم! تۆ دەتزانی که وای لێ دێ! تۆ دەتویست که وای لێ بێ! زۆر سوکی سوهەیل! من خۆشمویستی, بەڵام تۆ به پێچەوانەوه لەناوت بردم!

– مەگری! ئەو قسانه یانی چی؟! خۆ هیچ نەبووه!

ـ ئیدی لەوه زیاتر دەتویست چی ڕوو بدات؟! لەمه خراپتر؟!

– تۆ هێمن به تا پێت بڵێم!

ـ تازە چم پێ بڵێی؟! ئیدی چیکەت دەوێ بۆتی بکەم؟! هەموو شتێکت لێ ستاندنم! من ئەوەم نەدەویست! تۆ ناپیاوی سوهەیل! ناپیاوی!

– منیش نەمدەویست وا بێ! بەڵام بە خوای لە دەستی خۆمدا نەبوو! ئەسڵەن نەمزانی چۆن ڕوویدا!

ـ پێم گوتی ئەو شتە پیسە ناکێشم هەر ئینکاریت کرد!

– من خۆشمدەوێی ئەفسانە! نایەڵم بەتەنێ بی!

ـ دەزانی چ بەڵایەکت بەسەر هێناوم؟! من کە ئەوەندەم خۆشدەویستی..!

– دیسان خۆشتبوێم! متمانەم پێ بکە!

ـ کە چ بێ!؟

– دێمە خوازبێنیت! هەرچۆنێك بێ بابم ڕازی دەکەم بێتە خوازبێنیت! ئەوکات هەموو شتێك چارەسەر دەبێ!

(( ئیدی بێدەنگ بووم و تەنها گریام! نەفرەتم لە خۆم کرد! لە خۆم! لە سوهەیل! لە شوکا کە هۆکاری هەموو ئەوانە ئەو بوو! ئەگەر ئەو نەبا ئێستا من لێرە نەدەبووم و ئەو شتە ڕووی نەدەدا! ئەسڵەن من چی دەکەم لێرە؟! من دەبێ ئێستا لە خوێندنگە بم و دەرس بخوێنم! نەك ئەوەی کە...! خۆزگە دایکم زیندوو با و شەڕی دەگەڵ دەکردم و تا ویستبام کارێکی خراپ بکەم, تەمبێی کردبام, هەتا ئێستا ئەوەم بەسەر نەیەت! هەر بەڕاست ئەوە منم لێرە دانیشتووم؟! خۆ من وەختایەك هەموو کوڕێکم فریو دەدا! ئۆف کە چەندە گێل بووم! هەر ئێستاش چەندە گەمژەم؟!))

– بەسە ئیدی ئەفسانە! ڕووداوێکە و ڕووی داوە! ئێستا دەبێ بەدوای ڕێگەچارەیەکدا بگەڕێین! خۆ بە گریان هیچ چا نابێ! هەستە جلەکانت دەبەرکەوە و ئاوێك بە دەم و چاوت دا کە! مەگەر بۆخۆت پێت نەگوتم کە لەو

کاتانەدا دەبێ بیر بکەیەوە ئینجا بڕیار بدەی؟! دڵنیا بە هەموو شتێك باش دەبێ! بەڵێنت پێ دەدەم! من خۆشمدەوێی ئەفسانە! خیانەتت لێ ناکەم! دڵنیا بە!

***

(( ئەو ڕۆژە کاتێك گەڕامەوە ماڵێ, هەرچەند ویستم بە حاڵەتێکی ئاسایی بگەڕێمەوە ماڵێ و هەڵسوکەوت بکەم, نەکرا و شوکا زانیی کە ناڕەحەتم. پێم گوت: لەگەڵ سوهەیل شەڕمان بووە و ئەویش هەندێ ئامۆژگاریی کردم و مەسەلەکە تەواو بوو. ئەو شەوە تا بەیانی گریام. ئیدی هیچ شتێك لە دەستی مندا نەمابوو و پەیوەندیی بە سوهەیلەوە هەبوو. تا بەیانیی هەزار فکر هاتۆتە ناو مێشکمەوە! نەکا ناپیاویی بنوێنێ؟! نەکا هەموو شت تێکدا؟! ئەگەر نەیەتە

خوازبێنیم چی؟! ئەگەر بابی ڕازی نەبێ چی؟! ئۆف! چی جوابی بابم بدەمەوە؟! حەیای خێزانەکەمان دەچێ! چەند کەسێکی پیسم من؟!

بەیانی لە خەو هەستام و بە هەوای دەرس لە ماڵێ وەدەرکەوتم و لە ڕێگە تەلەفونم بۆ سوهەیل کرد! لە ماڵێ نەبوو! ڕۆیشتم سەعاتێك لە جاددەکان پیاسەم کرد و دووبارە تەلەفونم بۆ کردەوە, بەڵام دیسان جوابی نەبوو! ترس و دڵەڕاوکێ تەواوی گیانمی داپۆشیبوو! برسیم بوو! هەستم بە پووکانەوە دەکرد! هەستم بە سووکی دەکرد!

چوومە خواردنگەیەك و ساندویجێکم کڕێ و خواردم! یانی بە زۆر قوتم دا! دواتریش هاتمە دەرێ و دووبارە تەلەفونم بۆ سوهەیل کرد کە ئەوجارەیان هەڵیگرت!))

ـ ئەلوو سوهەیل! لە کوێی؟!

– سەلام! تۆ لە کوێی؟!

ـ لەسەر جاددەکان! چەند جارم تەلەفون بۆ کردی!

– منیش نیو سەعات لەمەوبەر تەلەفونم بۆ کردی!

ـ بۆ ماڵێت کرد؟!

– بەڵێ! شوکا بوو!

ـ خۆ هیچت نەگوت؟!

– نا! تۆ ئێستا لە کوێی؟!

ـ نزیك ماڵی تۆ!

– وەرە ئێرە!

ـ چت کردووە؟!

– وەرە تا پێت بڵێم!

(( تەلەفوونەکەم داخستەوە و تاکسییەکم گرت و چوومە پێش دەرگایان و چوومە سەرێ! خێرا هاتە پێشم و باوەشی لێ دام!))

- چی بوو سوهەیل؟! قسەت لەگەڵ بابت کرد؟!

- لەگەڵ بابم نا! قسەم دەگەڵ دایکم کرد!

- خۆ پێت نەگوت کە چی بووە؟!

- نا تەنها گوتم کچێکم خۆشدەوێ!

- ئێ چی بوو؟!

- زۆری پێ خۆش بوو! بڕیار وایە بۆخۆی قسە لەگەڵ بابم بکات!

- کەی؟!

- هەر ئەمڕۆ!

- وای سوهەیل خەریکە شێت دەبم! تۆ نازانی ئێستا من چ حاڵێکم هەیە!

- ئەوەندە خۆت ناڕەحەت مەکە! هەموو شت چاك دەبێ! بەڵێنت پێ دەدەم! مەگەر متمانەت بە من نییە؟!

- بۆ نا, بەڵام بە دەست خۆم نییە! چونکە تۆ پیاوی, ناتوانی درك بە حاڵی کچێك بکەی لەو کاتەدا! من ئابڕووم لە خەتەر دایە! ئابڕووی بابم! ئاپرووی تەواوی خێزانەکەم!

- خۆ من ئەوە خەریکم هەموو شت چاك دەکەم!

- دەزانم, بەڵام تا ئەو مەسەلەیە تەواو دەبێ من وێرانم!

- نا ڕێ بە خۆت بگرە! وا بیر بکەوە هیچ نەبووە!

- جا چ نەبووە؟!

- ئێستا وەرە دانیشە!

(( چووم و دانیشتم!))

- کاتێك بە دایکم گوت عاشقی تۆ بووم, زۆری پێ خۆش بوو! زۆر دەمێك بوو کە زۆری لێ دەکردم تا ژن بێنم! کاتێك بیستی لە خۆشیان حەپەسا! ئەمڕۆ تەلەفون بۆ بابم دەکات و شتەکەی بۆ باس دەکات! دەزانم کە بابیشم پێی خۆش دەبێ!

ـ ئەی ئەگەر بابت ڕازیی نەبوو؟!

- خەیاڵت ئاسوودە بێت! ڕازی دەبێ!

ـ ئەگەر نەبوو؟!

- بیرم لەویش کردۆتەوە! بابم هەمیشە بە وتەی خۆی دەیویست من دەست لەو منداڵبازاڕییە هەڵگرم و بچم لە دووکانی وی ئیشێ بکەم! ئەگەر ویستی ناڕازی بێ, کە ناش بێ, پێی دەڵێم: ئەگەر

بچی بۆ خوازبێنی, منیش دێمە دووکان و سەرقاڵی کار دەبم! ئەوەی پێ دەڵێم, ئیدی ڕازی دەبێ! دڵنیابە!

(( لەناکاو دەستم بە گریان کرد! خێرا هاتە تەنیشتم و گوتی))

- ئیدی بۆچی دەگری؟!

ـ ئاوام نەدەویست!

- چ جیاوازییەکی هەیە؟! خۆ بۆمن تۆ نەگۆڕاوی! هەمان ئەو ئەفسانەی کە خۆشمدەوێی!

ـ توخدا بەڕاستتە؟!

- بۆچی درۆ بکەم؟! دڵنیابە لەم چەند ڕۆژەدا دێینە خوازبێنیت! ئیدی ئەوکات هەموو شتێك تەواو دەبێت! زووش مارەیی دەبڕینەوە! چیکەت دەوێ!؟

ـ من تەنها ئەوەم لە تۆ دەوێ کە پیاو بی سوهەیل!وەك چۆن من تۆم بە تەنها جێ نەهێشت لە کاتی پێویستدا و هەرچی گوتت, گوێم بۆت گرت و بە ئاسانی خۆم تەسلیمت کرد. تۆش پیاو بی و نەهێڵی ئابڕووم بچێ!

- دڵنیابە! بەڵێنت پێ دەدەم! بەڵێنی پیاوانە!

ـ مەکە سوهەیل! تاقەتم نییە!

- ئیدی بۆچی؟!

ـ دیسان نا! دەست پێ مەکەوە!

- ئیدی چ جیاوازییەکی هەیە؟! وا بزانە ژن و مێردین!

ـ تا هاوسەرێتی زۆری ماوە!

- چەند ڕۆژ زیاتری نەماوە!

ـ دە تخوا واز بێنە سوهەیل!

- ئاوا خۆشتدەوێم؟!

ـ نا! بەڵام!

- ئاخ... سوهەیل!

.....

((بێدەنگی))

ـ ئێ دواتر چی بوو؟!

- بەیانییەکەی تەلەفونی بۆ کردم و گوتی کە بابی چۆتە سەفەر و دایکیشی نەیتوانیوە قسەی دەگەڵ بکات. گوتی: سێ ڕۆژی دیکە دەگەڕێتەوە و دایکی تەلەفونی بۆ دەکات و ئیشەکە جێبەجێ دەکات!

ـ ئەو سێ ڕۆژە وەك سێ ساڵ بۆم تێپەڕی! هەموو ڕۆژێ تەلەفونم بۆ دەکرد تا بزانم بابی هاتۆتەوە یان نا! هەموو جارێکیش دڵی دەدامەوە و دەیگوت: خەیاڵت ئاسوودە بێت!

هەرچی چۆن بێ سێ ڕۆژەکە تێپەڕی! ئێوارە هەرچەند تەلەفونم بۆ کرد جوابی نەدایەوە! ئیدیی خەریك بوو شێت دەبووم! هەتا شەوێ چەند جاری دیکە تەلەفونم بۆ کرد, بەڵام لە ماڵێ نەبوو!

بەیانییەکە سەعات یازدە بوو کە چوومە پێش دەرگای ماڵێیان و لە جەڕەسم دا, وەلێ دیسان کەس لە ماڵ نەبوو! هەر لەوێ دانیشتم! سەعاتێك, دوو سەهات, سێ سەعات! هەرچی چۆن بێ نزیك بە سەعات سێ و نیو بوو کە بە سەیارەکەی هات! هەر کە منی دیت خێرا دابەزی! زۆر توڕە بووم! خەریك بوو پێی هەڵپڕژم کە بە دەستی ئیشارەی کرد! هیچم نەگوت و دووقۆڵی چووینە سەرێ و هەر کە گەیشتینێ, بە توڕەیی گوتم!))

ـ سوهەیل! خەریکە یاریم پێ دەکەی؟!

– دیسانەوە ترسای!؟

ـ بەڵێ ترسام! زۆریش ترسام! وە بزانە کە کاتێك بترسێم لەوانەیە زۆر کاری خراپیش بکەم!

– خەریکی ئیهانەم دەکەی؟!

ـ هەر چۆنێك دەتەوێ بیر بکەوە!

– چییە؟ وا دەزانی من هەموو شتم لە بیر چۆتەوە؟!

ـ بەڵێ! لە بیرت چۆتەوە!

– تۆ دەزانی هەتا ئێستاش لە کوێ بووم؟!

ـ نا! گرنگ نییە بۆم لە وێ بووی! گرنگ ئەوەیە ئیشی خۆم بزانم!

– ئێ منیش هەر بەدوای ئەو کارەوە بووم ئیدی!

ـ مەگەر ئەوە کارێکی ئیدارییە کە بە دوای بکەوی؟!

– مەبەستم ئەوەیە کە لە کن بابم بووم و خەریك بووم قسەم لەگەڵ دەکرد!

- ئێ چی بوو؟!

- یەکەم دەیگوت: جارێ هاوسەرگیریی زووە بۆت و نەگەیشتوویە ئەو تەمەنە!

- مەگەر تۆ کچی کە دەبێ کاتی هاوسەرگیریت بێت؟!

- بابم ئەوەی گوت!

- ئێ دەی؟!

- بۆچی هاوار دەکەی؟! بهێڵە قسە بکەم!

- باشە بڵێ!

- هەرچی چۆن بێ ڕازیم کرد! بڕیارە یان ئەمشەو یان سبەی شەو تەلەفون بۆ ماڵێتان بکات و قسە لەگەڵ بابت بکات!

- بەڕاستتە سوهەیل؟!

- بەڵێ! بەڵێ! بەڵێ! هەر لە خۆوە ئیهانەم دەکەی! بهێڵە جا با بۆت باس بکەم! بابم کچێکی دیکەی بۆ دە خەیاڵ گرتبووم! کچی خزمێکمان! منیش ئیهانەم کرد! پێم گوت: یان هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەو کچە دەکەم کە خۆشمدەوێت یان خۆم دەکوژم! تەنها لەبەر خاتری تۆ! بابیشم کە دیتی بە جددیی قسەی دەگەڵ دەکەم, ڕازیی بوو! یانی دایکیشم چەند جارێك قسەی دەگەڵ کردبوو! ئێستاش هەموو شت بەرەو باشی دەڕوا! یان ئەمشەو یان سبەی شەو بابم تەلەفون دەکات و ڕێکەوتی هاوسەرگیرییەکە لەگەڵ بابت دیاریی دەکەن!

((هەناسەیەکی قوڵم هەڵکێشا و دەرپەڕیم و خۆم خستە باوەشی و گوتم))

- سوپاس سوهەیل! سوپاس! دەمزانی پیاوی! ببوورە کە توڕە بووم! ئاخر بە دەست خۆم نەبوو! زۆر دەترسێم!

- ئاخر ترس لە چی؟! خۆ من پێم گوتی: بە تەنها جێت ناهێڵم! هەتا ئەگەر بابیشم ڕازی نەبا, بۆخۆم دەهاتمە کن بابت و پێم دەگوت: کە تۆم خۆشدەوێت! حەتمەن

بابیشم ڕازیی دەبوو! ئیدی بۆ ئەوەندە دەترسێی؟! وەرە دانیشە! هیچی وای نەماوە خۆ! لە چاوتروکانێکدا هەموو شت تەواو دەبێت! بەڵام شتێکی دیکەش هەیە!

ـ چی؟!

– هاتین و بابت ڕازیی نەبوو! لەوانەیە بڵێ کە هاوسەرگیری بۆ تۆ زوویە! ئەوکات چی؟!

ـ نازانم! نازانم! تۆ بڵێ بزانم چی بکەین؟!

– زۆر ئاسانە! ئەوکات دەبێ بابەتەکە بە بابت بڵێین! لە کۆتایدا شەڕێکمان لەگەڵ دەکات و دواتریش ڕازیی دەبێ!

ـ وای! ئەگەر بابم بزانێ...!

– زۆر زۆرەکەی چینێکت لێ دەدات! خۆ شوکا هەیە! زوو دێتە پێشێ و بەڕیوانیی دەکا! دوایش کە من ببینێ چوار جنێوم پێ دەدات و تەواو دەبێ و دەچێتە سەر کاری خۆی! کاتێکیش بوومە زاوای، ئیدی میهرەبان دەبێ لەگەڵم!

(( لەناکاو هەردووکمان لە قاقای پێکەنینمان دا کە گوتی))

– دوای چەند ساڵێك دادەنیشنین و بیری ئەو ڕۆژانەمان دەکەینەوە و پێکەوە پێدەکەنین!

ـ خوا بکا هەموو شت زووتر تەواو ببێ!

– دەبێ! غەم مەخۆ! ئێستا بڵێ بزانم چۆنی؟! زۆر دڵم بۆت تەنگ ببوو!

ـ ئاخ... سوهەیل!

( بێدەنگی)

ـ سبەی شەوەکەی نزیك سەعات هەشت بوو کە جەڕەسی تەلەفون هات! بۆخۆم لە تەنیشت تەلەفون بووم! یانی بە تایبەت لەوێ بووم و چاوەڕوان! خولاسە خێرا

تەلەفونەکەم هەلگرت! دەنگی پیاوێك بوو. سەلام و ئەحواڵپرسیی کرد و گوتی: دەمەوێ لەگەڵ بابت قسە بکەم! لە خۆشیان خەریك بوو باڵ بگرم! خێرا بانگی بابم کرد و تەلەفونەکەم وێ دا! بابم تەلەفونەکەی وەرگرت و دوای سەلام و عەلەیك, تەنها گوێی گرت و دواتریش جار جار دەیگوت: من, من, تکا دەکەم! بفەرموون! دوو سێ دەقیقە دواتر خوا حافیزی کرد و تەلەفونەکەی داخستەوە و سەرەتا سەیرێکی منی کرد و دواتر بە شوکای گوت))

– یەك دەقیقە وەرە ئیشم پێتە!

(( پێشتر بابەتی هاوسەرگیریم بە شوکا گوتبوو و ئامادەیی هەبوو! لەگەڵ بابم چوونە ژوورێ و نزیکەی بیست دەقیقە پێکەوە قسەیان کردن و دواتر هەردووك خۆشحاڵ و بە خەندەوە هاتنە دەرێ! هەر کە پێکەنینەکەی شوکام دیت, زانیم ئیشی خۆی کردووە! بە مەبەست چووبوومە ژوورەکەی خۆم کە بابم بانگی کردم. بە هێمنی هاتمە دەرێ کە دیتم هەردووك لە هۆڵەکە دانیشتوون. چووم لەسەر قەنەفێك دانیشتم کە بابم گوتی))

– دەیانناسی؟!

ـ کێهانە بابە؟!

– هەر ئەوانە ئیدی!

ـ کامانە؟!

– ئێستا ئیدی پێویست ناکا هەڵمخەڵەتێنی! هەر ئەوانەی کە بڕیارە بێنە خوازبێنیت!

(( سەرم نەوی کرد کە شوکا گوتی))

ـ شەرم مەکە! ئێ بە بابت بڵێ دەی!

(( ئارام سەرم بەرز کردەوە و گوتم))

- بەڵێ بابە گیان!

(( بابم پێکەنی و گوتی))

- کوڕەکە ئیشی چییە؟!

- بەکالۆریۆسی هەیە!

- ئێشێك شتێکیشی هەیە؟!

- جارێ نا! یانی بابی زۆر دەوڵەمەندە و زۆری لێ دەکا کە ئەویش بچێتە کن ئەو ئیش بکات, بەڵام ئەم ڕازیی نییە!

- ئەم کێیە؟ یانی ناوی چییە؟!

(( دیسان شەرمم کرد و سەرم نەویی کرد و بە هێواشی گوتم))

- سوهەیل.

- باشە! باشە! بڵێ بزانم لە کوێ یەکترتان ناسیوە؟!

(( پێشتر هەموو ئەو وڵامانەم ئامادە کردبوون!))

- لەسەر جادە! چەند جار وەدوام کەوتبوو و ماڵێمانی لەبەر کردبوو! چاودێریی کردبووم! جارێك هاتە بەردەمم و قسەی دەگەڵ کردم! هەتا پێش دەرگا لەگەڵم هاتەوە و قسەی لەگەڵ کردم! یانی ئیشەکەی و وەزعی باب و دایکی و ئەو شتانەی پێ گوتم. دواتریش گوتی کە دەیەوێ بێتە خوازبێنی! منیش ژمارە تەلەفونەکەم وێ دا. دواتر بە شوکام گوت.

- ئێ سەر و وەزعی چۆن بوو؟!

- باشە بابە! باریی دارایيشیان زۆر باشە!

- ژیان تەنها پارە نییە گیانەکەم!

- بە ڕووکەش کوڕێکی باشە!

- ئاخر کەمێك بۆ تۆ زووە! دەکرێ شیرنییەکەی بخۆی و ئەوەی دیکە بۆ دوایی بێ! تۆ دەبێ خوێندنت تەواو بکەی!

(( خێرا شوکا هاتە ناو قسان و گوتی))

- بە چ دەچێ! بەکلۆریۆسیش وەرگرێ, کاتێك منداڵی بوو, دەبێ لە ماڵێ دانیشێ و منداڵ بەخێو بکات!

(( بابم کۆکەیەکی کرد و گوتی))

- ئێستا با بزانین قسمەت چۆن دەبێ! جارێ ئەوە کاتی هاوسەرگیرییان بۆ دوو هەفتەی داهاتوو داناوە. شەوی جومعەی ئەو هەفتە!

(( لەناکاو دڵەکوتەم گرت! بۆ ئەوەندە درەنگ؟! سوهەیل خۆ دەیگوت چەند ڕۆژی دیکە بابەتەکە چارەسەر دەبێ! ئەی بۆ دوو هەفتەی دیکە!

هەستێکی خراپ ڕووی تێکردم! یانی بیرێکی خراپ!

بەیانییەکە تەلەفونم بۆ کرد کە بۆخۆی جوابی دایەوە!))

- ئەلوو! سوهەیل!

- سڵاو بووکەخان!

(( پێکەنیم و گوتم))

- سوهەیل بۆچی کاتی خوازبێنیتان بۆ دوو هەفتەی داهاتوو داناوە؟

- سەرەتا بێڵە با سەلام و ئەحواڵپرسیی بکەین, دوای دەست بە گلەیی و گازندە بکە! نەکا وا بڕیارە کاتێك کە هاوسەرگیریشمان کرد هەر ئیهانەم بکەی؟

(( دیسان پێکەنیم و گوتم))

- نا وەلێ دوو هەفتە زۆر زۆرە!

- ئاخر نازانی چی بووە!

- چی بووە؟!

- دیسان بابم و داکم شەڕیان کردووە !
ـ لەسەر چی؟!
- لەسەر خوازبێنی!
ـ ئاخر بۆچی؟!
- ئەو زهرە قەحبەش دەیەوێ بێتە خوازبێنی! دایکیشم دەڵێ نا! لەسەر ئەوە لێیان بۆتە شەڕ. دوایی بابم قسەی لەگەڵ کردم. منیش گوتم: دەمەوێ دایکم و بابم پێکەوە بچنە خوازبێنی! ئەوە بوو کە کاتی خوازبێنییەکە ڕەت بۆوە بۆ دوو هەفتەی دادێ! بابیشم دەیەوێ بلیت بۆ زوهرە ببڕێ و بینێرێ بۆ تورکیا! دەیەوێ هەر چۆنێکە دڵی ئەویش ڕاگرێ!
ـ کەواتا مەسەلەیەکی دیکە لە گۆڕێ نییە؟!
- نە بابا چ مەسەلەیەك؟! هەستە وەرە ئێرە !
ـ ئێستا نابێ!
- بۆ نابێ!
ـ ئامادە نیم!
- ئێ برۆ زوو خۆت ئامادەکە !
ـ باشە یەك دوو ڕۆژی دیکە !
- تامی شرینیی دەورانی دەزگیرانی هەر بەم شێوەیە ئیدی! هەستە وەرە! ئیدی ئەو دەورە دووبارە نابێتەوە! هەستە وەرە! ئەم جارەیان بۆ نیوەڕۆ دەچینە دەرێ! ئیدی لە پیتزا خواردن وەڕەس بووم! دەچینە چێشتخانەیەکی ڕاقی! هەمان شوێن کە جارێك پێکەوە چووین. دواتریش دەچین دەزگیراناداری! خێراکە! کارەکانت بکە و نها وەرە !
( بێدەنگی)

- ئەو ڕۆژە چارەگێك دواتر تەلەفونی بۆ كردم كە لەسەر كۆڵانێ چاوەڕێ بم و بۆخۆی لە دوام دێ! كاتێك هات سواری سەیارەكەی بووم پێكەوە چووین بۆ هەمان ئەو چێشتخانەیەی كە سەرەتای ئاشناییمان پێكەوە چووبووین. هەردووكمان گۆشتاومان خوارد. چەندە پێكەنین و خۆشمان بەسەر بەرد. دواتریش چووینە باڵەخانەكەی و تا تێر بوون! خۆ تێدەگەی دەڵێم چی..؟!
خولاسە ئەو هەفتەیە جارێكی دیكەش یەكترمان دیت. یانی من چوومەماڵیان. هەفتەی ئەولاتریش دوو جار كە جاری كۆتایی سێ شەممە بوو و جومعەكە دەبوو لەگەڵ دایك و بابی بێنە خوازبێنی! ئەو ڕۆژە نانی نیوەڕۆمان خوارد كە هەمان پیتزا بوو و دواتریش ((تا تێر بوون)) ئەنجام درا, جگەرەیەكی پێ كرد و گوتی))
- گوێ بگرە ئەفسانە بزانە چی دەڵێم!
- بڵێ!
- جا كە سبەی شەو هاتین, ئەگەر بابم لەسەر مارەیی و ئەو شتانە جەنەی گرت, ئێوە ڕازی بن باشە؟!
- مەگەر هیچ بووە؟!
- دەزانی چییە؟! بابم كاسبە! هەر بابەتێك وەك بابەتی كاسبی پێوانە دەكات! ئێوە هەر مارەییەك كە دانێن, دواتر خۆم قەرەبووی دەكەمەوە! تۆش ناڕەحەت مەبە! بابم مرۆڤێكی خراپ نییە, هەر سروشتی وایە! بهێڵە ئەو بابەتە چاك ببێ! دواتریش دەڕۆم و مارەییەكەت زیاد دەكەم!
(( لەو كاتەدا ئەسڵەن مارەییم بۆ گرنگ نەبوو. لەوانەیە هەتا پێش ئەوەی سوهەیل ئەو قسەیە بكات, بە نسبەت خوازبێنییەكەیان گومانێكم هەببووبێت! یانی گومان كە نا! دەترسام بابی ڕازی نەبێ و بە شێوەیەك بیەوێ هاوسەرگیرییەكە تێك بدات! یان شتێكی دیكە, یان ڕووداوێكی دی! ترس هەر لە

دڵمدا بوو! بەڵام کاتێك ئەو قسەیەی کرد, دڵنیا بوومەوە کە لەگەڵ بابی حەتمەن ئەو باسەی چارەسەر کردووە و بۆ وێنە بابی بە چەند سککەیەك ڕازی کردووە ! خەیاڵم ئاسوودە بوو!))

ـ سەیر کە سوهەیل! ئەسڵەن ئەو شتانە بۆ من گرنگ نین! گرنگ ژیانی ئایندەی ئێمەیە ! باقی شتەکانی دی بێ نرخن!

(( هەستم کرد کەمێك ناڕەحەتە, پرسیم))

ـ شتێك بووە سوهەیل؟!

- نا, شتێکی وا نییە !

ـ وا هەست دەکەم ناڕەحەت بی! ئەگەر مەسەلەیەك هاتۆتە پێش بڵێ!

(( کەمێك بێدەگ بوو و دواتر گوتی))

- شەرمت لێ دەکەم!

ـ شەرم بۆ چی؟! بڵێ!

- پێم گوتی: بابم سروشتی وەك بەقاڵ و میوەفرۆشان وایە! هەر بەدوای قڕانێك و دوو هەزاریەوەیە !

ـ ئێ!

- دوو سێ ڕۆژە سۆراغی زنجیرەکەم لێ دەکات!

ـ زنجیر؟!

- ئەها ئەوەی کە دام بە تۆ! دەڵێ: لە کوێیە؟! منیش پێم گوت: پساوە و بردوومە دووکان چاکی کەمەوە. ئاخر بۆخۆی بۆی کڕیوم! ئەگەر بزانێ کە داومە بە تۆ, لەوانەیە هەر خوازبێنییەکەش هەڵوەشێنێتەوە ! ڕاستییەکەی زۆر بە دوای بەهانەدا دەگەڕێ و منیش نامەوێ شتێکی بدەمە دەست کە بەرنامەکانمان تێك بدات!

(( خێرا زنجیرەکەم لە گەردنم کردەوە و لە بەردەمیم دانا کە بە شەرمەوە لێی وەرگرتم و گوتی))

- ببورە ئەفسانە! من ئاوا مرۆڤێك نیم! بۆخۆت دەمناسی! خوازبێنی تەواو بێت بۆت دێنمەوە! بەخوای بۆخۆم زۆر شەرمەزارم, بەڵام ئەوە بابمە! چی لێ بکەم؟! جارێ پێویستم پێیەتی! یانی هەردووکمان پێویستمان پێیەتی! جاری وایە زۆر قەلەق دەبێ! دایکیشم هەر لەبەر ئەوە لێی جیا بۆوە! ماوەیەك لەسەر سەرت دادەنێ و ماوەیەکیش دە قورپێت ڕۆ دەکات!

ـ ئەو قسانە چین سوهەیل؟ چاك لێت تێدەگەم! ئەتۆش نەدەبوو یادگاریی بابت دابا بە من!

- ئاخر تۆم زۆر خۆشدەوێ! دوای خوازبێنی ئیدی بە ئاسانی پێتی دەدەم! ئیدی ئەوکات بەهانە ناگرێ!

ـ ئێستا گرنگ ئەو خوازبێنییەیە و وەزعی ئایندەی ئێمە! ئێستا تۆ دڵنیای کە هەموو شتێك باشە؟!

- ئەی چی ! تەنها ئاگاداری قسەی بابم بە! بە شێوەیەك لە بابت بگەیەنە! هەرچۆنێك بێ دایکیشم هەر لەوێیە! حەتمەن دێتە یارمەتیتان, بەڵام بابم پێی وایە کە دێتە ماڵێتان ئەشیا دەکڕێ! توخوا بە بابت بڵێ کە من ڕەوشتم نەچۆتەوە سەر بابم! دەترسێم ئەو شەوە لە شەرمان لەگەڵ بابم بیکەینە شەڕ!

ـ نانا! هەر قسەشی لێوە مەکە! نەکا لەناکاو شتێك بڵێی یان خوانەخواستە کارێك بکەی هاا!

- ئاخر هەر لە یەکەم پێکگەیشتن...!

ـ تۆ کارت پێی نەبێ! تۆ تەنها دانیشە و هیچ مەڵێ! من لە شوکا دەگەیەنم کە هەرچۆنێك بێ بابم ڕازی بکات! بەس تخوا کارێك مەکە کە ئەو شەوە خوازبێنییەکە تێکچێ! ئابڕوی من لە خەتەر دایە هاا! مارەیی و ئەو شتانە ئەسڵەن بۆم گرنگ نییە هاا! گرنگ ئەنجامی ئەو کارەیە! تێگەیشتی سوهەیل!

– بەڵێ!

ـ بزانە چەندەم پێ گوتوی هاا!

– باشە خەیاڵت ئاسودە بێت! ئەسڵەن من ئەو شەوە هەر قسە ناکەم! ئەگەر دەڵێی من هەر نایەم!

ـ نا! وەرە, بەڵام کارێك مەکە کە لەگەڵ بابت پێك هەڵپڕژێن!

( بێدەنگی)

ـ سبەی دواتر کە پێنجشەممە بوو, شوکا میوە و شیرنی و هەموو شتێکی کڕیبوو و ئامادەی کردبوون! بۆ ئێوارەش شتێکی نایابی ئامادەکردبوو و دەیوست بۆ ئێوارە بانگیان بکات. قسەشی لەگەڵ بابم کردبوو لەسەر مارەیی و ڕەوشتی بابی سوهەیل و تەقریبەن ئامادەی کردبوو, وەلێ من دڵم لە سینەمدا ئۆقرەی نەبوو, کە نەکا لەناکاو هەموو شت تێکچێ!

ئێوارە چوومە حەمام و دواتر قژم ڕێك کرد و جلێکی سادە و قەشەنگم هەڵبژارد و باقی کارەکانی دیکەشم کردن. لە سەعات پێنجی ئێوارەوە بوو کە ئیدی دڵەکوتە خەریك بوو دەیخنکاندم! سەرێك دەچوومە ژوورەکەم و سەیرێکی جلەکانم دەکرد و دەگەڕامەوە چێشتخانە و میوەکانم ڕێك دەکردن و دووبارە دەچوومەوە ژوورەکەم و لە ئاوێنەدا سەیری خۆم و جۆری ئارایشی ڕووخسار و قژم دەکرد و دەگەڕامەوە چێشتخانە و قاپی شیرنیم ڕێك دەکردن و دیسان دەچوومەوە

ژوورەکەم, کە بزانم هەموو شت ڕێکوپێك بێ و دەگەڕامەوە چێشتخانە و ئەو ئیستکانانەی کە شوکا بە ڕێکی دابنابوون لەسەر سینی, دووبارە ڕێکم دەکردنەوە! وەسوەسە خەریك بوو شێتی دەکردم! سەعات هەشتی شەو بوو, چوار جار —چا—م دێم کرد و بەتاڵم کردەوە! شوکا هەر پێم پێدەکەنی! بابیشم هەر وا! جا چەندم خەفەت لە دەست بابم خواردن هەر باسی مەکە! تازە سەعات چوار بوو کە هاتەوە ماڵێ! تەقریبەن سەعات پێنج و نیویش بوو کە چۆ دە حەمامێ! ئەوەندە توڕە ببووم هەر نەبێتەوە! نەشمدەتوانی قسەی پێ بڵێم, تەنها لە خەفەتان نەخۆشیی گەدەم گرتبوو! سەرێکم لە میوە دەدا, سەرێك لە شیرینی, سەرێك لە چا! سەرێك لەم مەنجەڵە و سەرێك لەو مەنجەڵ, سەرێك لە قاپی زەڵاتە کە لە سەلاجەدا بوو, سەرێك لە قاپی بەتاڵ, سەرێك لە سەماوەر! خولاسە خەریك بوو ئارامم لێ دەبڕا! شوکاش هەر دڵداریی دەدامەوە!

هەرچۆنێك بوو بە سەعات هەشت. ئیدی دەبوو وردەوردە دیار بن. شوکا و بابم لە هۆڵەکە دانیشتبوون و سەیری تەلەڤزیۆنیان دەکرد, بەڵام من جارێك دەچوومە چێشتخانە و جارێك لە هۆڵ و جارێك لە ژوورەکەم, لەودیو پەنجەرەوە!

بوو بە هەشت و نیو! هەر بەڕاست خەریك بوو دڵم لە سینەم بێتە دەرێ! لە سەعات نۆ بەولاوە بابم هەر پێنج دەقیقەیەك وەردەگەڕا و سەیری سەعاتی دیواری دەکرد!

نۆ و نیو بوو کە یەکەم دەنگی ناڕەزایی لێوە بەرز بۆوە!))

– ئەی لەکوێن ئەوانە؟!

(( هێواش چوومە ژوورەکەی خۆم و دەرگام پێوە دا و ژمارەی سوهەیلم لێ دا! جەڕەس ئەوەندە ڕۆیی هەتا داخرایەوە! دەمزانی کە لەوێ نییە, وەلێ ژمارەیەکی دیکەیم پێ نەبوو!

سەیر ئەوە بوو کە سەعات گەیشتە دە! گەرووم خەریك بوو بمخنکێنیٚ! لە ژێر چاوەوە سەیرکرنەمانادارەکانی بابم و شوکام دەبینین! بابم لێك لێکە چاوی لیٚ دەکردم و شوکاش بە ئیشارە وای دەردەخست کە دەبیٚ هێشتا ئارام بگریٚ!

سەعات دە و چارەگ بوو کە لەناکاو بابم لە جێی خۆی هەستا و وەك چۆن بەرەو ژووری خۆی دەڕۆیشت گوتی))

– خوازبێنی خۆ دە و نیوی شەویٚ ناکریٚ! ئەوانە ئەگەر داواکار بان, دوو سەعات پێشتر لێرە بوون! خوازبێنیی نەناسیاو و نەزانراو ئەو شتانەشی هەیە ئیدی!

(( ئەوەی گوت و چۆ دە ژووریٚ! ڕاستی دەکرد! بۆخۆشم لە سەعات نۆ بەولاوە هەستێکی زۆر زۆر خراپم بۆ دروست ببوو! وەك ئەوەی کە شتێك ڕووی دابیٚ, یان خەریکە ڕوو دەدات! ئیدی نەمتوانی پێش بە خۆم بگرم! چووم بەرەو ژووری خۆم و دەرگام لە پشت سەری خۆم پێوە دا و دەستم بە گریان کرد! هەر سەرەتا دەمزانی کە بابی بەو هاوسەرگیرییە ڕازی نییە! سوهەیل لە خۆوە ئومێدەوار بوو! بەو ڕەوشتە خراپەی کە بابی هەیبوو, حەتمەن شتێکی کردۆتە بەهانە و هەموو شتێکی تێك داوە! ئەی ئیشی من چی لیٚ دیٚ!؟ دوو سیٚ هەفتە چاوەڕوان بووم, ئاخیرەکەی هیچ!

خەریك بووم دەگریام کە شوکا هاتە ژووریٚ و باوەشی لیٚ دام! دواتریش بابم هات! چاوم پڕ فرمێسك بوون! هەر بەڕاست شەرمم دەکرد کە چاوی لیٚ بکەم! فەقیرە هات و لە باوەشی کردم و وەك چۆن دەنگی لە ناڕەحەتیان و تووڕەییان دەلەرزی, دەستی بە سەرمدا هێنا و گوتی))

– غەم مەخۆ بابە گیان! خەفەت مەخۆ گیانەکەم! باش بوو هەر زوو ناسیمانن و قەزییەکە هەر لێرەوە کۆتایی هات! یەکەم کە بۆ تۆ زوو بوو! دووەمیش, مەگەر

خوازبێنیی براون بۆ تۆ؟! جا سەیر کە چۆن داواکاریی ڕیز دەبەستن بۆ ماڵێمان! خانمۆڵە, جوانکیلە, دەرسخوێن, نەجیب...!

(( ئەوانەی گوتن و ئیدی نەمتوانی تەحەممول بکەم! بە شێوەیەك گریام کە بابم پێی سەیر بوو, بەڵام شوکا زوو ئیشارەی بۆ کرد و ئەویش بە ناڕەحەتی چۆ دەرێ! دواتریش شوکا بە حەبێك و پەرداخێك ئاوەوە گەڕایەوە حەبەکەی لە زاری هاویشتم و هەر وا قوتم دا. دە دەقیقە چارەگێك دواتر چاوم قورس بوون و هەر لەوێ بە هەمان جلەوە خەوتم و چ خەوێکم دیت! هەموویان باسی خوازبێنیم بوون! دەمبینی کە ڕێك لە پێش دەرگای ماڵێمان, سوهەیل و بابی شەڕیان بووە و سوهەیل خەریکە لە بابی دەدات و بابیشی ڕووی لە ماڵێ مە کردووە و من کە لە پشت پەنجەرەوە ڕاوەستاوم, جنێوم پێ دەڵێ! خەوم بینی کە هاتوونە ماڵێ و لەسەر مارەیی, بابی لەگەڵ بابم شەڕیان بووە! خەوم بینی کە هاتوونە ماڵێمان و خەریکن قسە دەکەن! کە لەناکاو دەرگا دەبێتەوە و ژنێك کە دەزانم زوهرەیە, دێتە ژوورێ و پێدەکەنێ و بە بابم دەڵێ: ئەو پیاوە ژنی هەیە! من ژنی ئەوم!

بەیانییەکەی لە سەعات پێنج و نیوەوە بەخەبەر بووم و لە بیری ئەوەدا بووم کە زووتر کات تێپەڕێ و من زووتر تەلەفون بۆ سوهەیل بکەم! بەدبەختیی ئەوە بوو کە جومعە بوو و بابیشم لە ماڵێ بوو! ئاواش نەمدەتوانی بە خەیاڵی ئاسوودەوە تەلەفونی بۆ بکەم! هەرچی چۆن بێ ئارامم گرت تا سەعات بوو بە حەوت و نیو و تەلەفونم هەڵگرت و ژمارەکەیم لێ دا! جوابی نەدایەوە! هەشتیش لێمدایەوە, دیسان هیچ! هەشت و نیو بوو کە شوکا هاتە ژوورەکەم و سەیرێکی کردم و بە ئارامی گوتی))

– چی بووە!؟

- هیچ!

- لە ماڵێ نییە؟!

ـ نا!

- پێت وایە چی بووە؟!

ـ حەتمەن شەڕیان بووە لەگەڵ بابی!

- ئەفسانە واز لە خێری ئەو کوڕە بێنە!

ـ ئەوە دەڵێی چی شوکا؟!

- ئەوە پارووی تۆ نییە!

ـ توخوا شوکا سەر مەخە سەرم!

(( سەیرێکی کردم و گوتی))

- کەوایە هیچ نەبێ شکڵێکی باش و جوانت با هەبێ, وا بکە کە بابت هەستا, ئاوا نەتبینێ! زۆر ناڕەحەتە! گاڵتەی پێ کراوە!

(( ئەوەی گوت و چۆ دەرێ! ڕاستی دەکرد, دەبوو خۆم کۆنتڕۆڵ بکەم! خێرا لە جێگەکەم هەستام و چوومە بەردەم ئاوێنە! وای ئەو چاوە سوورانە!

جلی شەوی ڕابردووم گۆڕین و چوومە سەرئاو و دەست و چاوم شردن و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم! ئاڕایشێکی پوختیشم کرد و چەند جارێك لە ئاوێنەدا پێکەنیم کە ڕووخسارم حاڵەتێکی ئاسایی وەرگرێ! هەر وەك جارانی ڕۆژی جومعە شریتێکم هاویشتە سەر, کە بابم وا بیر بکاتەوە کە وەزعی ماڵێ وەك جارانە! دواتریش بە پێکەنینەوە چوومە دەرێ, کە دەنگی بابمم لە ناو ژوورەکەیەوە گوێ لێ بوو!

- خاتوو شوکا نانی بەیانیمان ئامادەیە؟

(( تۆزێك دواتر لە ژوورەکەی هاتە دەرێ و سەیری منی کرد کە بە خێرایی سڵاوم لێ کرد. پێم پێکەنی و گوتی))

- باشیت؟!

(( دواتر خەندەیەکم کرد کە هاتە لام و باوەشی لێ دام و گوتی))

- ئافەرین! ئەوە تەواوە! ئەوەی دیکە بە گۆڕی بابی هەمویان!

( بێدەنگی)

- کێشکگر خەریکە دێ تەرانە! خانمی پارێزەر کات تەواو!

- ئەگەر دەکرێ, ئەمڕۆ کارم زۆرە!

- باشە, کەوایە زووتر!

- بە چاوان! بە چاوان!

- ئەمڕۆ لوتی خۆم زیاتر بردە پێش!

- باقییەکەی بڵێ!

( بێدەنگی)

- هەرچۆنێك بێ ئەو ڕۆژەم بەڕێ کرد. تا شەو حەوت هەشت جار تەلەفونم بۆ کرد! وەلێ جوابی نەدایەوە! چیدی بۆت باس ناکەم حاڵم چۆن بوو! ڕق, کینە, تۆڵە, هیوا, ئارەزوو, غەم, خەفەت, هەموویان پێکەوە کۆتاییان پێ هاتبوو! وە هەستێکی سەیر لە دەرونمدا دروست ببوو! هەستێك کە نازانم ئەگەر لەو کاتەدا سوهەیلم دیتبا, چۆن چۆنی ڕووبەڕووی ببمەوە!

شەممەکەش تا بابم لە ماڵێ چۆ دەرێ, منیش دەرپەڕیمە سەر جادە و تاکسییەکم گرت و چوومە پێش دەرگایان و دەستم لەسەر جەڕەس دانا و کەس لە ماڵ نەبوو! هەر لەوێ دانیشتم و دەمزانی کە لە هەر کوێیەك بێ, دەبێ بەدی بێتەوە! لەناکاو بیرێك هاتە مێشکمەوە, کە نەکا لە شەرمان جوابی ئایفۆن نەداتەوە! دیسان دەستم لەسەر جەڕەس دانایەوە و لەوانەیە پێنج دەقیقەیەك هەر وا لە جەڕەسم دا, بەڵام خەبەری نەبوو! دووبارە دانیشتم, سەعاتێك, دوو سەعات, سێ

سەعات, هیلاك ببووم! ئیدیی قیرِوسیام لێکرد و لە جەرِەسی جیرانی بەرانبەر ماڵیانم دا! کەمێك دواتر, خاتوونێك جوابی ئایفۆنەکەی دایەوە!

– بەڵێ!

ـ سڵاو خاتوون!

– سڵاو بفەرموو!

ـ ببوورن بێزارتان دەکەم, دەربارەی باڵەخانەی بەرانبەرتان, چەند پرسیارێکم هەبوو!

– ئەها, کلیلەکە بە جیرانی قاتی خوارەوەیە! جەرِەسی دانەیەك خوارتر لێ بدە!

ـ کلیل؟!

– مەگەر بۆ وەرگرتنی خانووی تازە نەهاتووی؟!

((لە جێی خۆم سرِ بووم کە گوتی))

– خاتوون!

ـ بەڵێ! بەڵێ!

– لەو جەرِەسەی دیکە بدە!

((دەستم بە جەرِەسەکەی دیکە کەوت و خاتوونیکی دی هەڵیگرت))

– بەڵێ!

ـ خاتوون سوهرابی؟! میعراجیم!

– سڵاو خاتوون میعراجی! حاڵی ئێوە باشە؟! بەرِێز میعراجی چۆنە؟!

ـ سوپاس, مەمنون, لە جەرِەسی ئێوەشیان دا؟!

– هاتوون بە دوای کلیل دا!

ـ ئەها!

(( لەناکاو دەرگا کرایەوە. چوومە ژووریٚ! هەر پلیکانەیەك كە دەچوومە سەر, دەتگوت هەنگاوێك لە مردن نزیك دەبمەوە! لە پێش دەرگای باڵەخانە, خاتوونێك چاوەڕیٚ بوو! هەر کە منی دیت, گوتی))

- خاتوونی بەڕێز ئەو پیاوە هەموو شتەکانی ناو ماڵی بار کردووە و تەواوی دیوار و پلیکانەکانی بریندار کردووە! ئەو قاڵدرمانەی کە شەش مانگ لەمەوبەر بۆیاغمان کرد! ڕات چییە؟! بە بابت بڵیٚ حەتمەن لە کۆبوونەوە بەشداری بکات!

(( نەمدەزانی باسی چی دەکات! تەنها سەیرم دەکرد کە گوتی))

- لە کۆبوونەوەدا قسە دەکەین! چونکە کرێچیی ئێوە بووە, بۆیە دەبیٚ ئێوە خەسارەکەی بدەن! حەتمەن پارەیەکتان لیٚ گێڕاوەتەوە!

(( دواتریش دەستی درێژ کرد و کلیلێکی ویٚ دام! لێم وەرگرت و ڕۆیشتمە سەریٚ و لە پێش دەرگای باڵەخانەی سوهەیل! باوەڕم نەدەکرد! یانی ئەو شتانەی کە بیستمن, ڕاستن؟! یانی ئێستا ئەگەر دەرگا بکەمەوە, سوهەیل بوونی نییە؟! بە هێمنی کلیلەکەم خستە ناو دەرگا و کردمەوە! تەنها نیگایەك بەس بوو بۆ ئەوەی بە تەواویی دڵنیا بم! نیگایەکی بیٚ هیوا, نیگایەکی چەق بەستوو! ماڵ چۆڵ و هۆڵ بوو! چەند زەرفێکی لایلۆن لەو گۆشەیە و دوو کارتۆنی بەتاڵ لەو نێوەدا و بەرگی چەند کاغەزێك! لە لایەکی دی حەوت هەشت ڕۆژنامە و گۆڤار, لە پێش دەرگا بوون! بە هێواشی چوومە ژووریٚ! یەکە یەکە ژوورەکانم بینین بە بەتاڵی! چوومە چێشتخانە! کتری و چادان لەسەر مەغسەلە بوون! هەمان ئەو کتری و چادانەی کە دەمشردن و چام پیٚ دێم دەکرد بۆی! پاڵم وە مەغسەلە دا و دانیشتم لەسەر عەردی چێشتخانە و بە بینینیان وڕ و مات بووم!

- ڕۆیشت! شەویٚ شتەکەی گواستەوە!

(( گەڕامەوە بۆ لای دەرگای چێشتخانە ! خاتوونێك ڕاوەستا بوو و سەیری دەكردم ! ))

- یەك دوو جار لە پێش دەرگا بینیومی !

(( دیسان سەیرم كرد ! ))

- مرۆڤێكی پیس بوو ! هەموو جیرانەكان لێی ناڕازی بوون !

(( وەرگەڕام و سەیرێكی كتری و چادانەكانم كرد ! ))

- بە جیرانی قاتی خوارێی گوتبوو كە دەچێتە ئەوروپا !

(( ئەم ڕستەیە وەك كوتك دای لە سەرم ! لە جێی خۆم هەستام و گوتم))

ـ هیچ ناونیشانێك شتێكت لێی نییە ؟ !

- ئەسڵەن كەس لە باڵەخانەدا قسەی دەگەڵ نەدەكرد ! شێت بوو !

(( هەڵوەستەیەكی كرد و گوتی))

- دەتەوێ پەرداخێك ئاوت بۆ بێنم؟ !

ـ نا ! سوپاس !

- پێ ناچێ وەك ئەوانە بی كە شەوانە دەیهێنانەوە !

(( تەنها سەیرم كرد ! ))

- بڕیار بوو ئەمرۆ خاوەن ماڵ بێت و كلیلەكەی وەرگرێتەوە و پێمان وا بوو كە تۆی !

(( بە هێمنی سوپاسم كرد و وەڕێ كەوتم كە بچمە دەرێ ! ))

- ئەگەر بە دوای ناونیشانێكی دا دەگەڕێی؟ ! لەسەری ئەو كۆڵانە ئەو نووسینگەیەی كە ئێرەی دابۆیە بە كرێ, وەلێ ئەوانیش ناونیشانێكی ڕاستییان لەكن نەبوو !

ـ ئێوە لە كوێوە دەزانن ! ؟

- ماوەیەك لەمەوبەر, جارێك کە دەمانەویست شکایەت لە دایك و بابی بکەین, چووینە ئەویٚ! ناونیشانێکی لە کرێخانوودا نووسیبوو. یەکێك لە جیرانەکان, چوو بە دوای ناونیشانەکە, بەڵام ڕاست نەبوو! ئاخر هەر دەیگوت بابم وایە و بابم وا! ئەسڵەن هەر دەتگوت بیٚ کەس و کارە! لەوانەشە نا! حەتمەن بە تایبەت ناونیشانی هەڵەی داوەتە نووسینگەکە!

(( سەرم نەویی کرد و بۆ دواین جار سەیرێکی باڵەخانەم کرد! ڕێك ئەو شوێنەی کە پێکەوە لێی دادەنیشتین و دەردە دڵی بۆ دەکردم! هەمان ئەو شوێنەی کە پێکەوە پیتزامان لیٚ دەخوارد! هەمان شوێن کە پێکەوە سەمامان لیٚ دەکرد! هەمان شوێن کە کاتێك قەنەفەیەکی نەفرەتی لیٚ بوو!

(( بێدەنگی))

- ئەفسانە؟!

- هاا!

- باشی؟!

- بەڵیٚ! بەڵیٚ!

- دەتەویٚ ئەوەی دیکە لێگەڕێین بۆ دوایی؟!

- بەڵیٚ ئیدی تاقەتم نەما!

( دەنگی دوگمەی تەسجیەلەکە)

***

(( ئەو ڕۆژە دوای ئەوەی کە لە گرتووخانە هاتمە دەریٚ, سەرم لە یەکێك لە شەریکەکان دا. دواتریش سەعات یەك و نیو بوو کە گەیشتمەوە ماڵیٚ و خێرا خواردنم گەرم کردەوە کە سوگێلیش گەیشتەوە. هەتا جلەکانی گۆڕین, خوارنم بۆ تێکرد و بانگم کرد, بە کیسەیەکی نامەوە هاتە چێشتخانە و گوتی))

- دایە, سبەی کۆبوونەوەی دایك و باوکانە ! گوتیان دەبیّ هەر بێی.
- باشە گیانەکەم. نانەکەت بخۆ.

(( لەسەر مێزەکە دانیشت و منیش چووم تەلەفونێك بۆ موبایلەکەی بێهروز لێدەم, بەڵام کوژاوە بوو. ژمارەی ئیدارەکەیم لیّ دا, ژمارە نوێکەی, هیچ کەس جوابی نەدایەوە ! بۆ ژمارە کۆنەکەیم کرد کە هاوکارەکەی جوابی دایەوە. سەلام و ئەحواڵپرسیمان کرد و کە لەناکاو گوتی))

- خاتوون پیرۆزباییتان لیّ دەکەم !
- سوپاس , بەڵام بۆچی؟!
- بۆ قەرزەکەتان ! ئێێستا هەموو کارەکانی ئیداریی تەواو بوونە و کۆتا مەرحەلەشی هاتۆتە بەر دەستی بەندە ! پیرۆزتان بیّ !

(( هەڵوەستەیەکم کرد و دواتر گوتم))

- قەرزی چی؟
- قەرزی بەڕێوەبەر !
- ئەها , زۆر سوپاس !
- مەبلەغێکی زۆر زۆرە ! ئیشەڵڵا بە خۆشی سەرفی بکەن !
- سوپاس ! ببورن بێهروز لە فەرمانگەیە ؟
- تەلەفونتان بۆ ژوورەکەی خۆی کرد ؟
- کەس جواب ناداتەوە !

(( پێکەنی و گوتی))

- ئەم ماوەیە زیاتر گرفتارییەکانی لە دەرێن! لەو کاتەوەش کە پلەی بەرز بۆتەوە, هەتا بۆ جارێکیش نەهاتووە سەر لە هاوڕیّ کۆنەکانی بدا ! هەر لەبیر خۆی بردووینەوە ! هەقیشیەتی ! ئیدی ئەو بەڕێوەبەرە و ئێمەش کارمەند !

- ڕێزتان هەیە!

- ئێستا ئەگەر کێشەیەك هاتۆتە پێشیٚ لە خزمەتداین!

- نا! نا! موبایلەکەی شەبەکەی نییە! دووبارە بۆی دەکەمەوە تا جواب بداتەوە!

زۆر زۆر خۆشحالٚ بووم, سلاٚوم بە خاتوون بگەیەنن! خواتان لەگەلٚ!

(( تەلەفونەکەم داخستەوە, نەمدەزانی بۆچی داوای قەرزی کردووە! ئەویش قەرزێکی زۆر! هەرچەند کە دیار بوو داوای قەرزی بۆ چ مەبەستێکە! ئیدیی زۆر بۆم گرنگ نەبوو! گەڕامەوە چێشتخانە و خۆم بە کار و قسەی سوگێل سەرقالٚ کرد! وردەوردە خەریك بوو بە حالٚەتێکی جیاوازیی دەگەیشتم! ئەم کاتانە ئیدی ژن و مێرد, بیٚ ئاگا دەبن لە یەکتری!

شەویٚ وەك شەوانی دی, گەڕایەوە و حەمامی کرد و نانی ئێوارەی خوارد, بەلاٚم دەربارەی قەرز هیچ قسەیەکی نەکرد! منیش هیچم نەگوت! سەعاتێك دواتر گوتی کە زۆر ماندووە و دەیەویٚ بچێت بخەویٚ, کە بۆم باسی کۆبوونەوەی مەکتەبیٚ کرد! بڕیار بوو سەعات دوو سەرێك بچێتە ئەویٚ!

هەتا ڕاکشا و دە دەقیقە دواتر, دەنگی پرخەپرخی بەرز بۆوە! چوومە سەر سەری و سەیرم کرد! وەك بەراز نووستبوو! حەزم دەکرد هەر ئەوکات, شتێك هەلٚگرم و توند لە سەری ڕاکێشم! هاتمە دەریٚ لە ژوورەکەی و سەرێکم لە سوگێل دا! ئەویش خەوی لیٚ کەوتبوو! ماچم کرد و هاتمە دەریٚ! چووم لە چێشتخانە دانیشتم و جگەرەیەکم پیٚ کرد و چوومە قولاٚیی بیرکردنەوەوە, لە بیری ئەوەیدا کە چۆن بتوانم بەردەوامیی بەم ژیانە پیسە بدەم؟! بەیانییەکەی وەك ڕۆژانی دیکە تێپەڕی! ئەم کۆمپانیا و ئەو کۆمپانیا و دادگا و ئەو شتانە. دوا نیوەڕۆ هەر وەك جاران مالٚیٚ و نان خوارند و سوگێل و کەمێکیش پاکوخاوێن کردنەوەی

ناوەوە و چوومە چێشتخانە و چایەکم بۆ خۆم تێکرد و سوگێلیش کە خەریك بوو پارچەیەك لووشمەکی دەخوارد و هاتە چێشتخانە و گوتی!))

- وامزانی پورە تینا ئەمڕۆ لێرەیە!
ـ پوورە تینا؟! بۆچی؟!
- کاتێك چاوەڕێی سەیارەم دەکرد, ئەوکاتەی کە بەڕێکەوتین, سەیارەی بابم گەیشتە پێش قوتابخانە! پوورە تیناش لە سەیارەدا بوو!

(( دەتگوت لە کارەبایان داوم, تەواوی گیانم وەك داری لێ هات! هەتا چاوم هێزی جوڵەی بینینیان نەبوو! نەمدەتوانی باوەڕ بەوە بکەم کە بیستبووم! تینا! خوشکی بچووکترم بوو! نزیك سی ساڵ دەبوو و مێردی نەکردبوو! یانی ئەسڵەن نیازی هاوسەرگیریی نەبوو! هەوڵم دا ئاسایی ببمەوە!))

ـ لە کوێ دیتتن؟!
- کەمێك لەولای قوتابخانە!
ـ دڵنیای؟!
- بەڵێ دەستم بۆ هەڵێنا, بەڵام منی نەدیت!
ـ دایە! جومعە دەچینە ماڵێ دایە گەورە و ئەوان؟! زۆر وەڕەزی دایە گەورە و پورە تینام کردووە! دەچین؟!

(( ئەسڵەن نەمدەزانیی چی پێ بڵێم! ناردمە سەر دەرسەکانی و هەر لەوێ بۆخۆم لە مدبەق دانیشتم! خەریك بوو چ ڕووداوێك ڕووی دەدا؟! چ بەڵایەکم بە سەر دەهات؟! خوشکم؟! یانی دنیا ئەوەندە پیس بووە؟! ئاخر بۆچی؟! یانی ئەگەری هەیە سوگێل هەڵەی کردبێ!؟ لەناکاو شتێکم بە فکردا هات! خێرا تەلەفونەکەم هەڵگرت و ژمارەی ماتۆڕەکەم گرت و کاتێك جوابی دایەوە, هەمان مەنسوورم داوا کرد و تەلەفونەکەیان وێ دا! سەلام و ئەحواڵپرسیم لەگەڵ کرد و

ویستم خێرا بێتە پێش دەرگا و تەلەفونەكەم داخستەوە! چوومە زگ ئەلبوومی ڕسمەكان و خێرا گەڕام و ڕسمێكی نوێی تینام دەرهێنا كە لە جەڕەسیان دا! جوابی ئایفۆنم دایەوە, سایەق ماتۆڕەكە بوو! خێرا چوومە خواریٚ گوتم))

- ببوورن كاك مەنسور! بەڵام داوایەكم لێتان هەیە!

– فەرموون خاتوون!

- تۆ ئەو ڕۆژە كە بەدوای شوەكەمدا ڕۆیشتی, كاتێك ئەو خاتونە هات, پڕایدەكەی چ ڕەنگێك بوو؟!

(( بیرێكی كردەوە و گوتی))

– زیوی!

(( دڵم لەت بوو, پڕایدی تیناش زیویی بوو!))

- ببوورە ڕووخساریت بینی؟!

– كەمێك!

- ئێستاش لە بیرت ماوە؟!

– زۆر نا!

- یانی ئەگەر ئێستا ببینییەوە, دەیناسییەوە؟!

(( سەرێكی لەقاند, خێرا لە گیرفانی چارشێوەكەم وێنەی تینام دەرهێنا! حەزم نەدەكرد ڕسمەكە بدەمە دەستی مەنسوور, وێنەی خوشكەكەم, لەوانەشە تراسبم كە وێی بدەم! دەترسام كە مەنسوور بیناسێتەوە! نەمدەویست بەم شێوەیە بیٚ! لەو ساتەدا خوا خوام بوو كە ئەو چەپەڵە هەر كەسێكی دیكە بیٚ, جگە لە تینا! ئەو تینایەی كە ئامادە بووم ژیانی لە پێناو دابنێم! ئەو خوشكەی كە هاوخوێنی من بوو! بە هێمنی دەستم بۆ لای مەنسوور درێژ كرد! تەنها خوا دەزانیٚ لەو كاتەدا چەندە دوعام كرد كە مەنسوور بڵیٚ: نا, ئەو نییە! تەواوی ئەو ساتانەی كە

مەنسوور خەریك بوو سەیری ڕسمەكەی دەكرد, لە دڵەوە داوام لە خودا كرد, چاوم لە ڕووخساری مەنسوور بوو و دوعام دەكرد! كە كەمێك دواتر سەری بەرز كردەوە و گوتی))

- پێم وایە خۆیەتی خاتوون!

(( ئەژنۆم شكان!))

- تەندروستیتان باشە خاتوون؟!

ـ بەڵێ! بەڵی! وەلێ تكا دەكەم جارێكی تریش بە دیقەتەوە سەیری بكەن!

(( دیسان سەیری كردەوە و گوتی))

- لە سەدا هەشتا بۆ نەوەد, خۆیەتی!

ـ تۆ ئەو ڕۆژە نێوانتان چەندە بوو؟!

- دە مەتر!

ـ لەوانەیە هەڵەت كردبێ!

- ئاخۆ خۆ بەس یەك جارم نەبینی, جارێك بە تەنیشتی دا ڕۆیشتم و ئەوكات سەیرم كرد! جارێكی دیكەش لە شوێنێك لەناكاو ئیستۆپی گرت و شوەكەشت دابەزی! منیش لێیان تێپەڕێم و كەمێك لەولاتر ڕاوەستام. لەوێش هەر دیتم! دواتر مێردەكەت شتێكی وەك ئاومیوە بوو, نازانم نە شیرمۆز بوو كڕی و دواتر سواری سەیارە بۆوە! هەر بۆیە دەڵێم: لە سەدا هەشتا بۆ نەوەد خۆیەتی! خوشكێ گیان ئەم جۆرە ئافرەتانە هەر لە دوورەوە باڵایان هاوار دەكا, ئیشیان چییە! هەموویان...

ـ سوپاس كاك مەنسوور !

(( ڕسمەكەم لێ وەرگرتەوە و لە باخەڵی چارشێوەكەم دوو هەزار تمەنم دەرهێنا پێم دا! كە بە تكا و ڕەجا وەری گرت و خوا حافیزی كرد و ڕۆیشت! منیش

دانیشتم! تازە چم پێ دەکرا؟! دەردەکەم بە کێ بڵێم؟! بە کێی بڵێم؟! کە خوشکەکەم بووەتە هاوڕێی مێردەکەم!!! ئەگەر ڕاست بێ, کەوایە دەبێ متمانە بە کێ بکەی لەم دونیایە؟! چ کەسێك لە خوشك نزیکترە؟! یانی ڕاستە؟! تۆ بڵێی مەنسوور هەڵەی کردبێ؟! بەڵام چەن هەڵە؟! گریمان ڕووخساریشی بە تەواوی نەدیوە, ئەی سەیارەکەی؟! مەگەر دەکرێ هەم ڕەنگی سەیارەکە ڕاست بێ و هەم وێنەکە بناسێ؟! ئاخر بۆچی تینا؟! بۆچی؟! لەسەر ئەو هەموو داواکارییانەی کە من شەڕم لەگەڵ دەکردی لەسەریان, کە بۆچی ڕەتیان دەکەیەوە؟ شوەکەی منت هەڵبژاردووە؟! ئاخر بۆچی؟! بۆچی تۆ؟! بۆچی بێهروز؟! شەرمت لە من نەکرد؟! لەو شیرەی کە پێکەوە خواردوومانە! لەو خوێنەی کە لە دەمارەکانمان دایە! لەو یارییانەی کە بە منداڵی پێکەوە دەمانکردن! لەو ڕۆژانەی کە هەموو کات لە پشتت بووم و یارمەتیم دەدای! ئاخۆ چۆن توانیت ئەم کارە بکەی؟! ئاخر چیت پێ بڵێم؟! چۆن ڕازیی بووی کە ماڵ و حاڵ و مناڵەکەم لێ تێك بدەی؟! ئەو ماڵ و حاڵەی کە دە ساڵ بە بەدەبختییەوە دروستم کردبوو! شەرمت لە سوگێل نەکرد؟! ئەو سوگێلەی کە شەیدای تۆیە! شەرمت لە دایکمان نەکرد؟! شەرمت لە ڕوحی باوکمان نەکرد؟! ئۆف! ئۆف! ئۆف! بچم بە کێ بڵێم خودایە؟! خوایە گیان! خەریکە دڵم شەق دەبات! ئێستا هەر بڵێ و داوا بکە! ئاخۆ چۆن چۆنی؟! کاتێك خوشکی مرۆڤ, مێردی مرۆڤ خیانەت لە مرۆڤ بکەن, مەگەر دەکرێ بە باشی بمێنییەوە؟! ئۆف! ئۆف! خوایە گیان! چۆنە هێشتا دونیات لەسەر پێی خۆی وەستاوە؟! چەند ساڵە ئەمانە پەیوەندییان پێکەوە هەیە؟! چەند ساڵە من وەك گێلان گاڵتەکانیانم پێکەوە دەدیتن و لە کاتێکدا ئەو بێ شەرمە لەگەڵ خوشکی خێزانەکەی خەریکی ڕابواردن بووە! ئەو ماوەیە چەندە پێم پێکەنیون! تینا! تینا! تینا! تۆ تەنها بەس بوو

ئیشارەیەك بكەی, تا سەد كوڕ بڕژێنە بەرپێت! ئەو كوڕانەی كاك بێهروز نەدەبووە بچووكی ئەوانیش! ئاخر چت لەو بێ حەیایە دیوە؟! هەرچی چۆن بێ ئەو دە ساڵ لە تۆ گەورەترە! خوایە گیان! ئیدی چۆن خۆم ڕاگرم؟! كاتێك ئەو بێ شەرمە وەفای لەگەڵ من نەبێ كە ژنیشیم؟! چۆن وەفای بۆ تۆ دەبێ؟! دەستم بە دەم و چاوم گرت و دەستم بە گریان كرد! ئەویش چ گریانێك! هەمیشە ئاواتم بوو كە دەستم بەو ژنە قەحبەیە بگا كە ژیانی لێ تێك داوم! حەزم دەكرد بزانم كێیە؟! ئێستا كە زانیومە چم پێ دەكرێ!؟ ئەگەر نەناسیاوێك با, حەتمەن دەمكوشت! وەلێ ئێستا چی؟! هەتتا شەرمیش دەمگرێ كە شتێكی ئاوا لە زەینمدا بێنم و ببەم! وای ئەگەر بمەوێ بە خوشكم بڵێم تۆ هاوڕێی شوەكەمی! وای ئەگەر داكم بزانێ! حەتمەن جەڵتەی لێ دەدا! خوایە گیان چی بكەم؟! خوایە گیان! ڕێیەكم پێشان بدە! ئەوەندە لەوێ دانیشتم و گریام, كە سوگێل لە سەرەوە بانگی كردم! خێرا هەستام و فرمێسكەكانم سڕینەوە! دەستم بە قاڵدرمەكان گرت و بە هێمنی چوومە سەرێ! دەترسام لە هەر چركەساتێكدا لە سەرەوە بكەومە خوارێ! پێكانم هێزی كێشمیان نەبوو! هەتا گەیشتمە زاری دەرگای باڵەخانە, خێرا سوگێل هاتە دەرێ و گوتی))

– چی بووە دایە؟! بۆچی دەگری؟!

ـ هیچ گیانەكەم!

– توخوا چی بووە دایە؟!

ـ هیچ گیانەكەم! برادەری هاوڕێیەكم, هات پێی گوتم كە هاوڕێكەت مردووە! هاوڕێیەكی ئازیز! وەك خوشك!

– كامە هاوڕێیەت دایە گیان؟!

ـ تۆ نایناسی گیانەكەم!

((دواتر دەستیم گرت و پێکەوە چووینە ژووریّ و دیسان ناردمە سەر دەرس و نووسینەوەکانی و بۆخۆشم چووم حەبێکم خوارد و چووم نووستم!

دوو سەعات خەو کەمیّ ئارامی کردمەوە, کاتێك سوگێل وەخەبەری هێنام, نەمدەزانی چ کاتێکی ڕۆژە! لە شوێنی خۆم هەستام و چوومە چێشتخانە دانیشتم. سوگێلی فەقیر زۆر ناڕەحەت بوو! هەر دەیگوت: دایە ئاوت بۆ بێنم؟! دایە میوەت بۆ بێنم؟! دایە...

دەستێکم بە سەری دا هێنا و گوتم: حالّم باشە. بەلّام چ باشێك؟ زۆر بە جوانیی دیمەنە ناشیرن و پیسەکان دەهاتنە ناو خەیالّمەوە! ئەو دیمەنانەی کە بێهروز و تینا پێکەوە تێیدا...!

ئەسلّەن نەمدەویست ئەم شتانە لە خەیالّمدا وێنا بکەم! هەستام و بە بۆنەی چوونە بازاڕەوە لە مالّ وەدەرکەوتم. هەر وا دەستم بە ڕۆیشتن کرد لە جادەکاندا! ئەی دەبوو چیم کردبا؟! پەردە لەسەر خیانەتەکەی تینا دانێم؟! ئەگەر ئەو لە جێی من با, هەمان کاری دەکرد؟ بە چ حەقێك یاریی بە ژیانی من کردووە؟! باشە گریمان خوشکم بوو! ئەو شتەی ئەو کردوویەتی لە دووژمنێك چاوەڕوان دەکریّ, نەك خوشك! بۆچی نابیّ تۆلّەی لیّ بکەمەوە؟! لە پێش چاوی دایکم حەیای ببەم؟! ئاوا خۆ دایکم جەلّدە لێی دەدا و دەردەسەرییەکەی بۆ من دەبیّ! بچم ئەوەندە لێی بدەم تا بمریّ؟! ئاخر دەتوانم چی لیّ بکەم؟! ئەدی ئەو بێقیمەتەی دیکە چی؟! منیش وەك خۆی هەلّسوکەوتی دەگەلّ بکەم؟! جاخۆ لە من ناوەشێتەوە کە وەك ئەو بم! ئەی چیم لە دەست دیّ تا بیکەم؟! ئۆف دایە, بابە! خۆزگە ئاوا منتان پەروەردە نەکردبا! خۆزگە ئەوەندە خاتوون و نەجیب و بە ئابڕووتان پەروەردە نەدەکردم! ئەوکات دەمزانی چی لەو بێهروزە خوێڕییە

بکەم! بەڵام مەگەر تیناشتان وا پەروەردە نەکردبوو؟! ئەی بۆچی ئەو وەکو من نییە؟!

ئۆف خوایە گیان! یارمەتیم بدە! خەریکە شێت دەبم! شتێك خەریکە لە ناوەوە دەمهاڕێ! حەز دەکەم هەر چۆنێك بێ تۆڵە بکەمەوە! تۆڵەیەکی قورس! تۆڵەیەك بەڵکو دڵیان بسوتێنێ! تۆڵەیەك کە...!

ئەسڵەن کێ مافی کارێکی لەم شێوەیەی بە تینای ناجسن داوە؟! کێ مافی ئەوەی پێ داوە, ئەوەی کە هی منە بیکاتە هی خۆی؟! بۆچی نابێ تۆڵەی لێ بکەمەوە؟! مەگەر ئەو کاتانەی کە منداڵ بووین, بۆ نموونە دەچۆ زگ کتێب و دەرسەکانم و دانەیەکی هەڵدەگرت, بە زۆری لێم وەرنەدەگرتەوە؟! ئێستا بۆ نابێ ئەم کارە بکەم؟! چ جیاوازییەکی هەیە؟! خۆ ژیانم زۆر لە دەفتەر و کتێب بەنرختره! ژیانی منداڵەکەم! داهاتووی!

ئۆف خوایە گیان! چی دەکەم؟! هەڵگرتنی کتێب و دەفتەر شەرمەزاریی نییە! شەیتانییەکی منداڵانە بوو, بەڵام ئەوەیان!

خوێڕی بێزارم لێت! تینای ناجسن بێزارم لێت! سەد جار زیاتر لێت بێزارم! ئەگەر نەناسیاو بای, کەمتر لێت بێزار دەبووم, بەڵام ئێستا نا! حەز دەکەم بمری! حەز دەکەم ئیدی نەبی! ئەگەر داکم زیندوو نەبا, نەمدەهێشت یەك دەقیقەش لە ژیاندا بی و پێم پێ بکەنی! وەك قەحبانت لێ هاتووە! هەر ئەوەت لێ دەوەشایەوە! تۆ زبڵی! هەتا قەحپەش خیانەت لە خوشکی خۆی ناکا! تۆ ئاژەڵی! بەداخەوە بۆ ئەو هەمووەی کە دەگەڵت باش بووم! لەگەڵ هەردووکتان! هیچ و پوچانە!

(( کەمێ دواتر, نەمزانی چی بوو! هەموو شوێنێك تاریك بوو! دەتگوت لەناکاو گڵۆپی هەموو ماڵ و جادەکان کوژانەوە! هیچ شوێنێکم نەدەدی! چوار دەورم

هەموو تاریکیی بوو و دەنگی غڵبە غڵب و نارِونم بەر گویٚ دەکەوت! لەشم قورس ببوو! هەتا نەمدەتوانی دەستیشم بجوڵێنم! دەتگوت کەوتومەتە شوێنێکی وەك قیرِەوە! هەر وا خەریك بوو بە ناویدا رِۆدەچووم! هیچ پەلەقاژەیەکیشم نەدەکرد! واتا نەمدەتوانی هیچ کارێك بکەم! هەموو شوێنێك تاریك بوو! خەریك بوو رِۆدەچووم و هیچ شتێکیش نەبوو کە دەستی پیٚ بگرم و خۆی پێوە رِاگرم! خەریك بوو دەمردم!

لەناکاو لە سەرووی خۆمەوە نوورێکم دیت! رِووناکییەك! دەستێکی بچکۆلە!))

- دایە! دایە گیان! دایکە گیان!

(( دەستی چکۆلەی کچەکەم بوو! دەستیم گرت! بە زۆر خۆم هەڵکێشا و چاوەکانم کردنەوە! سوگێلیش لەسەر سەرم رِاوەستابوو! نا! سوگێل نەبوو! دەنگی سوگێل بوو! بۆخۆی نەبوو! لە دەوروبەریشی چەند کەسێك هەبوون کە بە خێرایی خەریکی بە ئەنجام گەیاندنی کارێك بوون! هەموو جلێکی سپییان دەبەر بوو! دەست و سەرم شتیان پێوە وەسڵ کرا بوو! ئۆکسجینم لەسەر دمی بوو! ئیدی لە هەموو شتێك گەیشتم! لە نەخۆشخانە بووم! کاتێك سەریان سورِاندم چاوم بە سوگێل کەوت کە لە دەریٚ رِاوەستابوو و خەریك بوو دەگریا! دەنگی گریانەکەی رِزگاری کردم! لە نێو ئەو هەموو جەنجاڵییە تاریکەدا, رِزگاری کردم!

ئەو شەوە لە نەخۆشخانە مامەوە و بۆ بەیانیی دەریانکردم! گوتبویان کە تورِەیی کاریگەریی لەسەر بووە! کاتێك چوومەوە ماڵیٚ, لە رِێگە سوگێل بۆی باس کردم کە چی بووە؟! کاتێك زانیویەتی نەهاتوومەوە ماڵیٚ, تەلەفونی بۆ ئەو خوێرییە کردووە, بەڵام بۆخۆی دڵی تەحەمولی نەکردووە و لە ماڵیٚ هاتۆتە دەریٚ و لەسەر جادەکان بە دوای مندا گەرِاوە! بەو هەموو منداڵییەیەوە, بەو تاریکە شەوە

بەدوای مندا هاتووە! بە گریە و زار و گەڕان بەدوامدا گەڕاوە, تا ئاخیرەکەی دیومیەوە! دایکی دیتۆتەوە! دواتر هەر لەویّ بە گریانەوە سەیارەیەکی ڕاگرتووە و هەندێ خەڵکی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە و گەیاندوومیەتە نەخۆشخانە و هەر لەوێرا تەلەفونی بۆ ئەو خوێڕیە کردووە!

ئۆف خوایە گیان! کەواتا هێشتاش باشیی هەیە! عەشق هەیە! خۆشەویستیی هەیە! وەفا هەیە!

دوو سێ ڕۆژ لە ماڵێ مامەوە و پشووم دا. ئەو بێقیمەتەش هەر دەهات و دەچوو و بۆ نموونە پێشوازیی لێ دەکردم! نەچۆ سەر ئیشێش! نازانم ئەو حەیوانە ویژدانی ئازاری دابوو, یان دیسان دەیویست فێڵم لێ بکات! بە تایبەت کە پێم گوتبوو بە دایکم و ئەوان نەڵێت! دەمزانی ئەگەر بزانن, خێرا خۆیان دەگەیاندێ و حەزیشم نەدەکرد لەو دارەتەدا چاوم بە چاوی ئەو خوشکە خیانەتکارە بکەوێ!

هەرچی چۆن بێ شەممە ئامادە بووم کە بە کارەکانم ڕا بگەم! زۆر وەدوا کەوتبووم! بە تایبەت ئیشی ئەفسانەی! لەو چەند ڕۆژەدا ئەو هیچ و پوچە هەر دەڕۆیشت و دەهاتەوە دەیگوت: ئیشت زۆرە دەبێ کەمی بکەیەوە! لە هەر دە ڕستەیەك کە دەیگوت, تەنها یەکیانم جواب دەدایەوە! ئەویش بە زۆر!

خولاسە چوومە دوو شەریکە و کارەکانم بە ڕێکوپێکی کردن و چوومە سۆراغی ئەفسانە!

**شریتی هەشتەم**

**شەممە سەعات هەشت و نیوی بەیانی, ڕێکەوتی... گرتووخانەی ژنان..., فایلی ژمارە..., ناو: ئەفسانە...**

- نەتگوت بۆئەوەندە کز بووی؟!

- کز بووم؟!

- بەڵێ! شتێك بووە؟!
ـ نا, وەك ئەوانی دی!
- هێشتا هیچت نەکردووە؟
ـ وەك چی؟
- تۆڵە!
ـ نا! هێشتا نا!
- بیریشت لێ نەکردۆتەوە؟
ـ بۆ نا, زۆریش!
- ڕووخسارت زۆر لاواز بووە! ڕەنگیشت پەڕیوە!
ـ لەوانەیە چاوەڕێی لەوە خراپتریش بم!
- ئێمە هەموومان یەك جار دەژین! خۆت ئاسوودەکە!
ـ بە خۆکوشتن؟
- نا! نا! مەبەستم ئەوەیە کە خورافیات وەلانێ و چێژ لە ژیانت وەربگرە! هەر ئەوەندە!
ـ ئێستا با بگەڕێینەوە سەر ژیانی خۆت! بڵێ بزانم ئاخیرەکەی چی بوو؟!
- سڵاو ئەی ئەو کەسانەی کە دوای من گوێ لەو شریتە دەگرن! لەوانەیە ئەمە دواین دانپێدانانەکانی من بن!
( دەنگی پێکەنین)
ـ باشە ئێستا با جددیی بینەوە! لە بیرتە هەتا کوێم بۆ باس کردی؟
ـ لە باڵەخەنەکەی هاتییە دەرێ.
بەڵێ. هاتمە دەرێ. هیچم بۆ نەمابۆوە! هیچ کەسایەتییەکم نەبوو! پوچی پوچ! گێژ! گێژ! لەناوچوو! کۆتاهاتوو! هەستم دەکرد قیامەتم لێ داهاتووە! پێم وا

بوو نرخم نەماوە! شتێك كە سوودیان لێ وەرگرتووە و دواتریش زۆر بە سادەیی دوور فڕێیان داوە! وەك گاڵتەجاڕێكم لێ هاتبوو! ئیدی نە بیرم لە سوهەیل دەكردەوە و نە بە خوازبێنی و نە بەو شتەی كە لەگەڵی كردبووم! لەو كاتەدا تەنها لە بیری خۆمدا بووم! لە بیری ئەوەی كە دەبێ چی بكەم؟! دەمزانی ئەو شتانە كەسانێكیان هەیە كە بە عەمەلیاتێكی بچووك هەموو شتێك وەك سەرەتا لێ دەكاتەوە! وەلێ نەمدەزانی لە كوێی وەبینم!

لە كۆڵانەكەیان هاتمە دەرێ بۆ سەر جادەی سەرەكی, تا سواری تاكسییەك بم! سەیارەكان بە پێشمدا دەهاتن و دەچوون! هەندێكیان هۆڕنیان لێ دەدا و كە دەیانزانی هیچ كاردانەوەیەكم نییە, وەڕێ دەكەوتن و دەڕۆیشتن! هەر بەڕاست لەو كاتەدا فكرم لەوە دەكردەوە كە خۆ هەڵدەمە پێش ئەو سەیارەی كە بە خێرایی ڕێ دەكات و هیچ نیازی ئیستۆپیشی نییە! زۆر بە خۆمم گوت: دەتوانم ئەو كارە بكەم. یەك دوو جاریش تەكانێكی چكۆلەم بە پێكانم دا, بەڵام نەكرا! غیرەتی ئەوەم نەبوو! زۆر بێغیرەت بووم! بێغیرەت و بێ ئابڕوو! تاكسییەكم ڕاگرت و سوار بووم. نیو سەعات دواتر لە پێش دەركیماڵێمان دابەزیم! دەرگام كردەوە و چوومە سەرێ و دەرگای باڵەخانەم كردەوە و چوومە ژوورێ. شووكا چەند هەنگاوێك هاتە پێشێ و گوتی))

– چی بوو؟!

ـ هیچ!

– نەیگوت بۆ نەهاتوون؟!

ـ دێن!

– دێن؟! كەی؟!

ـ ئەمشەو!

– ئەمشەو؟! دەزانی ئەگەر بابت بزانێ چ دەكا؟!

ـ نا, نازانم!

– ئەوە تۆ چیتە؟!

ـ هیچ!

– لە ماڵێ بوو؟!

ـ كێ؟!

– سوهەیل!

ـ نا!

– ئەی چۆن دەزانی؟!

ـ نازانم!

– ئەفسانە؟!

ـ ها!؟!

– حاڵت باشە؟!

ـ بەڵێ!

– لە ماڵێ نەبوو؟!

ـ نا!

– ئەی لە كوێوە دەزانی كە دووبارە دەیانەوێ بێن؟!

ـ هەموو شوێنێك بەتاڵ بوو!

– چی؟!

ـ ماڵێی. بەتاڵ بوو!

– یانی چی بەتاڵ بوو؟!

ـ شەوێ باریكردووە و ڕۆیشتووە!

- باریکردووە و ڕۆیشتووە؟! بە بێ خەبەر؟!

ـ بەڵێ!

- ئەی بێناموسی بێ شەڕەفی نمەك بە حەرام! دیتت پێم گوتی! چەندە ئامۆژگاریم کردی! چەندم پێ گوتی ئەوە یەکێکە لە حەوت فیتنەکان؟! ئێستا بەختت هەیە کە هیچ بەڵا و مەڵای بە سەرت نەهێناوە! خودا زۆر ڕەحمی پێ کردووی!

(( تەنها سەیرم دەکرد کە هاتە پێش و لە باوەشی گرتم و گوتی))

- ئێستا بڕۆ ئاوێك بە دەم و چاوت داکە و وەرەوە قاوەت بۆ دروست بکەم بێیەوە سەر خۆ!

ـ نا, تاقەتم نییە!

- دە باشە بڕۆ ڕاکشێ. هەموو شتێکیش لەبیر بکە! وەك نە بای هاتبێ و نە باران! وەرەوە سەر دەرسەکانت! ئیشەڵڵا کە چوویە زانکۆ, ڕۆژێك سوهەیلێکت بۆ پەیدا دەبێ!

(( چاوێکم لێ کرد و چوومە ژوورەکەم و جانتاکەم هەڵدا گۆشەیەك و هەر بەو جلانەی دەبەرم بوون, خۆم هاویشتە سەر قەڕەوێڵە! سەیر لەوەدا بوو کە ڕێك خەوم لێ کەوت!

درێژ دادڕیە نەکەم! وەزعی ماڵەوە وردەوردە حاڵەتی ئاسایی خۆی وەرگرتەوە و هەموو شتێك لە یاد کرا! بۆ منیش هەر وا! بەڵام تەنیا باسێك کە هەبوو, پەیداکردنی کەسێك بوو, کە بتوانێ خوێڕیاتەکەم وەك خۆی لێ کاتەوە!

بۆخۆم کەمێکم پارە هەبوو. ئەو ئەنگوستیلەیەشی کە سوهەیل وێی دابووم هەڵمگرت و بردم بیفرۆشم. هەرچەندە پێم ناخۆش بوو, بەڵان چارەیەکی دیکەم نەبوو! بیستبووم نرخی ئەو کارەش گرانە!

ئەو ئەنگوستیلەی کە پێی دابووم, زیوەکەی لە ئیش کەوت و ئەڵماسەکانیشی ساختە! ئەوەش یەکێك لە باقی کارە بێشەڕەفەکانی سوهەیل!

ئیدی هیچم لە دەست نەدەهات! هەر دەبوو بابەتەکەم بە شوکا بڵێم! بەڵکو هیچ نەبێ پارەیەك شتێك, بە هۆکارێك لە بابم وەرگریٚ! لێشی دڵنیا بووم کە نهێنیی پارێزە و نهێنییەکەم ئاشکرا ناکا!

چەند ڕۆژێك تێپەڕی! هەر دەستاو دەستم دەکرد! نازانم بۆچی؟ لەوانەیە تاقەتی ئامۆژگارییەکانی شوکام نەبووبیٚ! کاریش لە کار ترازا بوو و چەند ڕۆژێکیش ئەم بەر و ئەو بەر جیاوازیی نەبوو! هەر بەڕاست لە دڵەوە هێشتا باوەڕم بە ڕۆیشتنی سوهەیل نەبوو! نازانم بۆ هەر بیرم دەکردەوە کە دەگەڕێتەوە!

تەقریبەن دوو هەفتە بەسەر باسەکەدا تێپەڕی کە شەوێك نزیکەی سەعات دە دەنگی تەلەفون هات. من لە ژوورەکەم دا بووم و هەر لەوێڕا جوابم دایەوە کە لەناکاو سڕ بووم! سوهەیل بوو!))

– ئەلوو ئەفسانە!

- ئەلوو!

– ئەفسانە!

- سوهەیل!

– سڵاو! چۆنی!؟

(( هەڵوەستەیەکم کرد کە گوتی))

– ئەلوو! لەوێی؟!

- زۆر ناپیاوی سوهەیل!

– سەیر کە ئەگەر بتەویٚ ئەو قسانە بکەی, دایدەخەمەوە هاا!

- هەر غەڵەتێکت حەز لێیە بیکە! بەڵام ئەوە بزانە کە زۆر ناپیاوی!

(( لەناکاو دەنگی بابم لە هۆڵەکەوە بەرز بۆوە ! ))

– کێیە ئەفسانە ؟ !

(( خێرا گوتم))

ـ هاوڕێیەکمە بابە گیان !

(( دواتر بە هێمنی بە سوهەیلم گوت))

ـ ئێستا ئەوە دەزانم کە لەسەر سفرەی بابت نانت نەخواردووە ! نمەك بە حەرام !

– دایدەخەمەوە ها ! !

ـ ئیدی لە سەرووی ڕەشەوە ڕەنگێك نییە ! تازە هیچ جیاوازییەکی نییە ! حەیات بردم !

– مەگەر چیم کردووە ؟ !

ـ سوهەیل ! دڵنیابە سزای ئەو کارە وەردەگرییەوە کە دەگەڵ منت کرد !

– بۆچی هاتی؟ ! خۆ بە زۆر نەمهێنای ! چاوت کوێر!

ـ دڵنیابە بە نەحلەتت دەکەم !

– جارێ من ئەوە لە ئەمریکام ! هەر کارێکت دەوێ بیکە !

(( دواتر دەستی کرد بە پێکەنین , کە لە پڕمەی گریانم دا و گوتم))

ـ ئیشەڵڵا پارچە پارچە بی سوهەیل ! هەموو شەوێك ئارەزووی مەرگت بۆ دەخوازم !

– هەرچەند حەز دەکەی ئارەزوو بکە !

ـ لەناوت بردم سوهەیل ! ناپیاوی خوێڕی ! بڕۆ ون بە ! تەلەفونیش بۆئێرە نەکەیەوە , گەواد !

– من تەنها دەمویست خوا حافیزیت لێ بکەم, ئێستا مادام ناتەوێ, نەتەوێ ! بەڵام ئەوەندەش وەك دایکم ناز و نووز مەکە !

(( ئەوەندە تورە ببووم کە حەزم دەکرد لەسەر تەلەفون هاوار بکەم, بەڵام نەدەبۆیە, هەر بۆیە بە هێمنی گوتم))

ـ خوێڕی پێت وایە هەموو وەکو دایکی تۆن؟!

– بۆ مەگەر وا نین؟! هەر ئەو ژنەی بابت مەگەر وا نییە!؟ هەرئەوەی کە وەزعەکەی بۆ ڕێك دەخستی و کاتێك دەهاتیە کن من بابت نەزانیّ! کەسێك ئەو قسانە دەکا کە بۆخۆی دایکێکی پاك و بێگەردی هەبێت!

(( ئەوەی گوت و دەستی بە پێکەنین کرد! لە تورەییان نەمدەتوانی جوابی بدەمەوە! ئەگەر لەو کاتەدا لەویّ با, حەتمەن دەمکوشت! بۆساتێك بێدەنگ بوو کە گوتم))

ـ سوهەیل! تەنها ئەوە بزانە کە! لە قوڵایی دڵەوە خۆشمویستی و ئامادە بووم هەتا کۆتایی تەمەنم هەر کارێکت بویّ, بۆتی بکەم! وە دڵنیاش بە کە عەشقێك وەك عەشقی من, تا ئەو ڕۆژەی لە ژیاندای, نایدۆزییەوە!

من...!

(( ئیدی نەمزانی چ بوو! لەناکاو هەستم بە سووتاوییەك کرد لە سەرمدا و دواتریش شلەیەکی گەرم کەوتە ملمەوە! هەتا ئاوڕم دایەوە, دیتم بابم ئەوکی گرتووم! خەریك بوو دەیخنکاندم! تەنها گوێم لە جنێوەکانی بوو کە پێی دەدام! دواتریش چاوم لەسەر یەك دانران و نازانم چی ڕووی دا!

(بێدەنگی)

ـ دواتر لەوانە تێگەیشتم! کاتێك بابم دەبینیّ کە بە تەلەفون قسە دەکەم, بە هێمنی دەچێتە ژوورەکەی خۆی و تەلەفونەکەی ئەویّ هەڵدەگریّ و گویّ دەگریّ! لەو قسانەی کە ئەو خوێرییە باسیان دەکا, بە تەواوی تیّ دەگات و هێرش دێنێتە ژوورەکەی من! یەکەم شت کە وەبەر دەستی دیّ, ئەو سەعاتە بوو کە لەسەر

مێزەکەم دانابوو, ڕێك هەڵیدەگرێ و لەسەری منی ڕادەکێشێ! دواتریش ئەوە من لە ترسان لە هۆش دەچم!

نیو سەعات دواتر وەهۆش خۆم هاتمەوە! شوکا لەسەر سەرم بوو و دەگریا! لە مەجالێکدا خۆی گەیاندووە, دەنا بابم دەیخنکاندم! کاتێك دەستی لە دەوری ملم دەکاتەوە, بابم شەقێك دەویش هەڵدەدا و دەبێتە گریە و زارو و لە ماڵێ دەچتە دەرێ!

ئیدی نەگەڕایەوە ماڵێ. ڕۆژی سێیەم بوو یەکێك لە خزمەکان, کە پەیوەندیدار بە هاوسەرگیریی بابم و شوکاوە بووە, بە شوکای گوتوە کە بۆ تەڵاق ئامادە بێت!

ئەو فەقیرەش هیچ قسەیەکی نەکردبوو! ناچار بوو! ڕازیی بوو! دوو هەفتە دواتر لێك جیا بوونەوە و بارگەی پێچایەوە و ڕۆیشت!

ئاوا بە ئاسانی!

کاتێك بە تەنیا مامەوە, زۆر گریام! خووم پێوە گرتبوو! لەوانەشە خۆشمویستبێ! هەرچەندە کە هەر بەڵایەك بەسەرم دەهات, ئەو هۆکارەکەی بوو! لەوانەشە نا! بەڵێ, هۆکاری هەموویان ئەو نەبوو! زیاتر خۆم بووم! ئەو فەقیرە بۆ ئەوەی دڵی من بەدەست بێنێ و بە وتەی پێشینان جێیەك بۆخۆی توند کا لە ماڵێ, ئەوەی کرد! کاتێك لەسەر تەلەفون سوهەیلی خوێڕی ئەو قسەیەی کرد, بابم تێگەیشت کە شوکا ئاگای لە هەم و کەین و بەینەکی هەبووە! زۆرم زگ پێ سوتا!

( بێدەنگی)

- ئێ ؟!

- تەواو ئیدی! ئەو ڕۆژەی کە شوکا بە چاوی گریانەوە لە ماڵێمان ڕۆیشت, بۆ شەوەکە بابم هاتەوە ماڵێ! هەر دەرگای کردەوە و هەر لەوێڕا هاواری کرد و گوتی))

ـ ئەی... هەر کاتێك من دێمەوە ئەم ماڵە و گوێت لە دەنگی دەرگا بوو, دەچییە ژوورەکەت و نایە دەرێ! هەتا من لە ماڵێدا بم شوێنت ئەوێیە!

(( سەرم دەبەر خۆم نا و چوومە ژوورەکەم. بابیشم جلەکانی گۆڕین و چوو لێی نووست. ئیدی بۆت باس ناکەم لەو کاتەدا چ حاڵ و وەزعێکم هەبوو! چ ژیانێك! چ دەردەسەرییەك!

بۆ بەیانییەکەی کە لە خەو هەستا, جلی دەبەر کردن و چۆ دەرێ و دوای نیو سەعات بەخۆ بە قفڵ و کلیلەیەکەوە هاتەوە. قفڵی دەرگاکەی گۆڕی و قفڵێکی دیکەشی بۆ زیاد کرد. ڕێك وەك زیندانییەکی عەیارم لێ هات! بەیانیی بۆ بەیانی کە دەیوست لە ماڵێ بچێتە دەرێ, سەرەتا تەلەفونەکەی ماڵێی لە جانتاکەی داویشت و قفڵی دەدا و دواتریش دەرگای ماڵێشی هەر قفڵ دەدا و دەڕۆیشت. ئیدی من لەو باڵەخانەیەدا زیندانیی بووم تا شەوێ دەگەڕایەوە! هیچیشی لە ماڵێ نەدەخوارد. یەك دوو جار خواردنم دروست کردبوو, کە ئەگەر شەوێ هاتەوە بیخوات و وردەوردە ئاوا لەگەڵم چاك بێتەوە, بەڵام نەیکرد! هەردوو جارەکە کە هاتبۆوە چێشتخانە و دیتبووی کە قاپێکم خواردن بۆ داناوە, ڕێك بردبووی لە تەنەکەی خۆڵەکەی کردبوو!

دەمزانی بابم زۆر ڕق لە دڵە! ئەگەری نەبوو بەو زووانە شتی لە بیر بچێتەوە! حەقیشی بوو! حەیام بردبوو! ئەو لە بەرانبەر مندا خراپ نەبوو و بگرە زۆریش ماندوو ببوو پێمەوە, وەلێ من لە جێی ئەوەی قەدری بزانم و پێی بزانم, حەیام

بردبوو! دەبوو ئەو سزایەش وەرگرم! دیسان پێم زۆریش بوو کە هێشتا زیندووم! زیندانی مافی خۆم بوو! کەسێك کە سنووری ئازادی بشکێنێ, هەر ئەوەی قابیلە! ئێستا زیندانیی بوون لە لایەك, گریانەکانی بابم لە لایەکی دی! هەندێ شەو لە پشت دەرگاوە گوێم لە گریانەکەی دەبوو! ئەوکات بوو کە دەمویست خۆم بکوژم! چ ئاژەڵێك بووم من!

(بێدەنگی)

ـ ئێستا ئاخیرەکەی چی لێ هات؟

- دوو سێ حەوتوو دوای ڕۆیشتنی شوکا, بەیانیی ڕۆژێك بابم هاتە پشت دەرگا و گوتی:

- سەعات دە! دەچیە ئەو ناونیشانەی کە نووسیومە لەسەر مێزەکە! تێگەیشتی؟!

((ئارام لەودیو دەرگاوە گوتم))

- بۆ کوێ بچم بابە گیان!

(( لەناکاو هاواری کرد و گوتی))

- لەو شوێنەی کە گوەکەتی لێ بشۆنەوە قەحبە!

(( دواتریش مستێکی لە دەرگا دا و گوتی))

- بێ حەیا! بێ ئابڕوو! نانەجیب! قەحبە! ...!...!

(بێدەنگی)

- خەریك بوو بمرم لە شەرمان! خۆزگە دەهات ئەوەندەی لێ دەدام تاکو بەڕاستیی دەمردم! ئاوا قایلتر بووم!

تا پێش ئەو ڕووداوە عاشقم بوو! ئەفسانەیەکی دەگوت و سەت ئەفسانەی لە زاریەوە دەهاتە دەرێ! چەندە ئاگای لێ بووم! چەندە خۆشیدەویستم, بەڵام منی وڵاغ قەدری ئەو هەموو ئارامی و ئاسایشەیماڵێم نەدەزانی! بەس خوا

دەزانیٚ چەند لە کارەکەم پەشیمان بووم! چەندەم نەفرەت لە خۆم و سوهەیل و کەمێکیش شوکا دەکرد! خولاسە لە ژووریٚ هاتمە دەریٚ و چوومە چێشتخانە و ئەو پەڕەیەی یاداشتی کردبوو, هەڵمگرت. ناونیشانێکی لیٚ نووسرابوو. ئەوەی دیکەشی ئەوە پێویستی بە گوتن نییە! زۆر بە خێرایی کارەکە تێپەڕی! بە شەرمەزارییەوە, بە خەجاڵەتییەوە, بە حەیاچوونەوە و شتی دی! هەر خەندەیەك کە بۆم دەکرا, وەك مردن وا بوو بۆم! جا چ بگا بە بابم حاڵی چۆن بووە!

(بێدەنگی)

- بەسە ئیدی! مەگریە!

- بە دەست خۆم نییە تەرانە! تۆ نازانی چەندە پەشیمانم!

(بێدەنگی)

.....

- هێور بوویەوە؟!

- ئهم!

- ئێستا باقیەکەی بڵیٚ!

- مانگێکی دیکە تێپەڕی, تا ئەوە بوو ڕۆژێکی عەسر بابم گەڕایەوە ماڵیٚ و من خێرا چوومە ژوورەکەی خۆم و دەرگام داخست. نزیکەی نیو سەعات دواتر بینیم کە دەرگای ژووریٚ کرایەوە. سەرەتا پێم وا بوو کە بۆخۆی کراوەتەوە! خێرا هەستام کە تا بابم دەنگی لێوە نەهاتووە, دایخەم! کە لەناکاو بابم گوتی))

- وەرە دەریٚ!

(( پێم وا بوو ئیدی سزاکەم تەواو بووە, بەڵام دەنگی بابم هێشتا تورە و پڕ نەفرەت بوو!

خولاسە چوومە دەریٚ! بە بیٚ ئەوەی کە سەیرم بکات گوتی))

ـ ئەمشەو دێنە خوازبێنیت! حازر بە!

((هەر ئەوەندە! ئەوەی گوت و خەریك بوو دەچۆ ژوورەکەی خۆی کە بە هێمنی گوتم))

– کێنە بابە گیان؟

(( لەناکاو هاواری کرد و گوتی))

ـ هەر خوێڕییەکی هەیە! بێ قسە و پێچ و پەنا و بەهانە, دەبیە ژنی و بڕۆ بە دوای کاری خۆتدا! ئەگەر نەشتویست, بەخێرێی! ئیدی لێرە جێت نابێتەوە! بڕۆ کن ئەو خوێڕیانەی وەك خۆتن!

(( دواتریش چۆ ژوورەکەی توند دەرگاکەی پێکدادا! ئەسڵەن واقم وڕ مابوو و نەمدەزانی چ خەبەرە! نەمدەزانی خوازبێنیکار کێیە و لە کوێوە پەیدا بووە! بەڵام تازە چ جیاوازییەکی هەبوو!؟ هەرچییەك بوو لە زیندانیبوونەکەم باشتر بوو. حەدی ئەقەل ئازادییەکی بۆ دەستەبەر دەکردم! هەمان ئەوکاتیش لەبەر خاتری ئەو لەو ژوورە ئازاد کرابووم!

خێرا چوومە لای ئەو میوانەی بابم کڕیبوونی و شردمن و دواتر شیرنییەکانم لە قاپێکدا ئامادەکردن و بۆخۆشم چوومە حەمام. دەمویست جۆرێك بێ کە خوازبێنیکار هەڵنەیەت و بڕوا!

تەقریبەی سەعات حەوت بوو کە ئامادەبووم. پۆشتە و ئارایشی! سەعات حەوت و نیوی تەواو بوو کە داواکارەکان هاتن. پرێژنێکی نزیك پەنجا و شتێك ساڵە بوو لەگەڵ گەنجێکی نزیك سی ساڵ. بەڵام گەنجەکە کێ بوو؟! هەمان کارمەندی شەریکەی بابم! دیبلۆمێکی باڵا! تۆزێك کز و کەمێك کەچەڵ! سەرەتا وێڵم کرد, بەڵام دواتر بیرم کردەوە! یانی قسەکانی بابمم وەبیر هاتنەوە! یان ئەمە, یان دەرکران لە ماڵێ! منیش ئەمەم هەڵبژارد! هەلبژاردنێکی دیکە لە ئارادا نەبوو!

بابم ئەو شەوە زۆر باش دەوری خۆی گێڕا! سەرەتا گوتی: نەخێر, جاریٚ کاتی مێردی نییە و ڕێزم لە گەنجیت گرت کە تەشریف بێنی و منیش تەنها ئەو کچەم هەیە و نووری چاوانی منە و دوای مردنی من تەواوی سامان و دارایی کە هەمە بۆ وی بەجیٚ دەمێنیٚ و چی و چی و چی!

ئینکاری لە بابم و زۆری و ئیجباریش لە دایك و کوڕە, تا ئاخیری بابم گوتی کە ئەگەر کچەکەم بۆخۆی ڕازی بیٚ, من قسەیەکم بۆ گوتن نییە!

بڕیار بوو کە چەند ڕۆژێکی دیکە جوابیان بدەینەوە. ئەوانیش هەستان و ڕۆیشتن.

سیٚ چوار ڕۆژ دواتریش, کاتێك بابم هاتەوە ماڵیٚ, پێی گوتم: بڕیارە سبەی شەو کوڕە بۆ ئێوارە بێتە ئێرە. قسەکانتان پێکەوە بکەن. جۆرێکیش قسە بکە کە خۆتی لەسەر قورس دەکەی و دواتر جوابی بدەوە! سبەی شەویش نا, بێڵە یەك دوو جار بێت ئەوکات!

منیش مووبەموو, ئەوەی بابم گوتبووی, جێبەجێم کردن. کوڕە ناوی ڕەزا بوو, سبەی شەو هات. میوانداری و نانی ئێوارە و دواتریش بابم چۆ ژوورەکەی و من و ئەویش لە هۆڵەکەدا دانیشتین و دەستمان کرد بە قسەکردن. قسەی گرنگ! هەندێکیشیان بیٚ مانا! هەندێکیشیان جددی! شتی بیٚ تام وە بیٚ مانا کە هەردووکمان پێیان پێدەکەنین! سەعاتێك دواتر مۆڵەتی وەرگرت و ڕۆیشت.

جاری ئەولاتریش چوار پێنج ڕۆژ دواتر بوو! دیسان وەك جاری ڕابردوو. هەمان قسەکان, هەمان ئەو قسە بیٚ مانا و مەبەستەی کە ڕەنگە گرنگ بن بۆ داهاتوومان. هەر ئەو شتانە! دوای سەعاتێکیش مۆڵەت و خوات لەگەڵ!

دوو ڕۆژ دواتر بابم لە شەریکە جوابی بەڵێی پیٚ دابوو و هەزار منەتی بەسەرەوە کردبوو کە ئەو بێدەنگیەی ئێمە لەوانەیە قسمەت بوویٚ و زارمان وا بەستراوە و چی و چی و چی!

دوای مانگێکیش, عەقد و هاوسەرگیریی بە کۆتا هات!
مارەییەکی تەواو, کە بابم گەورەتری کرد و پارەی بارمتەی باڵەخانەیەکی داینێ, چونکە ڕەزا هیچی نەبوو و لەگەڵ دایکی لە دوو ژووری کرێ دا دەژیا.
بەم شێوەیە بابم سۆزی خۆی لە بەرانبەرمدا نواند, هەرچەند کە شایەنی نەبووم.
هەرچی چۆن بێ بە سەربەرزییەوە منی نارده ماڵی مێرد!
شەوی هاوسەرگیریم, هەموو شت بە خێر و خۆشی تێپەڕی و هیچ کەسێك بۆنی قەزییەکەی نەکرد و تەواو بوو و چوو بەدوای کاری خۆی دا! هەرچەندە ویژدانم ئازاری دەدام, بەڵام شوێنی گوێگرتن بۆ ویژدان نەبوو, چونکە ئەم جارەیان حەتمەن بە دەستی بابم دەکوژرام!
ژیانێکی تازەم دەستی پێکردبوو! لەبەر ئەوەی ڕەزاش ببووە زاوای بابم, هەم هەقەکەی زیادی کردبوو و هەم پلەکەشی بەرز ببۆوە لە شەریکەدا! هەرچۆنێکیش بێ, کەمێك کەچەڵ و هەندێکیش لاواز, بەڵام عاشقم بوو!
ڕۆژەکانی سەرەتا لەگەڵ سوهەیل بەراوردم پێ دەکرد, وەلێ هەرچەند تێدەپەڕی, بۆم دەردەکەوت کە چەندە لە سوهەیل پیاوترە! هەر ئەو غیرەت و پیاوەتییەی سەد سوهەیلی دێنا! بە بێ ئەوەی بۆخۆم هەستی پێبکەم, عاشقی ببووم و دوای ماوەیەك کە زانیمان ئەخلاقمان گونجاوە پێکەوە, ویستمان کە منداڵمان پەیدا ببێ!
مانگێك, دوو مانگ, سێ مانگ, شەش مانگ! نەکرا و نەکرا! زۆر ترسابووم! پێم وا بوو کە کێشەکە لە منە! یانی پێم وا بوو لەبەر ڕابردوویە, شتێکم بەسەر هاتووە! هەر بۆیە ڕۆژێك بە بێ ئەوەی بە ڕەزا بڵێم, چوومە دکتۆر. دوای فەحس و چی و چی, دەرکەوت کە من ساغم. کەواتا ڕەزا دەمایەوە! هەرچەند کە دکتۆر

پێی گوتم کە لەوانەیە ئەویش ساغ بێ و بە مرووری زەمەن کێشەکە چارەسەر بێ، بەڵام بۆ من جیاوازییەکی نەبوو!

چاوەڕێم کرد! چاوەڕێم کرد تا ساڵێك ڕۆی و ڕەزا بۆخۆی وە قسە هات! ئەویش حەزی لە منداڵ بوو! ویستم قەزیەکەی پێ بڵێم، بەڵام دڵم نەهات. زۆر پیاو و خانەدان بوو! هەر بۆیە هیچم پێ نەگوت. تەنها ئەوە نەبێ کە پێم گوت دەبێ جارێ چاوەڕێ بکەین و ئەو قسانە. نزیك حەوت هەشت ڕۆژ دواتر، کاتێك لە شەریکە گەڕایەوە، بینیم زۆر غەمبارە! پێم وا بوو لە شەریکە لەگەڵ کەسێك کێشەی هەبێ. چام بۆ تێکرد و بردم لە پێشیم دانا کە گوتی))

- ئەفسانە! دەقەیەك وەرە دانیشە کارم پێتە!

- چی بووە؟

- وەرە دانیشە تا پێت بڵێم!

(( لە کنی دانیشتم کە بە ئارامی دەستی بە قسان کرد!))

- بەڕاستی زۆر بۆ من قورسە کە ئەوەت پێ دەڵێم! بەڵام چارەیەك نییە! سەیرکە ئەفسانە! من زۆرم خۆشدەوێی! بە ئەندازەیەك کە ناتوانی وێنای بکەی! بەڵام شەڕیش لەگەڵ ویستی خودا ناکرێ!

- چی بووە ڕەزا؟

- من چەند ڕۆژ لەمەوبەر چوومە دکتۆر. فەحسم کرد ئەمڕۆش چووم وڵامەکەم وەرگرتەوە. بەداخەوە کێشە لە منە کە منداڵمان پەیدا نابێ!

- یانی چی؟! مەگەر...

- گوێگرە ئەفسانە! ئەوە ڕاستییە!

- دکتۆر چی گوت؟!

- دیسان دەبێ بچمەوە کنی, بەڵام جاریێ ئەوە دەرکەوتووە کە کێشە لە منە! هەر بۆیە تۆ ڕێگەت پێ دراوە و دەتوانی هەر کارێك کە بتەوێ, بیکەی!
- بۆ نموونە چ بکەم؟!
- ئەگەر ویستت, دەتوانی لێم جیا ببیەوە! بە هەموو شێوەیەك مافی خۆتە! بەڵام ئەوە بزانە کە من بە ڕاستیی خۆشمدەوێی! ئەوە لە پیاوەتیی من کەم ناکاتەوە کە ناتوانم وەچە بنێمەوە. کێشەیەك لە سیستەمی لەشی مند هەیە, نەك لە ئەخلاقی تایبەتیم! من پیاوم!

(( تۆزێك بێدەنگ بوو و دواتر گوتی))

- بۆ هەر شوێنێکت ویست لەگەڵت دێم و دەڵێم کێشە لە من بووە! شەرمیش ناکەم! ئێستاش بڕۆ بیر بکەوە و دواتر هەر بڕیارێکی خۆت دەتەوێ, بیدە!

(( ئەوانەی گوتن و هەستا و چۆ سەرئاو. نزیکەی چارەگێکی پێچوو و کاتێك گەڕایەوە, بینیم چاوی سوور بوونەتەوە. زانیم گریاوە. چوومە چێشتخانە و خۆم سەرقاڵ کرد و چوومە فکرەوە. نازانم چۆن بوو لەناکاو حەزی منداڵ چۆ دە سەرمەوە. تا پێش ئەوەی ڕەزا ئەو قسانە بکات, ئەسڵەن بیریشم لێ نەکردبۆوە, بەڵام نازانم بۆچی کە ئەو گوتی: گرفت لە منە, حەزم چۆ منداڵ! بەڵام چ دەکرا؟! دەبوو لێی جیا ببمەوە؟! لەناکاو کەوتمە بیری ئەو یەك ساڵەی پێکەوە ژیاوین. چەندە ئاسوودە بووم! لەبەرئەوەی بابم هەقەکەی زیاد کردبوو, بەڵام هەرچی چۆن بێ مافی کارمەندێکی هەبوو و بەو پارەیە دەیتوانی ژیانێکی مامناوەند دەستەبەر بکات, بەڵام هەتا بڵێی پیاو و میهرەبان بوو. دوای ئەو دەزگیرانداریییەی لە سوهەیل دیتبووم, ڕەزا وەك فریشتەیەك وا بوو بۆم. کەسێك بوو کە دەمتوانی پشتی پێ ببەستم. کەسێك کە متمانەم پێی هەبوو.

چایەکی دیکەم تێکرد و چوومە هۆڵەکە. لە سەر قەنەفێك دانیشتبوو و سەری لە نێو هەردوو دەستی دا بوو. چوومە تەنیشتی دانیشتم و گوتم))

- ڕەزا!

(( سەری بەرز کردەوە. دیسان خەریك بوو بە ئارامی دەگریا! زۆرم زگ پێ سووتا! فرمێسکەکانیم سڕینەوە و گوتم))

- ئەگەر بڵێم منداڵم ناوێ, درۆ دەکەم!

- دەزانم!

- بەڵام لەوانەیە جارێ خودا بە باشی نەزانێ منداڵمان پێ بدا!

(( هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا کە گوتم))

- منیش تۆم زۆر خۆشدەوێ! ئامادەش نیم لێت جیا ببمەوە. هەرچی چۆن بێ لەوانەیە بتوانرێ شتێك بکرێ! ئێستا زانستی پزیشکی زۆر بەرەو پێش چووە! ئەتو دیسان بچۆوە دکتۆری. من دڵنیام کە باش دەبی! بە کەسیش مەڵێ. بە هەمووان دەڵێین جارێ نیازی منداڵمان نییە! ئیدی خەفەت مەخۆ!

(( هەر کە ئەوەم گوت, لە باوەشی گرتم و دەستی کرد بە ماچکردنم! هەستێکی خۆش ڕووی تێکردم! پێم وا نەبوو ئەوەندە خۆشیبوێم! ئەوەندە خۆشحاڵ ببوو کە بە هۆی ئەوەوە منیش هەستم بە خۆشییەکی زۆر دەکرد!

ڕەزا دەستی کرد بە چوونە کن دکتۆر و دەرمان خواردن. دەرمانەکەکان کاریگەرییان نەبوو, بەڵام ڕووداوێکی دیکە لە ژیانماندا ڕووی دا.

ڕەزا بەرەو پێش چوو. سەرەتا لەو شەریکەیە هاتە دەرێ و چوو لەگەڵ یەکی دیکە بوو بە شەریك, کابرا پارەی دانا و ڕەزاش کار! لەوانەیە ساڵێك یان شتێك زیاتر تێنەپەڕی کە شەوێك هاتەوە ماڵێ بە هاوارەوە گوتی))

- ئەفسانە! ئەفسانە!

(( هاتمە پێشی کە گوتی))

– سەیرکە چم دیتۆتەوە لەسەر جادە؟!

(( دەستی لە باخەڵی ڕاکرد و کارتۆنێکی چکۆلەی دەرهێنا و دایە دەستی من! واق وڕماو لێم وەرگرت و گوتم))

- لە کوێت دیتۆتەوە؟!

– هەر لە پێش دەرگای ماڵیٚ!

- چی تێدایە؟!

– بیکەوە و سەیریکە!

(( هەر سەری کارتۆنەکەم کردەوە و بینیم ئەنگوستیلەیەکی زێڕی تێدا!))

- ئۆف ئۆف ئۆف ئۆف! سەیرکە هی چ ماڵوێرانێك بووە و لێی ون بووە؟! بڕۆ لە هەر کوێیەك دیوتەوە ڕاوەستیٚ ئێستا خاوەنەکەی ئەوە بەدوایدا دەگەڕیٚ!

– لێیگەڕیٚ!

- یانی چی؟!

– ئێمە دیتومانەوە, کەواتا هی خۆمانە!

- مەگەر ئێمە دزین؟!

– ئەمە خۆ دزیی نییە!

- ئەی چییە؟! یەڵڵا! بڕۆ پێکەوە بچین!

– ئاخر هەر ئەوەندەش نییە!

- مەگەر شتێکی دیکەشە؟!

– ئەریٚ! ئەمەشە!

(( دووبارە دەستی لە باخەڵی هاویشت و سویچێکی لیٚ دەرهێنا!))

- ئەدی ئەمە چییە؟!

- سویچی سەیارەیە! پێم وابێ سویچی پڕایدە ڕەشەكەیە!
ـ بە كوێدا دەزانی؟!
(( هەر وا سەیرێكی كردم كە پێكەنی و گوتی))
- چونكە هەردووكیان بۆخۆم بۆم كڕیوی!
(( سەرم سوڕما پێی, كە ماچی كردم و گوتی))
- شایەنی هاوسەرە باش و جوانەكەمی نییە!
ـ ڕەزا!
- گیانی ڕەزا!
ـ گێژت كردووم! توخوا ئەمانە چین؟!
- ئەمەیان ئەنگوستیلەیەكی زێڕە و ئەوی دیش پڕایدە!
ـ ئاخر لە كوێوە؟! چۆن چۆنی؟!
- خودا! ویستی خودایە! وەرە سەیری بكە!
(( دەستی ڕاكێشام و منیش چارشێوەكەم هەڵگرت و بەدوایدا چووم كە بینیم لە گەراجەكەماندا پڕایدێكی ڕەش ڕاگراوە!))
- جوانە!؟
ـ توخوا هی خۆمانە؟!
- ئەرێ بە گیانی تۆ! باوەڕ ناكەی؟!
(( بە كۆنترۆڵ كردییەوە و دەستی گرتم و بردمیە پێشێ و گوتی))
- لە ناویدا دانیشە! پیرۆزت بێ!
(( باوەڕم نەدەكرد! دەرگام كردەوە كە بینیم كاغەزێك لەسەر كوشنەكە كەوتووە! هەڵمگرت و بینیم ڕەزا لێی نووسیوە:" ئەگەر ڕووناكیشمان لەماڵدا نییە, شادیی هەیە".

ئاوڕم دایەوە و سەیرم کرد! لە چاوەکانیدا جیهانێك خۆشی و شادیی هەبوو! دەرپەڕیم و ماچم کرد و گوتم))

ـ پێویستی بەو شتانە نەبوو! من بەو شێوەیەش خۆشمدەوێی!

(( دواتر لە سەیارەکەدا دانیشتین و ئەنگوئستیلەکەم دەرهێنا! چ ئەنگوستیلەیەك بێ! لەناکاو کەوتمەوە بیری ئەو دانەیەی سوهەیلی خوێڕیی پێی دابووم! خەریك بوو گومان بکەم, کە بینیم کاغەزێك لە کارتۆنەکەدایە و زۆر گرانی کڕیوە!))

ـ ڕەزا! بۆ ئەوەندە گران؟!

– لە کن تۆ بێ نرخە! لە دەستی بکە ئیدی!

ـ وەرە تۆ لە دەستم بکە!

(( دەستی گرتم و ئەنگوستیلەکەی لە دەست کردم و دواتر دەستی ماچ کردم و گوتی))

– زۆرم خۆشدەوێی ئەفسانە! ئیشەڵڵا خودا پێم بدا, سەد هێندەی ئەمەت بۆ دەکڕم!

(( کاری شەریکەکەی وەرگرتبوو. ئەشیای کۆمپیوتەریان بۆ دێنا. بۆخۆشم پێم سەیر بوو کە لەناکاو ڕەزا وای لێ هاتبوو! دەتگوت لە پڕ زەینی دارایی وەکار کەوتووە!

ساڵی دواتر باڵەخانەیەکی شێست مەتریمان کڕی. فەقیرە وەك پەپولە بە دەورمدا دەسوڕایەوە! هەرچییەکم ویستبا, پێش گوتن بۆم جێبەجێ کرا بوو! هەر بەڕاستیش خۆشبەخت بووین! جگە لە بابەتی منداڵەکە, لە هیچمان کەم نەبوو.

کەم کەمیش پەیوەندیم لەگەڵ بابم باش ببۆوە! دە ڕۆژ جارێك, دوو هەفتە جارێك لەگەڵ ڕەزا دەچوینە ماڵێی. هەرچەند لە کن ڕەزا لەگەڵم زۆر باش بوو, بەڵام کە بەتەنێ دەبووم, نا! قسەی دەگەڵ نەدەکردم. هێشتا لێم توڕە بوو!

ماوەيەك تێپەڕى. خەريك بوو پارەمان كۆ دەكردەوە كە ماڵەكەمان بگوازينەوە!
تەقريبەى دوو ساڵ دواتر بوو. بەڕاستيى ڕەزا كارى دەكرد. شەو و ڕۆژ, ڕۆژ و شەو! بە عەشقەوە كارى دەكرد. بەڕاستيى منيش عاشقى ببووم!
خولاسە دوو ساڵ دواتر باڵەخانەكەمان بۆ فرۆشتن جێ هێشت و دواى ئەوەى كە فرۆشتمان, كەمێكمان لەسەر دانا و سەد مەترييەكى جوانمان لە شوێنێكى باش كڕى و سەيارەكەشمان گۆڕى!
نيوەى شەريكە بوو بە هى ڕەزا. واتا بوو بە شەريكى سەرمايەكەى. ئيدى جگە لە منداڵ, هيچى ديم لە خوا نەدەويست. ژيان بە ويستى من ڕێى دەكرد. ئيدى دەگەڵ بابيشم چاك ببوومەوە. يانى كە ديتبووى لەسەر ماڵ و ژيانى خۆمم, ئيدى ڕابردووى لەبير كردبوو و قسەى لەگەڵ دەكردم و تەقريبەن وەك پێشترى لێ هاتبۆوە و هەر داواى لێ دەكردين كە منداڵمان ببێ! ئێمەش هەر بەهانەمان بۆ دێنانەوە كە جارێ زوويە و ئێستا وەختى نييە!
سەرت نەهێشێنم!
ماوەيەك دواتر, ڕۆژێك كە ڕەزا چووبوو بۆ سەر كارى خۆى و منيش خەريكى ماڵ خاوێنكردنەوە بووم, بابم لە شەريكەڕا تەلەفونى كرد!))
ـ ئەلوو! ئەفسانە؟!
–سڵاو بابە گيان! چۆنى؟! ئەوە چۆنە ئێمەت بير كەوتەوە؟!
ـ سڵاو, باشى؟!
–زۆر سوپاس! باشم!
ـ ڕەزا گيان چۆنە؟!
– ئەويش باشە, سڵاويان هەيە بۆتان!
ـ لە شەريكەيە؟!

—بەڵێ! ئیشت پێیە؟!

ـ نا, سلاۆمی پیێ بگەیەنە!

—بە چاوان. ئەریێ بابە بۆ شەوێك تەشریف نایەننە ئێرە؟!

ـ ئێوە بانگم بکەن تا منیش بێم!

—خۆ ئەتۆ پێویستت بە بانگکردن نییە تازە! ماڵی خۆتە! هەر ئەم شەوی هەینییە چاوەڕێتم!

ـ جاریێ ئەوە قسان پێکەوە دەکەین! ئەریێ هاوڕێکەت کیێ بوو؟!

—هاوڕێکەم؟!

ـ ئا! هەر ئەوەی کە چەند ساڵێك لە ئامادەیی پێکەوە بوون و چوو بۆ ئەمریکا! ناوی ساناز بوو ئیدی!

—ساناز؟! ئەهاا! ئیێ؟!

ـ گەڕاوەتەوە ئێران. شەوێدی تەلەفونی کرد! زۆر حەزی دەکرد بتبینیێ! ژمارەکەتم ویێ داوە! دیارە تەلەفونی بۆ نەکردووی؟!

—نا!

ـ ئیێ حەتمەن بۆت دەکا!

—کەی گەڕاوەتەوە؟!

ـ گوتی: چوار پێنج ڕۆژ دەبیێ! دەی هەرچی چۆن بیێ گوتم با پێی بلێم!

—زۆر سوپاس, کەوایە شەوی هەینی لەبیر نەکەن!

ـ باشە, باشە, سلاۆم بگەیەنە بە ڕەزا گیان!

—بە چاوان, گەورەیتان دەگەیەنم!

ـ جاریێ خوا حافیز!

—خوات لەگەڵ بابە گیان! سوپاس!

(( تەلەفونەکەم داخستەوە. ساناز یەکێك بوو لە هاوڕێکانم کە لە ئامادەیی پێکەوە بووین. زۆر کچێکی بەدبەخت بوو. ئەویش دایك و بابی لێك جیا ببوونەوە و قورسایی زۆر لەسەر بوو! تەنها بەختێك کە هەیبوو, مێردێکی بۆ پەیدا بوو کە لە ئەمریکا دەژیا. دە دوازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بوو. بەڵام ساناز لەبەر خراپیی باریی مادديی ماڵێیان, ناچار بوو شوی پیێ بکات. دواتریش چوو بۆ ئەمریکا. فەقیرە هەتا نەیتوانی دیبلۆمیش تەواو بکات. یانی جوابی نامەی نەدایەوە! زۆر حەزم دەکرد بیبینم! خولاسە یەك دوو ڕۆژ تێپەڕی. ڕۆژێك نزیك نیوەڕۆ بوو کە دەنگی تەلەفونەکە هات! کچێك بوو!))

ـ ئەلوو!

ـفەرموون!

ـ خاتوو ئەفسانە؟!

ـجەنابتان؟!

ـ بۆخۆتانن؟!

ـبەڵێ, جەنابت؟!

ـ یەك دەقیقە لەسەر هێڵ بمێنەوە!

(( کەمێك دواتر یەکێکی دیکە هاتە سەر هێڵ. دەنگی پیاوێك بوو. دەنگێکی تەپیو!))

ـ ئەلوو!

ـبەڵێ!

ـ ئەفسانە؟!

ـجەنابت؟!

ـ نامناسی؟!

—نەخێر, ناتناسم!

ـ من سوهەیلم!

(( دەتگوت لە کارەبایان دام! لە جێی خۆم ڕەق بووم! ئەسڵەن نەمدەزانی دەبێ چ بکەم؟ ! تەنها کارێك کە توانیم بیکەم, تەلەفونەکەم داخستەوە! ئەوەندە ترسابووم, کە نەمدەتوانی لەرزینی دەستم ڕاگرم! خێرا چومە چێشتخانە و پەرداخێك ئاوم تێکرد, کە دووبارە تەلەفوون هاتەوە! نەمدەزانی دەبێ چ بکەم؟! دەمزانی ئەوە, بەس دەمگوت نەکا ڕەزا بێت!

حەوت هەشت دە جار لە جەڕەسی دا و بێدەنگ بوو. لەسەر کورسییەك دانیشتم. دیسان تەلەفوونی کردەوە. خوایە! دەبوو چ بکەم؟! خێرا هەستام و پلاکی کارەبای تەلەفونەکەم دەرهێنا! چووم پەرداخێکی دیکە ئاوم خواردەوە و کەوتمە بیرکردنەوە! نەدەکرا تەلەفوونەکە هەر داخەمەوە! لە کۆتایی دا چی؟! ئەی ئەگەر ڕەزا گەڕایەوە چی؟! گەر لەو کاتەدا تەلەفون بکات کە وای بە حاڵم!

خێرا پلاکی تەلەفونەکەم لە کارەبا هاویشتەوە کە دیسان تەلەفون هاتەوە! دەستم دەلەرزین! ئارام تەلەفونەکەم هەڵگرت!))

ـ ئەلوو! ئەفسانە!

—چت لە گیانی من دەوێ؟!

ـ هیچ! بۆچی ئەوەندە ترساوی؟!

—من ئەسڵەن نەترساوم! تەنها توڕەم! کاتێك ناوی تۆ دێ تێکدەچم!

—ڕێزتان هەیە!

ـ ژمارەی منت لە کوێ وەچنگ کەوتووە؟!

—چ بابێکی خوێن گەرمت هەیە! هەتا مرۆڤ دوو قسەی دەگەڵ دەکات, هەموو شتت بۆ هەڵدەڕێژێ!

(( تێگەیشتم کە ئەو خوێڕیە کچێك, کە حەتمەن هەر ئەو کچەی سەرەتا قسەی لەگەڵ من کرد, لە جێی سانازی دانەوە! بۆخۆشم پێشتر باسی سانازم بۆ کردبوو!))

—گوێگرە بزانە دەڵێم چی! من مێردم هەیە! خۆشیشمدەویێ! بڕۆ بەدوای کارتدا! ئیدی تەلەفونیش بۆئێرە نەکەیەوە! تێگەیشتی چم پیێ گوتی؟!

ـ بۆچی ئەوەندە توڕەی؟! بەخوای دەزانی چەندم پیێ خۆشبوو کە بیستم مێردت کردووە و ژیانێکی خۆشت هەیە!

—ئەگەر درۆ ناکەی, وازم لیێ بێنە!

ـ یانی ئەوەندە لێم توڕەی؟!

—بێزارم لێت!

ـ من تەنها دەمویست پیرۆزباییەکت لیێ بکەم!

—پێویست ناکات! ئیدی تەلەفون بۆ ئێرە مەکەوە!

ـ گوێبگرە ئەفسانە! من تەنها دەمویست جارێك بتبینم! هەر ئەوەندە!

—هەر بیریشی لیێ مەکەوە! من ژنێکم مێردم هەیە! دەزانی ئەوە یانی چی؟! ئەگەر شوەکەم بزانیێ, حەتمەن دەتکوژیێ!

ـ ئۆوو! یانی ئەوەندە دڕە؟!

—توخوا بەسە ئازارم مەدە! هەر ئەو کارانەی کە لەگەڵت کردم بەسە! تو ئەو خوایە, تو ئەو کەسەی کە دەیپەرستی بهێڵە بژیم!

(( ئەوەم گوت و دامخستەوە کە دیسان تەلەفونی کردەوە! ئەوجارە کاتێك تەلەفونەکەم هەڵگرت, هاوارم کرد و گوتم))

—بڕۆ ون بە ئیدی! بەخوای شکایەتت لیێ دەکەم و کەوڵتکەن! خوێڕی! ئەمن مێردم هەیە!

ـ گوێگرە ئەفسانە! دەزانی ئەگەر شەوانە دوو سێ جار تەلەفون بکەم و دایخەمەوە چ دەبێ! بێ یەك و دوو مێردەکەت وەگومان دەکەوێ! ئەوکات وای بە حاڵت!

(( خوێڕییە دواتر لە قاقای پێکەنینی دا!))

—ئاخر بۆچی دەتەوێ وا بکەی؟! خۆ بۆ تۆ کچ نەبڕاون! بۆچی دەتەوێ ژیانم لەبن بێنی؟! ئەو ستەمەی کە لێت کردم بەس نەبوو؟!

ـ بەخوای ئەمجارە تەنها دەمەوێ داوای لێبوردنت لێ بکەم! دەمەوێ لێم خۆشبی!

—باشە! باشە! لێت خۆشبووم! ئەسڵەن لێت تووڕە نیم! بەس وازم لێ بێنە!

ـ دەبێ لە شوێنێك بتبینم! هەندێك شت هەیە کە پێویستە پێت بڵێم!

(( دەنگی زۆر سەیر ببوو! سست و تەنگ!))

—سوهەیل توخوا وا مەکە!

ـ تەنها پێنج دەقیقە! هەر شوێنێك کە تۆ بتەوێ!

—نا! نا! ئەمن مێردم هەیە خوێڕی!

ـ دایمەخەوە!

—بڕۆ ون بە!

(( تەلەفونەکەم داخستەوە! خەریك بوو دیق بکەم! نەمدەزانی دەبێ چ بکەم! لەناکاو بە فکرمدا هات کە تەلەفوون بۆ بابم بکەم, بەڵام نا! خەتەرە! ئەنجامێکی باشی نابێ!

بەرەو چێشتخانە چووم و ئارامکەرەوەیەکم خوارد. بەس خوا دەزانێ حاڵم چۆن بوو! چاوم هەر لەسەر تەلەفوونەکە بوو و گوێم لە جەڕەس! ئامێری تەلەفون

وەك دێوێکی لێ هاتبوو بۆم! کاتێك سەیرم دەکرد, لەشم لە ترسان مچوڕکی پێدا دەهاتن!

چەند دەقیقەیەکی دیکە تێپەڕی خەبەرێك نەبوو! واتا تەلەفونی نەکردەوە! نیو سەعاتی دیکەشم بە ترس و لەرزەوە بەڕێ کرد! دیسان هەر هیچ! بە خۆمم گوت: حەتمەن کە دیویەتی بەو شێوەیە قسەم لەگەڵ کردووە, ترساوە و لەوانەیە بێ هیوا بووبێ! لەوانەشە زگی پێ سوتابم و وازی لێ هێنابم!

سەعاتێکی دیکەش تێپەڕێ و خەبەرێك لە تەلەفون نەبوو! کەمێك هاتبوومەوە سەر خۆم و خەیاڵم شتێك ئاسوودە ببوو کە لەناکاو لە جەڕەسی ماڵێیان دا! وەك کێچی لە جێی خۆم دەرپەڕیم! یانی دەکرا کێ بێ!؟ نەکا هاتبێتە پێش دەرگا!؟ هێواش لە پەنجەرەڕا سەیری خوارێم کرد! پیاوێکی نزیك پەنجا ساڵە بوو. چووم جوابی ئایفۆنم دایەوە!))

–بەڵێ!؟

- پۆستەچیم خاتوون! کارتۆنێکم بۆ هێناون!

–کارتۆن؟! لە لایەن کێوە؟!

- وەڵا نازانم!

(( کەمێك بیرم کردەوە و دواتر گوتم))

–چاوەڕێ بکەن ئێستا دێم.

(( خێرا چارشێوەکەم هەڵگرت و چوومە خوارێ و نیوەی دەرگام کردەوە. پارچەیەکی چکۆلە بوو! سایەقەکە لەوێڕا وێی دام و خواحافیزی کرد و ڕۆیشت. خێرا هاتمەوە سەرێ و کردمەوە! شریتێك بوو! شریتێکی ڤیدیۆ! خەریك بوو سەیری ئەولا و لایم دەکرد کە دەنگی تەلەفون هات! مێشکم خەریك بوو دەتەقییەوە! تەلەفونەکەم هەڵگرت و تا ویستم شتێك بڵێم خێرا گوتی))

ـ فیلمێکی جوانە ! سەیری بکە ! بەتەنێ !

(( دواتر دایخستەوە ! خێرا چووم ڤیدیۆ و تەلەفزیۆنەکەم پێ کردن و شریتەکەم هاویشتە سەرێ! ئۆفف خوایە گیان!

( بێدەنگی)

ـ ئارامبەوە ! ئارامبەوە !

( دەنگی گریان)

—ئیدیی هەموو شت تەوا ببوو! بێ شەرەفی نمەك بە حەرامە!نازانم چۆن تەسویری کردبووم! یانی نازانم ڕوونە ئیدی! کاتێك بێهۆش لەوێ لەسەر قەنەفە درێژ ببووم و هیچم لەبەر نەبوو, تەسویری کردبووم! هیچ جێی ئینکاری کردنیش نەبوو! فیلمەکە ئەوەندە ڕوون بوو, کە بە هیچ شێوەیەك نەدەکرا خۆی لێ ببوێری!

دانیشتم و دەستم بە گریان کرد کە تەلەفونی کرد! هەر وا بە گریانەوە تەلەفونەکەم جواب دایەوە !))

ـ ئێستا بینیت ئەگەر بمەوێ ئازارت بدەم چەندە بۆم ئاسان بوو؟ !

—توخوا سوهەیل! تو گیانی ئەو دایکەی کە خۆشتدەوێ! گیانی...

ـ بۆچی دەگریەی؟! خۆ ئەمن ئیلاقەم نی!

—تۆ نازانی خەریکە چ دەکەی! من وێران دەبم! ژیانم لەناو دەچێ!

ـ من تەنها دەمەوێ دە دەقیقە بتبینم! هەر ئەوەندە! دواتریش, شریتە ئەسڵیەکەت وێ دەدەم!

—منت بۆ چییە ؟!

ـ هیچ! تەنها داوای لێبوردنت لێ دەکەم! وەڕەزیم کردووی! دەمەوێ بزانم چت لێ هاتووە !

—توخوا وا مەکە! تو قورئان ئەو کارە مەکە! من زۆر ئازارم چەشت لە دوای ئەو ڕووداوە سوهەیل! حەیام چوو! ئیدی وا مەکە لەوە زیاتر بەدبەخت بم! ئەگەر مێردەکەم بزانێ لەگەڵ غەریبەیەك چوومەتە دەرێ, دڵنیابە دەمکوژێ!

ـ بە کوێدا بزانێ!؟ خۆ دە دەقیقە هاتنە دەر هیچ نییە!

—من دەزانم کە هەر ئەو دە دەقیقەیە نییە!

ـ بە گیانی خۆت هەر ئەوەندەیە!

(( کەمێك بێدەنگ بووم و تەنها گریام! گریان و فکر! بیرکردنەوە لە بڕیاردان!))

ـ ئەفسانە!

—چییە؟!

ـ وەرە بۆ ئەو ناونیشانە کە پێت دەڵێم!

—تۆ کە گوتت لە شوێنێکی دەرەوە یەکتر دەبینین!

ـ خۆ لە دەرێ خراپترە! لەوانەیە ناسیاوێك شتێك بمانبینێ!

(( دیسان بێدەنگ بووم کە گوتی))

ـ بنووسە!

(( ناونیشانەکەی گوت. شوێنێك لە نزیك شەقامی جمهوری بوو!))

—من نایەمە ژوور, هەر لە پێش دەرگا! نایەمە ژوورێ! ئەوە لە ئێستاوە پێم گوتی!

ـ مەترسە! هیچی وام لێت ناوێ کە پێویست بکات بێیە ژوورێ!

—ئەی کەوایە چت دەوێ!؟

ـ هیچ هیچ! دەستم کەمێك بەتاڵە! ئەگەر هەتە هەندێك پارەم بۆ بێنە!

(( تازە تێدەگەیشتم مەسەلە چییە؟! خەریك بوو بە زۆر پارەی لێ دەستاندم!

((

—پارە؟!

ـ بەڵێ! لە مەعامەلەیەکدا زەرەرم کردووە و ئێستا پێویستم بە پارەیە!

—خەریکی بەزۆر پارەم لێ وەردەگری؟!

ـ ئەو قسانە چین؟! هەرچی چۆن بێ ڕۆژێك لە ڕۆژان هاوڕێم بوی! ئێستا یارمەتییەکی هاوڕێکەت نادەی؟!

—هاوڕێ؟! ئەتو لە سەد دووژمنیش خراپتری!

ـ دیسان دەست پێ مەکەوە!

—باری داراییمان باش نییە!

ـ خۆماڵتان لە شوێنێکی خۆشە!

— بە قەرز و قۆڵ و سلفە کڕیومانە! شوەکەم لە بەیانیی تا ئێوارە ئیش دەکات و ماندوو دەبێ! خۆ وەك تو نییە نانی حەرام بخوا!

ـ جارێ سێسەد تمەنم بۆ ئامادەکە!

—سێسەد تمەن؟! سێسەد هەزار تمەن؟!

ـ گوێبگرە ئەفسانە! نرخی ئەو فیلمە لەوانە زیاترە! زۆرێك ئامادەن پارەی زیاتر بدەن و بلیتی فیلمەکە بڕن و سەیری بکەن! بۆتۆ کە نرخی زۆر زیاترە! خۆ تێدەگەی دەڵێم چی؟! بەیانیی بەیانییەکە سەعات دە چاوەڕێتم! وەدوا نەکەوی چونکە لەوانەیە پۆستەچییەکی دیکە شەوێ ئەو فیلمە بۆ مێردەکەت بێنێ!

(( ویستم قسە بکەم کە تەلەفونەکەی داخستەوە! دووبارە دەستم کرد بە گریان! خودایە! چەندە هەڵە بووم من؟! خوایە گیان! خۆ ئێستا من لەسەر ماڵ و حاڵ و ژیانی خۆمم و ڕێز لە مێردەکەم دەگرم! بۆچی دەبێ بەم شێوەیە بێ؟! ڕاستە کە چەند ساڵ لەمەوبەر هەڵەیەکم کرد, بەڵام تێنەدەگەیشتم و ئەقڵم پێ نەدەشکا و هیچیشم لەسەر نەبوو! خوایە گیان! چی بکەم؟!

( بێدەنگی)

(( ئەو ڕۆژە تا ڕەزا هاتەوە, دە جار گریام! ئەوەندە بیرم کردەوە کە خەریك بوو مێشکم بتەقێتەوە! وەلێ جگە لە ڕۆیشتن چارەیەکی دیکەم نەبوو!

هەرچی چۆن بێ, بەیانییەکەی هەندێك پارەی لێ بوو ماڵێ و لەگەڵ زنجیریکی زێڕ کە وێیدەم و فیلمەکەی لێ وەرگرمەوە و بێمەوە. بەڵام لە کوێوە دیارە کە کۆپییەکم وێ نادا و دواتر داوای پارەم لێ ناکاتەوە؟!

نەمدەزانی دەبێ چی بکەم! بەخوای خۆزگەم بە مردن دەخواست! هەرچەندە کە نزیکی ئەو ناونیشانە دەبوومەوە, دەتگوت یەکێك زیاتر قورگم دەگرێ و هەڵیدەگوشێ! ئیدی خەریك بوو دەخنکام!

لە کۆتایی دا گەیشتم. کۆڵانێك خوارتر لە سەرای جمهورییەوە بوو. لە تاکسیی دابەزیم و بەدوای پلاکەکەی دا گەڕام. ماڵێکی خشتە[1]ییم دیتەوە. زۆر کۆن بوو. لە جەڕەسی قاتی ئاخیریم دا کە کەمێك دواتر بۆخۆی جوابی ئایفۆنی دایەوە!

- کێیە؟!

—ئەمنم!

- وەرە سەرێ!

—نا تۆ وەرە خوارێ!

- ئەوە دەرگای دەکەمەوە, ویستت وەرە سەرێ, نەتویست سەرچاوم!

(( دەرگای کردەوە و ئایفۆنی بە کراوەیی بەجێهێشت. لەو نێوەدا مابوومەوە بچمە سەرێ یا نا!؟ بەڵام چارەشم نەبوو. درەگام کردەوە و سەرم نەویی کرد و خێرا چوومە سەرێ! بەتایبەتیی نەمدەویست کەس ڕوخسارم ببینێ, هەر چەندە

[1] خشتە: زۆرینەی خانووەکانی ئێران بە خشتی سوور کراون و دروستکراون.

عەینەکێکی گەورە و ڕەنگاوڕەنگم لەچاو کردبوو و تا ئەو شوێنەش دەکرا لچکم هێنابۆوە ڕووخسارم!

خێرا چوومە سەرێ. ئەو ڕێ و قاڵدرمانە!؟ هەڵوەشاو و وێران! دیار بوو کە باریی دارایی زۆر خراپە کە هاتووە ئێرەی بە کرێ بگرێ!

کاتێك گەیشتمە قاتی ئاخیری، دەرگای لەسەر پشتێ بەجێهێشتبوو! هەر لەوێ ڕاوەستام و بە هێمنی بانگم کرد کە هاتە پێش دەرگا! سەرم لێی سوڕ ما! وێران ببوو! مووی پێشە سەری وەریبوون و تەنیشتەکانیشی سپیی! کز و لاواز! تێگەیشتم چ بووە! موعتاد بوو! دەتگوت دڵم ئاوی خواردەوە! بە سزای خۆی گەیشتبوو خوێڕییە!))

- وەرە ژوورێ!

—نا! ئێرە باشە!

- وەختی خۆی هەرچیم دەگوت، جێبەجێت دەکرد!

—پێم وا بوو بوویەتە پیاو!

- هیچت پێ ناڵێم، ئەولا و لا مەکە!

—ئەتوش پێت وا نەبێ شریتێکت پێیە بتوانی هەر غەڵەتێك بکەی! لە سەروو ڕەشەوە ڕەنگێك نییە! ئاخیرەکەی ئەوەیە کە خۆم دەکوژم! ئەتوش بڕۆ هەر کەسێکی حەزت لێیە ئەو شریتەی پێشاندە! بەڵام پێش ئەوەی خۆم بکوژم، کارێك دەکەم کە ئەتوش بکەویە گرتووخانەوە!

(( لەناکاو و نەرم بوو گوتی))

- بەگیانی دایکم ئیشم پێت نییە! بەس لێرە جوان نییە قسە بکەین! ئەسڵەن وەرە ژوور و با دەرگا کراوە بێ! باشە؟!

(( ئارام چوومە ژووریٚ و دەرگام بە کراوەیی هێشتەوە. باڵەخەنەیەکی بلێم چۆن! دوو ژوور بوو لەگەڵ کونێکی وەك چێشتخانە و دەرگایەکی داخراو کە حەتمەن ئاودەست بوو و حەمام و ئەوشتانە! عەرزەکەشی تەختە و مێزێك و چوار کورسی و لەگەڵ سەلاجەیەکی کۆن!

- وەرە دانیشە!

(( چووم کورسییەکم ڕاکێشا و لە نزیك دەرگا لێی دانیشتم کە گوتی))

- یادی جاران بەخێر! چ ڕۆژانێك بوون!

—پیس و بۆگەن! وەکو خۆت! موعتاد بووی؟!

(( سەیری کردم و جگەرەیەکی دەرهێنا و پێی کرد. جگەرەیەکی ئێرانیی بوو))

—ئیشت بە کویٚ گەیشتووە؟! ئەوە سزای مرۆڤی ناپیاوە! ئێستاش هەر خەریکی ئەو خوێڕیایەتییەی؟!

- پارەت هێناوە؟!

—بەلٚیٚ, بەلٚام چۆن بزانم کە شریتەکەت چەند دانەیەك کۆپیی نەکرووە؟!

- وا بیر دەکەیەوە بەرتیل خۆرم؟!

—ئەتو بەرتیل خۆری زۆر شتی دیش!

(( مژێکی دیکەی لە جگەرەکەی دا و سەیری کردم و گوتی))

- کوا پارە؟!

—کوان شریتەکان؟!

- هەمووی یەك دانەیە!

—چۆن بزانم؟!

- دەتەویٚ سوێندت بە چی بۆ بخۆم؟!

—بڕوات پیٚ ناکەم!

ـ ئیدی کێشەی خۆتە ! پارەکەم بدەیە !

(( بە ناچاری پارەکەم لە جانتا دەرهێنا و لەسەر مێزەکەم فڕێدا کە سەیرێکی کرد و گوتی))

ـ باقیەکەی دیکە ؟ !

(( زنجیری زێرەکەشم دەرهێنا و هەڵم دایە سەر مێزەکە و گوتم))

—بگرە ! بە قوزەڵقۆرتت بێ !

ـ ئەوە خۆ سێسەدتمەن نابێ !

—نیمە تێناگەی؟ !

ـ کێشەی من نییە !

—خۆ میراتی بابت ناوێ ! کوان شریتەکان؟ !

ـ خۆ گوتم !

—هەر ئەوەندەیە کە هەمە ! زیاترم نییە ! ئەوەش ئەگەر مێردەکەم بزانێ ڕێك دەمکوژێ !

(( سەیرێکی کردم و پارە و زنجیرەکەی هەڵگرت و جگەرەیەکی دیکەی پێ کرد و گوتی))

ـ ئیدی خۆشت ناوێم؟ !

—حەز ناکەم سەرت بە لەشتەوە بێ ! شریتەکانم وێدە دەنا هاوار دەکەم هاا !

ـ بکێشە ! دواتر بیر دەکەیەوە چی دەبێ ! من تا سەر ئێسقانم هاتووە ! چ لێرە چ لە زیندان ! هیچ نەبێ لەوێ نانێکی تەواومان پێ دەدەن !

—زۆر زەلیل بووی, وانیە ! ؟ شریتەکانم وێدە !

(( هەستا و چۆ ژوورکەی دی و کەمێك دواتر بەخۆ بە شریتێکەوە هاتەوە و لەسەر مێزی فڕێدا ! ))

—چۆن دیارە کە هەر ئەو شریتەیە؟!

ـ بە گیانی خۆت هەر ئەوەیە!

—بە گیانی خۆت! ئەسڵەن ڕوون نییە ئەوەش بێت!

ـ ئێ بڕۆ بیخە ناو ڤیدیۆ و بزانە هەوە؟!

—لە کوێیە؟!

ـ لە ژووریّ! بڕۆ چاوی لێ بکە تا دڵنیا بی!

(( هەستام و بەرەو ژوورەکە ڕۆیشتم. هەر لە دەرێڕا چاوم لێ کرد. هیچ دیار نەبوو! دوو هەنگاو چوومە پێشتر و لە چوارچێوەی دەرگاکەڕا سەیری لایەکی دیکەی ژوورەکەم کرد, بەڵام ئەوێش هیچی لێ نەبوو. جێخەوێکی لێ بوو و مێزێکی بچووك, کە مەسینەك ئاوی لەسەر بوو و لەگەڵ کاڵەکێك و چەقوێك کە لە کاڵەکەکە ڕۆچووبوو!

هەتا ئاوڕم دایەوە, دیتم کە دەرگاکەی داخست و بەرەو من هات!))

—نەیە پێشێ خوێڕی!

ـ خۆت نەکەیە فریشتە! لە بیرت چۆتەوە پێکەوە چیمان کردووە؟! ئێستا بۆ من بویەتە فریشتە!

(( هەتا ویستم بەرەو مێزەکە غار دەم, خۆی پێ دادام و پاڵی پێوەنام بۆ ژووریّ! بە شێوەیەك پاڵی پێوە نام کە بەربوومەوە سەر زەوی. هەتا هەستامەوە, لە پشتەوە پرچی گرتم و فڕێی دامە سەر جێخەوەکە. دەستم بە گریان کرد و گوتم))

—تو خوا سوهەیل! تو قورئان! تو ئەو کەسەی دەیپەرستی! ئەمن مێردم هەیە. دیسان پارەت بۆ دێنم! مەگەر پارەت ناویّ!؟

ـ ئەویشم بۆ دێنی! جاریّ سەرەتاتە!

–سوهەیل ئەو کارە مەکە! سەیرکە سزای جاری پێشترت چۆن دایەوە؟! ئێستا ئیدی من مێردم هەیە! خۆ کچ بۆ تۆ نەبڕاون! پارەش ئەوە بۆت دێنم! ئیدی ئەو کارە مەکە!

ـ مەترسە هیچت لێ کەم نابێتەوە!

–ئەگەر ئەو کارەم لەگەڵ بکەی, دوایی دڵنیابە خۆم دەکوژم! ئەوکات چ سودێکی بۆ تۆ هەیە؟! ئاوا دەتوانم پارەت بۆ بێنم و بڕۆی لەگەڵ هەر کەسێك حەزت لێیە ئەو کارە بکەی! بۆ تۆ چ جیاوازییەکی هەیە؟!

ـ ئەتوو شتێکی دیکەی!

–سوهەیل گیانی دایکت! بە عەلیی سوێندت دەدەم! نا سوهەیل! نا!

(( وەك وەحشییانی لێ هاتبوو و هیچی وەرنەدەگرت! زۆریش بەهێز بوو و دەرەقەتی نەدەهاتم! نەشمدەتوانی هاوار بکەم و داوای یارمەتیی بکەم, چونکە دواتر هەموو شتێکم کۆتایی دەهات!))

( بێدەنگی)

(( نەمزانی چۆن بوو لەناکاو دەستم ڕەها بوو! بۆساتێك هەستم بە ئارامیی کرد. لەسەر قەرەوێڵەکە درێژ بووم. ئەویش خەندەیەکی کرد و هاتە سەر قەرەوێڵەکە! بە هێمنی دەستم بۆ مێزەکە برد و چەقوەکەم لە کاڵەکەکە دەرهێنا! ئەسڵەن تێناگەم! ئاگای لە خۆ نەبوو! بۆساتێك بە خۆمم گوت خوایە گیان! لێم ببوورە! خەریکم بەرگریی لە نامووسم دەکەم! لە نامووسی شوەکەم!

لە بن چاوەوە سەیرێکی چەقوەکەم کرد! لەو کارتە[1] چکۆلانە بوو کە میوەی پێ دەخۆن! ویستم لە عەزەڵاتی بدەم, کە لەناکاو خۆی هەستی پێ کرد و خۆی

[1] کارت: لێرەدا کارت وەك ئەو چەقووە بەکار دێ کە بۆ میوەی وەك سێو و پرتەقاڵ ئیشی پێ دەکەن , زۆرێك لە ناوچە کوردییەکانی ئێران هەر کارت بەکار دێنن بۆ ناوی ئەو چەقووە.

کشاندە دوایە, کە بە ملی کەوت, هاوارێکی کرد و خوێن لە ملی پرژا! لەسەر قەڵەوێرەکە پاڵم پێوە نا بۆ خوارێ و هەستام! دەستی بە ملی گرتبوو و هەر تلی دەدا! حاڵی ئەوکاتەم زۆر پێ سەیر بوو! زۆر خوێنسارد ڕاوەستابووم و سەیرم دەکرد! وەك چۆن لەسەر زەویی کەوتبوو و گەوزدان! بە دەنگێکی خراپ, کە هەر غڵبەغڵب بوو, دەیگوت تەلەفون بۆ فریاکەوتن بکە! منیش زۆر بە خوێنساردییەوە پێم گوت شریتەکان لە کوێن؟! بێ ئەخلاقە! لەو کاتەشدا نەیدەویست پێم بڵێ! ویستم دەرگای لەسەر قفڵ بدەم, کە ناچار بوو بڵێ! هەر لەناو ئەو مێزە چکۆلەیەدا بوون! بە چاوی ئیشارەی پێ کرد! داخیلەکەم ڕاکێشا دەرێ! نمەك بە حەارمە, شەش شریتی لەوێدا بوون! هەڵمگرتن و پێم گوت))

–چی دیکە!؟ دیسان هەیە یان نا؟! ڕاستییەکەی بڵێ, دەنا بەجێت دێڵم و دەڕۆم!

(( هەر بەو دەنگە غڵبەغڵبە و بە پاڕانەوەوە گوتی کە هەر ئەوەندەن!

بۆخۆشم پێم وا بوو هەر ئەوەندە بن!

کاتێك زانیم چەقوەکە هەر بە خۆمە, چوومە زگ تەلەفوونەکە! خێرا کلێنسێکم لە جانتاکەم دەرهێنا و چەقوەکەم پێ هەڵگرت و لە جانتاکەم هاویشت! کەمێکیش لە جلەکان و ڕووخسارم خوێناویی ببوون! چوومە چێشتخانە و خۆم خاوێن کردەوە و زنجیر و پارەکەم لەسەر مێزەکە هەڵگرت و چووم تەلەفونم بۆ فریاکەوتن کرد و گوتم: لێرە یەکێك خۆی کوشتووە و خوێنی لێ دەڕوا! پرسیان تۆ کێی؟! گوتم: هاوڕێیەکی کە دەمەوێ یارمەتیی بدەم, بەڵام نامەوێ توشی دەردەسەر بم! خێرا ناونیشانەکەم وێدان و بۆ دواین جار سەیرم کرد! هەر بەڕاستی خەریك بوو لە خوێندا تلی دەگەوزا!

خێرا لە ماڵێی هاتمە دەرێ و لەسەر کۆڵان تاکسییەکم گرت و لە نزیك ماڵێ دابەزیم و باقیی ڕێیەکەی دی بە پێیان ڕۆیشتم! هەر کە گەیشتمەوە ماڵێ, جلەکانم دانان و لە زەرفێکی زبڵم هاویشتن و جلێکی دیکەم دەبەر کردن و هاتمە دەرێ و چوومە دوو سێ کۆڵان خوارتر و زەرفی زبڵەکەم فڕێدایە ناو عاویەی زبڵدان کە لەسەر کۆڵانێکیان دانابوو. دواتریش گەڕامەوە ماڵێ و چوومە حەمام. نیو سەعات دواتر هاتمە دەرێ و چوومە زگ شریتەکان, سێ دانەیەیان هی خۆم بوون و سێی دیکەش هی کچێکی دیکە, کە لە هی من خراپتر بوو. ژمارە تەلەفونێکیشی لەسەر بوو و لەگەڵ ناوێك, مەرجان! حەتمەن لەویش داوای پارەی کردووە! شریتەکانم شکاندن و دواتر سوتاندمن و ئاوا خەیاڵم ئاسودە بوو. دەتگوت کۆڵەبارێکی گەورەم لە کۆڵ بۆتەوە! خێرا کەوتمەوە بیری چەقوەکە! ئەویشم لە جانتاکەم دەرهێنا و لە پەجەرەڕا فڕێمدا خوارەوە!

(بێدەنگی)

—ئەفسانە؟!

(بێدەنگی)

—ئەفسانە!؟

ـ هاا؟!

—حاڵت باشە؟!

ـ ئەرێ!

—دواتر چی بوو؟!

ـ ئەو شەوە حاڵم زۆر خراپ بوو زۆر! بە ڕەزام گوت نەخۆشم! حەبێکم خوارد و چووم نووستم! تازە تێدەگەیشتم کە چیم کردووە! هەموو ڕووداوەکان لە پێش چاوم بوون! بەیانییەکەی کە ڕەزا ڕۆیشت, ئیدی تاقەتم نەما! سزای ویژاد کۆڵی

لیَ نەدەدام! هەرچی حەبی ماڵیَ هەبوون خواردمن و چووم نامەیەکم نووسی کە هیچ کەسێك لە مردنم بەرپرسیار نییە! وە لەبەر مەسەلەیەك کە پەیوەندیی بە مێردەکەمەوە نییە, خۆم کوشتووە!

شەوەکەشی چاوم کردەوە, دیتم ئەوە لە نەخۆشخانەم و ڕەزا واق وڕ ماو لەسەر سەرم ڕاوەستاوە! بەداخەوە ئەو ڕۆژە شتێکی لە ماڵیَ لەبیر چوو بوو و کاتێك گەڕابۆوە, دیتبووی من بە حاڵێکی خراپەوە لەسەر زەویی کەوتووم. کە نامەکەی خوێندۆتەوە, ڕێك گەیاندوومیە نەخۆشخانە!

لە تەواوی ژیانمدا لەگەڵ ڕەزا, تەنها ئەو کاتە بوو کە ڕقم لێی هەستا! ڕقم لێی هەڵنەستا, لێی توڕە بووم! خۆزگە ڕزگاری نەدەکردم!

(بێدەنگی)

–ئیَ؟!

ـ بەیانییەکەی کە باشتر بووم, مۆڵەتی ڕۆیشتنیان دام و ڕووبەڕووی دونیایەك لە پرسیار بوومەوە. لە لایەك ڕەزا و لە لایەکی دیکە بابم!بەڵام من هیچ جوابێکم نەبوو کە بیاندەمەوە! تەنها ئەوە نەبیَ کە دکتۆرەکان ئیشارەیان پیَ کردبوو, فریام کەوت. تێکچوونی باری دەروونی! هەرچەندە کە سوودی نەبوو! بۆ بەیانییەکەش لە دووم هاتن! لە لایەن پۆلیسەوە!

هیچیان بە دەستەوە نەبوو! کەس نەیدیبوو بچم و بێمەوە لە ماڵیَ سوهەیل! تەنها ئەو کچە پێی گوتون کە سوهەیل پەیوەندیی لەگەڵ من هەبووە و بڕیار وا بووە یەکتر ببینین! دەمتوانی هەموو شت تێکدەم, بەڵام هەتا هاتنە ماڵیَ دانم بە هەموو شت دا نا!

سوهەیل مردبوو! کاتێك فریاکەوتن دەیگاتیَ, ئیدی درەنگ بووە! ئەو کچەش خوشکی بوو کە ئەویشی موعتاد کردبوو!

( بێدەنگی)

–بۆچی ئیعترافت کرد؟!

ـ نەدەبا کردبام؟!

–مەبەستم ئەوە نییە! مەبەستم ئەوەیە ئامانجت لە ئیعترافەکە چ بوو؟!

ـ ئارامیی ویژدان! ئەگەر ئیعترافم نەکردبا, دوای دیسان دەستم بە خۆکوشتن ڕادەگەیشت! نەمدەویست بیکوژم! تەنها ویستم بەرگریی لە خۆم بکەم! بۆخۆی لەناکاو جوڵا و چەقووەکەی لە ملی ڕاچوو! ئیدی نەمدەتوانی ئارام بگرم! عەزابی ویژدان لە کۆڵم نەدەبۆوە! فەرقیشی نەبوو بۆم! چ ئەوان کوشتبایانم, چ بۆخۆم خۆم کوشتبا! خۆ لە سەرووی ڕەشەوە ڕەنگێك نییە!

( بێدەنگی)

–ئارام بە! ئیدی تەواو بووە! ئەتۆش خەتات زۆر نەبووە!

ـ دڵم دەدەیەوە؟! من مرۆڤم کوشتووە!

–کوشتن لەگەڵ کوشتن فەرقی هەیە!

ـ فەرقی چییە؟!

–هەموو شریتەکانت سوتاندن؟!

ـ ئەویش جیاوازییەکی نییە!

–با ئەوەیان زۆر جیاوازە! خۆزگە یەکت هەڵدەگرت!

( بێدەنگی)

ـ هەڵمگرتووە! یەکی خۆم, یەکی ئەو کچەش!

–بەڕاستە؟! لە کوێن!؟

ـ تەنها خودی شریتەکانن! قاوغەکانیم شکاندن و شریتەکانم هێشتوونەوە!

–ئێستا لە کوێن؟!

ـ لە ماڵێن. لە عەمبارێن! لە شوێنێك لە پشت بۆڕیی زێراب, لە ناو زەرفێکی لایلۆن دان.

—لەوانەیە ئەوە زۆر یارمەتیدەرت بێ!

ـ یارەمتیدەر نابێ هیچ, تاوانێکی دیکەش بۆ دۆسییەکەم زیاد دەبێ!

—نا! نا! ئەوە دەریدەخا کە ئەو ویستوویەتی بەزۆر پارەت لێ وەرگرێ! ئەوە زۆر گرنگە!

ـ بەڕاستتە؟!

—بەڵێ! بەڵێ!

ـ نازانم وەڵڵا!

—ئەی مێردەکەت چی لێهات؟!

ـ هیچ!

—یانی چی هیچ؟!

ـ تەڵاقی دام. هەقی خۆشی بوو!

—ئەی بابت؟!

ـ زۆر لەمێژە نەمدیوە!

—یانی ئەسڵەن نەهاتووە سەردانت بکا!

ـ نەهاتووە هیچ, هەر نایەوێ گوێی لە ناویشم بێ! بەنەعلەتی کراوم!

( بێدەنگی)

ـ ئێستا دەتەوێ چیم بۆ بکەی؟!

—دەبێ بە تەواویی بیر لە فایلەکەت بکەمەوە! دادگات نزیکە! پشتت بە خودا ببەستە!

ـ پێم وا نەبوو مرۆڤێکی ئاوا بە سادەیی بمرێ!

—بەختت نەبووە ! لێدانی چەقووەکە ڕێك لە دەماری داوە و بڕیویەتی !

ـ هەر بەڕاست هیچ دەکرێ ! ؟

—خوا دەزانێ ! لەوانەیە !

ـ هەرچەندە جیاوازیی نییە بۆ من ! من ژیانم دۆڕاندووە ! لە هەژدە ساڵییەوە ! لەوانەشە زووتر ! هەمان ئەو کاتەی کە لەگەڵ کوڕەکە چوومە دەرێ و ویستم بەکەری بخۆم ! بەڵام حەیف !

—خۆت ناڕەحەت مەکە ! ڕاوەستە بزانم چی لێ دێ !

ـ دیسان دێیەوە ئێرە ؟ !

—حەتمەن ! جارێ کارمان زۆر پێکەوە ماوە ! مەترسە ! بەتەنێ بەجێت نایەڵم ! گەشبین بە ! بە لوتفی خودا گەشبین بە !

ـ دەزانی زۆرم خۆشدەوێی تەرانە ! ؟ خووم پێوە گرتووی !

—منیش هەر وا !

ـ ئەو شریتانە بۆ یادگاریی هەڵگرە !

—بە دڵنیاییەوە ! ڕاستیی, گوتت: ئەو شریتانە لە عەمباری ماڵێتان دان؟ ! ماڵی ڕەزا ئیدی؟ !

ـ ئا. لە پشت بۆڕییەکی کورت کە هی ئاودەستی قاتی یەکەمە ! هەر دەستی تێڕاکەی, دەیانبینییەوە !

—دەبێ سەرەتا مۆڵەت وەرگرم !

ـ ئەتو ئاگات لە بابم و ڕەزا هەیە ؟ !

—نا ! بەڵام دەبێ حەتمەن سەرێکیان لێ بدەم !

ـ ئەگەر دیتتن, بە ناوی منەوە پێیان بڵێ: زۆرم خۆشدەوێن! پێیام بڵێ من لە تەمەنێكی زۆر بچووك هەڵەیەكم كرد! بەڵام ئیدی دواتر پاك بووم. بە تایبەت ئەوە بە ڕەزا بڵێ!

–باشە! حەتمەن پێیان دەڵێم!

ـ بیكوژێنەوە ئیدی! گوێگرانی بەڕێز شریتەكە بە كۆتا هات و ژیانی منیش بە هەمان شێوە. دیدار بە قیامەت!

( دەنگی دوگمەی تەسجیلەكە)

لە بیرمە ئەو ڕۆژەی كە كۆتا ڕستەی گوت, دەستی بە گریان كرد! یانی سەرەتا پێكەنی و دواتر لە پڕمەی گریانی دا! لە باوەشی گرتبووم و دەگریا! منیش كە زۆر دڵتەنگ ببووم, دەستم بە گریان كرد!

لەوانەیە نزیك دە دەقیقە پێكەوە گریابین! دواتر خواحافیزیم لێ كرد و لە گرتووخانە هاتمە دەرێ.

لە ڕێگە كەمێك بیرم لە ژیانی ئەفسانە كردەوە و كەمێك لە ژیانی خۆم. لەو ژیانەی كە بە دەستی دوو كەس خراپ بوو! ئەویش چ دوو كەسانێك؟! ئەو دوو كەسەی كە ئازیزترین كەسانم بوون! خوشكەكەم, مێردەكەم!

ئازیزەكان! بڕۆن ون بن! بڕۆن بمرن! نامەوێ سەر بە لاشەی هیچتانەوە بێ! بێزارم لێتان! حەزم دەكرد هەردووكتان بكوژم. ڕاستیی چم پێ لەگەڵ دەكران؟! دەمتوانی چی بكەم؟! بەو خوشكە بێ حەیایەم! ئاخر چۆن دڵت هات ئەو كارە بكەی؟! هەرچییەك بێ بێهروز پیاوە! پیاوێكی خوێڕی و بێغیرەت! ئەتو چی؟! خۆ ئەتو خوشكم بووی! خۆ وەك چاوەكانم متمانەم بە تۆ هەبوو! چ لە تۆ بكەم؟! دەزانم چۆن تۆڵە لەو خوێرییە بكەمەوە, بەڵام چ لە تۆ بكەم؟! كەلیلان

که پێی دایکم لەو نێوەدایە, دەنا دەمزانی چ له تۆش بکەم قەحبەی بەری بەغدایە!

تاقەتم نەبوو سواری تاکسیی بم. هەر وا به پێیان ڕێم دەکرد و بیرم دەکردەوە! هەر ساتێك دیمەنێکی سەیر دەهاتە بەر چاوانم! لەختەی خوشکەکەم لەگەڵ شوەکەم! هەرچەندە هەوڵم دەدا, نەمدەتوانی له مێشکم وەدەرێیان نێم! دیمەنی نەفرەتئاسا! ئەوەندە نەفرەتئاسابوون که ئامادە بووم لەو کاتەدا هەردووکیان بکوژم! ئەو کاتە بوو که هەستم به حاڵی ئەفسانە کرد! ئەو کاتەی که سوهەیل وەك حەیوان هێرشی بۆ بردووە و ئەویش زۆر به خوێنساردی چەقوی وەشاندووە! دەمتوانی له ئەفسانە بگەم! بەرگریی له نامووسی! بەرگریی له ژیانی! ئەو ژیانەی که جارێك به هۆی گەوادێکەوە لەناو چووبوو و دەیویست بۆ جاری دووەمیش پاتە بێتەوە! هەستی بەرگری! ئەو هەستەی که ئێستاش خۆم هەمە!

نازانم چەندم ڕێکرد! لاقم وەئێش کەوتبوون! لەوانەیە نیوەی ڕێم به پێیان بڕیبێ! زۆر هەستم به ماندوێتیی دەکرد! ماندوێتیی دە ساڵ! دە ساڵ بێ هیچ ئەنجامێك! دە ساڵ ژیانی با بردوو! ئۆف خوایە گیان! یانی بۆی هەیە ژیانێکی ئاواش بۆ کچەکەم دووبارە بێتەوە؟! دەبێ چ بکەم تا وای لێ نەیە؟! ئێمەی ژنان دەبێ چیی بکەین تا وای لێ نەیە؟! بەڵام مەگەر خودی خۆمان نین که ئەو بەڵایانە بەسەر یەکدی دێنین؟! ئەگەر خوشکی من سوکوئاسان خۆی نەداویشتە باوەشی مێردەکەمەوە, ئایا ئەوە ڕووی دەدا؟! سوکوئاسان! لەوانەشە سوکوئاسان نا! ئەسڵەن بۆ دەبێ کارێکی لەو شێوەیە بکات؟! دەکرێ هیچی لێ وەرگرتبێ؟! یانی لەبەر پارە بووە؟! نەکا ئیهانەی کردبێ!؟ بۆ وێنە, نەکا جارێك به تەنیا پێکەوە مابنەوە و شتێك ڕووی دابێ و بێهرۆزیش ئەوەی به هەل

قۆستبێتەوە؟! وەك سوهەیل! تیناش ناچار بووە بەردەوامیی بەو پەیوەندییە بدات! چۆن لێی تێ بگەم؟! بۆچی نەهاتووە بە من بڵێ؟! وەلێ ئەگەر هاتبا و پێی گوتبام, هیچ لە مەسەلەکە دەگۆڕا؟! بەڵێ! فەرقی هەبوو! هیچ نەبێ ویژدانی ئاسودە دەبوو! ئەگەر من لە جێی ئەو بام, هەمان کارم دەکرد؟! لەوانەیە خۆم کوشتبا! هەرچییەك بێ سەرەتا شتێك ڕووی داوە کە گەیشتۆتە ئێرە! ئەسڵەن بۆچی ڕێی داوە کە شتێك ڕوو بدات؟! هەتا شتێکی چکۆلەش بێ؟!

خوایە گیان! چەندە ماندووم! هەست دەکەم پیر بووم! پیر و بێ نرخ! بەڵام نا! من پیر و بێ نرخ نیم! من هێشتا هەم! گەنج و بە نرخ! من کۆڵەکەی ئەو ژیانە بووم! هێشتا هەم! دەبێ هەشبم! هیچ نەبێ لەبەر کچەکەم! ئۆف کە چەندە خوێڕی و هیچ و پوچی بێهروز!

لەناکاو گوێم لە دەنگی ئیستۆپی سەیارەیەك بوو! سوڕامەوە سەیری ئەملا بکەم! ئۆووو! ڕێك لە دە سانتیمەتر سەیارەیەك ئیستاپی گرتبوو! سایەقەکەی کە خاتوونێك بوو, واق وڕماو سەیری دەکردم! دوو سێ سەیارەی دیکەش لە پشتەوەی ڕاوەستابوون! لەناکاو وەخۆ هاتمەوە! ئەسڵەن نەمدەتوانی جووڵە بکەم! هەتا قسەشم پێ نەدەکرا! دەرگای سەیارەی کردەوە و بەرەو لای من هات و هاواری کرد و گوتی))

ـ هۆشت لە کوێیە؟! ئەگەر لێمدابای ڕێك مردبووی!

(( دیسان سەیرم کرد کە گوتی))

ـ ئێستا بۆخۆت جاڕ بە جەهەننەم! ماڵی منت وێران دەکرد حەیوانی گەمژە!

(( لەوکاتەدا پیاوێك لە سەیارەی پشتەوە دابەزی و گوتی))

–خاتوون, مەگەر نابینی حاڵەتی ئاسایی نییە؟!

ـ به جەهەننەم كە نییەتی! كەسێ كە ئاوایە, لە ماڵێ دادەنیشێ!

—قەت ئەتو وات لێ نەهاتووه؟!

ـ پەیوەندیی بە تۆوه نییە!

(( دووبارە هاواری كرد و گوتی))

ـ دە وەلاكەوە دەی!

(( هێواش هاتمە دوایە كە پێی لێ نا و ڕۆیشت! هەموویان ڕۆیشتن! بە چاولێكردن لە من! هەندێكیان سەریان ڕادەوەشاند بە واتای: بەداخەوە!

ئەی ئەگەر ئەو ژنەش وەك من هۆشی لە خۆی نەبا چی؟! ئەگەر ئەویش وەك من كێشەیەكی لە ژیاندا هەبا چی ڕووی دەدا؟! حەتمەن ئێستا مردبووم, یان بە دەست و لاق شكاوییەوە لە خەستەخانە كەوتبوو! دواتریش ئەو خوێریانە بێ یەك و دوو بە خەیاڵێكی ئاسودەوە كاری خۆیان دەكرد و بە دەستێك گوڵەوە دەهاتنە سەردانم!

نا! نابێ ئاوای لێ بێ! دەبێ ئاگام لە خۆم بێ! هیچ نەبێ لەبەر كچەكەم! ئەو ژیانە تەنها هی من نییە! ئیدی من هی خۆم نیم! دەبێ سەلامەت بم! كچەكەم پێویستی بە منە! مەگەر چەند ساڵە؟! زوویە كە هەتیو بێ! زوویە بێ دایك بێ! هەتا ئێستا زۆرم زەحمەت لەگەڵ كێشاوە تا بەو تەمەنەم گەیاندووە! جگە لەوەش زیاتر پێویستیی بە منە! من بۆ ئەو دایكێكی باش بووم! لە ئایندەش دا دەبم! ئەی بۆ شووەكەم هاوسەرێكی باش بووم؟! بەڵێ! بووم! ئەی بۆ ئەو كارەی كرد؟! لەوانەشە نەبوویم! ئەگەر هەبام خۆ یەكی دی لە بەرانبەردا بۆ قیت نەدەكردمەوە! نا! ئەوانەی كە ئەو كارە دەكەن, دڵیان نەخۆشە! نەخۆشن! دەروونیان تەواو نییە!

پێشم بە تاکسییەك گرت و سوار بووم. ئەوەندە مێشکم ماندوو بوو کە لە ئیش کەوت! لەوانەشە بۆخۆم لە ئیشم کەواندبێ! خۆ ئەگەر بیەوێ ئاوا کار بکا, شێت دەبێ! ئێستاش ئەوە شێت بووم!

ناونیشانی ماڵێم دا بە سایەقەکە !

***

(( شریتی هەشتەمیش تەواو بوو! ژیانێکی چەند سەعاتی لە شریتدا! سەعات چەند بوو؟!

هەستام و گڵۆپەکانم پێکردن! نزیك سەعات هەشت بوو! چۆن وا زوو تێپەڕی؟!

بۆچی سوگێل نەهاتۆتەوە؟! ئەسڵەن هۆشم لە خۆ نەبوو! دوێشەو پێ گوتبووم کە لە قوتابخانەڕا دەچێتە ماڵێ برادەرەکەی. جەژنی لەدایکبوونی بوو! پێشتر دیارییەکم بۆ کڕیبوو کە لەگەڵ خۆی بۆی ببات!

ئاهەنگی لەدایکبوون! شتی قۆڕ! مرۆڤ ساڵیادی قوڕ وەسەری ئاهەنگ بگێڕێ!

وەبیرم هاتەوە کە ئەمشەو شەوی لەدایکبوونی خۆمە!

لەناکاو ئەوەندە توڕە بووم کە تەسجیلە دەنگیەکەم لەسەر مێزرا فڕێدا خوارێ و قیژاندم! ئاوا تۆزێك لە فشارەکانی دەرونم کەم کردەوە!

ئەمشەو لەدایکبوونمە! هەمیشە لە بەیانییەوە ئەو خوێڕییە پیرۆزبایی لێ دەکردم و ئێوارەکەش سەعات شەش دەهاتەوە ماڵێ و دیارییەکی بۆ دێنام! دیارییەك و کێکێك! لەسەر ڕێی قاڵدرمەکان مۆمەکانی پێدەکردن و ئاوا دەبوو بە سوپڕایز, هەرچەند هەموو ساڵێ هەر وای دەکرد بەڵام تام و چێژێکی تایبەتی هەبوو!

سەعات چەندە؟!

کەمێك لە هەشت تێپەڕیبوو و هێشتا نەهاتبۆوە ماڵێ! حەتمەن لەگەڵ ئەو خشکە هەرزەکارەم سەری گەرمە!

لەناکاو فکرێك هاتە مێشکمەوە ! خێرا هەستام و ژمارەی ماڵێ داکم لێدا ! دەمزانی ئەوکاتانە دایکم دەچێتە ماڵەکەی بەرانبەریان و تا سەعات نۆ نۆ و نیو لەوێ دەمێنێتەوە ! جیرانەکەیان ژنێکی بەتەنێیە ! وەك دایکم! هەموو کات لە ماڵێ دەمێنێتەوە و ئێوارەخوان دروست دەکات !

جەرەس ئەوەندە ڕۆیی هەتا داخرایەوە ! ئیدی دڵنیا بووم! هەتا بۆ ڕووکەشیش بێ ئەوەندە ئەزیەتی وەبەر خۆی نەداوە کە لەدایکبوونمی لەبیر بێ! خوێڕی! خوێڕیانە !

ئەی کچەکەم؟! ئەدی ئەو بۆ لەبیری نییە؟! خۆ ئەو هەموو جارێ هەفتەیەك پێشتر دەیزانی و بە پێکەنینەکانی وای نیشان دەدا کە لەدایکبوونەکەمی لەبیرە !

ئەوە زۆر خراپە کە مرۆڤ بە بوونی خێزان, شەوێکی ئاوا بەتەنێ بمێنێتەوە ! بەتەنێ و بەخۆ و بە جیهانێك لە دەرد و غەمەوە !

چوومە مدبەقێ. باشتر بوو سەرم گەرم بکەم! دەستم بە شردنی قاپەکانی شەوێدیی کرد ! لەو نێوەدا گریان قورگی گرتم! گریانێکی قوڵ! حەزم دەکرد دانیشم و بەس بگریم!

خێرا قاپەکانم شردن و چووم دانیشتم! بۆ ئێوارە هیچمان نەبوو! هەمیشە ئەو کاتانە لەگەڵ بێهروز دەچووینە دەرێ نانمان دەخوارد! وەك جاران هیچم لێ نەنابوو! چەند گێلم من!

نەکا بەڕاست پوچ و بێ نرخ بووبم؟! ڕاستیی, ئەوانەی کە خۆیان دەکوژن بە کوێ دەگەن کە کارێکی وا دەکەن؟! لەوانەیە بەو شوێنەی کە ئێستا من پێی گەیشتووم! دەبێ چەند حەبان بخۆی تا خەڵك پێی ڕزگار نەکرێی؟!

نا ! نا ! نا ! ئەمن هیچ و بێ نرخ نیم!

چووم ژمارەی فەڕنوشم لە جانتاکەم دەرهێنا! لەوانەیە ئێستا کاتی بێ کە تەلەفونی بۆ بکەم! کاتی تۆڵە! لە شەوێکی ئاوا دا!

بەڕاست دەتوانم؟!

لە مێشکمدا دیمەنەکانم وێنا دەکردن! دووقۆڵی لە ماڵی فەڕنوش! بە تاقی تەنیا!

دواتر دووقۆڵی... !

نا! خوایە گیان نا! ئەمن ئەهلی ئەو کارە نیم!

ژمارەکەم لەتوپەت کرد و لە تەنەکەی خۆڵێم هاویشت!

من دۆڕاوم! لاواز و دۆڕاو!

دەبێ چەند حەبان بخۆی؟! سی دنك؟! چل دانە؟!

چەند حەبی خەو و ئارامبەخشم هەبوون؟! تەنها دە دانە؟! دەبێ سەرێك بچمە دەرێ! دەرمانخانەمان لێ نزیکە!

لەوانەیە پەنجا بۆ شێست دانەم پێویست بێ!

لەخۆوە چوومە زگ جلەکانم کە تەلەفون هات! بەرەو لای چووم! حەتمەن سوگێلە! خوانەخواستە نەکا شتێکی بەسەر هاتبێ!؟ چەند دایکێکی بێ مێشکم من!

ـ ئەلوو؟!

–دایە؟! سڵاو!

ـ سلاو دایە گیان! ئەوە لە کوێی؟!

–لە ماڵێ هاوڕێکەمم!

ـ نایەوە؟! زۆر درەنگە هاا!

–چۆن بێمەوە؟!

ـ ناتگەیەننەوە؟!

—خۆ سەیارەیان نییە!

- باشە! باشە! ناونیشانەکەم بدەیە ئێستا خۆم لە گەراجڕا دێم!

—کەواتا زووکە دایە گیان!

(( ناونیشانی هاوڕێکەیم وەرگرت. شوێنێك لە وەلەنجەك بوو. خێرا تەلەفونم بۆ گەراج کرد و جلەکانمم گۆڕی! دە دەقیقە دواتر گەیشت. ویشتم نامەیەك بۆ بێهروز بەجێ بێڵم کە ئەگەر هاتەوە نەکا سەغڵەت بێ! دیسان لە ساویلکەیی خۆم توڕە بووم! ئەو دەمێك بوو ئیدی دڵی بۆ من لێی نەدەدا!

لە ماڵێ هاتمە دەرێ و سواری سەیارە بووم! جادە چۆڵ بوون و نیو سەعات دواتر گەیشتینێ! بە سایەقەکەم گوت: چاوەڕێم بکە!

چاوم لە ناونیشانەکە کرد. باڵەخانەیەکی تازە دروستکرابوو! لە زەنگم دا کە کەمێك دواتر خاتوونێك جوابی دایەوە! سڵاوم کرد و گوتم کە هاتووم بەدوای سوگێلدا. گوتی: خەریکین کێك دەبڕین! ویستم کە لە سەیارەدا چاوەڕێ بکەم, وەلێ داوای لێ کردم کە بچمە سەرێ! بۆخۆشم پێم خراپ نەبوو کە بچمە سەرێ! هیچ نەبێ دیتنی کێك, بیرخەرەوەی یادگاریی خۆم بوو!

بە ئاسانسۆڕ[1] چوومە سەرێ و لە زەنگی باڵەخانەکەم دا. هیچ دەنگە دەنگێك لە باڵەخانەکەوە نەدەهات! چ ئاهەنگێکی کپ و مات!

لەناکاو دەرگا کرایەوە! هەموو شوێنێك تاریك بوو! ترسام! تا ویستم هەنگاوێك بچمە دوایە, دوو دەست لە تاریکییەکەڕا دەستیان گرتم و ڕایان کێشا ژوورێ! ویستم بقیژێنم, کە گڵۆپەکان پێ کران!

نازانم! نازانم! نازانم!

نازانم! ئەگەر ئێوە لە جێی من بان لەو کاتەدا چتان دەکرد! من تەنها گریام!

[1] ئاسانسۆڕ: مەسعەدە.

بەدەستە خۆم نەبوو! دەمتوانی چ بکەم جگە لە گریان؟!
نیو سەعات لەمەوبەر دەمویست بچم حەب بکڕم تا خۆم بکوژم, بەڵام ئێستا!
هەر بەڕاست دەمتوانی چ بکەم بێجگە لە گریان واوەتر؟!
کاتێك بێهروز لە باوەشی دەگرتم و پیرۆزبایی لێ دەکردم!
کاتێك تینا لە باوەشی دەگرتم و پیرۆزبایی لێ دەکردم!
کاتێك دایکم لە باوەشی دەگرتم و پیرۆزبایی لێ دەکردم!
کاتێك سوگێل بە خێرایی ڕوخساری ماچ دەکردم و وەك بوولبوول قسەی بۆ دەکردم کە پوورە تینا و بێهروز چەند لەمێژە ئەزیەت دەکێشن تا ئەو ئاهەنگە لەو باڵەخانەیەدا ڕێکخەن و بە تەواویی بۆم بکەنە سوپڕایز! ئەو باڵەخانەیەی کە بێهروز بۆی کڕیبووم! بە سەلیقەی تینا و دایکم!
دیاریی ڕۆژی لەدایکبوونم!
هەر بەڕاست دەمتوانی چ بکەم جگە لە گریان؟!
کاتێك تێگەیشتم کە تەواوی ئەو فکرانەی دەربارەی شوەکەم و خوشکەکەم کردبوومنەوە هەڵە بوون! ئەویش هەڵەیەکی گەمژانە!
لە تەواوی ئەوکاتەوە ئەو دوو کەسە گەڕاون بەدوای کڕینی باڵەخانە!
کاتێك دایکم پێی دەگوتم: ئەو دووانە چەند وەختە لە کار و ژیانی خۆیان گرتۆتەوە تا ئێرەیان دیتۆتەوە, دەمتوانی چ بکەم؟!
کاتێك کێکی لەدایکبوونم لەو نێوەدا بینی بەو مۆمانەی کە لە سەرییەوە پێ کرابوون! سی و پێنج دانە!
لەسەر کێکەکە نووسرابوو:

سی و پێنج جار زیاتر خۆشمدەوێی

بێهروز

چم پێ دەکرا جگە لە گریان؟!

پوورم و کچەکەی و شوەکەی لەوێ بوون! مامم و ئامۆژنم بوون! خوشك و دایکی بێهروز هاتبوون! برایەکەی بوو! هەموو لە دەورم کۆ ببونەوە و چەپڵەیان بۆ لێ دەدام و پێدەکەنین! هەموو دوایان لێ کردم کە مۆمەکان بکوژێنمەوە, بەڵام من چم پێ دەکرا جگە لە گریان؟!

تەنها لەسەر عەرزی خودا دانیشتم و سوجدەم بەرەو دەرگای خوای گەورە برد! لەبەر ئەوەی ئەو شتەی کە دەمویست بوو! لەوەی کە نەیهێشت بەرەو ڕێی چەوت بڕۆم! سوپاس خوایە گیان! سوپاس کە ڕێت لێ گرتم و نەتهێشت کارێکی خراپ بکەم! سوپاس!

هەستام و سەیری بێهروزم کرد! خەریك بوو دەگریا! چوومە پێشی و بە دەستم فرمێسکەکانیم سڕینەوە و پێم گوت: زۆرم خۆشدەوێی!

***

(( لەسەر نانی تینا و بێهروز ئەو کارانەیان بۆ باس دەکردم کە کردبوویانن و پێدەکەنین! مەسەلەی تەلەفونەکان! بلوز کڕینەکە! هەمان ئەو بلوزەی کە ئەوەندە بیرم لێ کردەوە, ئەوکات دەبەر تینای بوو! کاتێك دەیانگوت کە لە گەراجی مەسکین تینا لە جێی من, واتا خۆی کردۆتە ژنێ بێهروزی! هەموو هەموویان باس دەکردن و پێدەکەنین! هەمان ئەو شتانەی کە سەعاتێك لەمەوبەر خەریك بوو شێتیان دەکردم و نزیك بوو بە هەزار ڕێی خەراپمدا ببەن!

بێهروز عەردی کەرەجی فرۆشتبوو و شتێکیشی قەرز کردبوو. هەمان ئەوەی کە هاوکارەکەی پێی گوتم! خولاسە هەرچی پارەی هەمان بوو و نەمان بوو بە قەرزوقۆڵ کۆی کردبۆوە و ئەم باڵەخانەیەی پێ کڕیبوو. یانی زۆرینەی پارەکەی

دابوو و بەڵێننامەی کردبوو و مابووی بچێتە نووسینگە کە دوایخستبوو بۆ دوای ئاهەنگەکە! تینای فەقیریش زۆر ماندوو ببوو, تا توانیبووی ئەو باڵەخانەیە وەبینیّ! هەوڵی دابوو کە لەگەڵ سەلیقەی من بێتەوە! زۆر باشتریش بوو لەوەی کە من چاوەڕێم دەکرد!

کەوتمەوە بیری ئەو ڕۆژانەی کە داوام لە خودا دەکرد کە مێردەکەم بۆ بگەڕێنێتەوە! چەندە لەبەر دەرگای پاڕامەوە کە هەموو ئەو شتانە درۆ بن! وە خوداوەند ئارەزووەکەی وەدی هێنام!

دوو هەفتە دواتر ماڵمان بار کرد و ڕۆیشتین!

***

دەربارەی ئەفسانەش, باشترین بەرگری کە کرابیّ لێم کرد! تەواوی شریتەکان, بە بڕینی ئەو بەشانەی کە پەیوەندییان بە فایلەکەوە نەبوو, کۆپیکم کردن لەگەڵ ئەو دوو شریتەی کە بە مۆڵەتی مێردەکەی لە عەمبار دەرمهێنابوون بۆ دادگام ناردن. نەتیجەم وەرگرتەوە!

ئەو ئەفسانەیەی کە چاوەڕێی حوکمی ئێعدام بوو و هیوای لە لە هەموو شتێکی ژیان بڕا بوو, بۆ ژیان گەڕایەوە! چەند ساڵی زیندان بۆ دانرا!

قسەم لەگەڵ باب و مێردەکەشی کردن. شوەکەی بەڕاستیی خۆشیدەویست, بەڵان زۆر غەمگین و ناڕەحەت بوو! لەوانەیە دوای چەند ساڵێك وەزعەکە ئاسایی بێتەوە و ئەفسانە بگەڕێتەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆی.

سیّ مانگ دواتر بیستم کە شوەکەی چووە سەردانی بکات! ئەوە زۆر مانادار بوو! هیچ نەبیّ لەوە تێگەیشتووە کە ئەفسانە دیفاعی لە شەڕەف و نامووسی خۆی و مێردەکەی کردووە!

***

منیش گەڕامەوە سەر ژیانی خۆم! ئەو ژیانەی کە پێم وا بوو لەدەستمداوە! ئێستا بە دڵخۆشیی و عەشقەوە کار دەکەم. بە کچەکەم ڕا دەگەم, بە ماڵ و بە مێردەکەشم ڕا دەگەم!

شەوانە سەعاتێك کە دەڕوا, تەنها چاوم لە دەرگا و گوێم لە جەڕەسە, داخوا کەی بێهروز دەگەڕێتەوە ماڵێ!

تەواو